# حەمید دەباشی

# بەهاری عەرەبی

## کۆتاییی پۆستکۆلۆنیالیزم

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:
گۆران سەباح

حەمید دەباشی

# بەهاری عەرەبی

## کۆتاییی پۆستکۆلۆنیالیزم

لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی:

گۆران سەباح



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

هەولێر - هەرێمی کوردستانی عێراق

## پێڕست

## بەرکول

"خۆشحاڵم بەوەی یەکلا بووەوە و بیرۆکەکانت راپێچا لە دیدێکی کۆن و بووریبوەوە بۆ تێگەیشتنێکی نوێ." کارل مارکسی گەنج (١٨١٨-١٨٨٣) ٢٦ ساڵ بوو کاتێ بەم دێرە دەستی کرد بەنووسینی نامیلکەیەک بەناوی "بۆ رەخنەیەکی بێبەزەییانەی هەموو ئەو شتانەی بوونیان هەیە" (١٨٤٤)، بەشێوەی نامەیەکی کورت بۆ ئارنۆڵد روج، کە هاونووسیاری بوو لە بەلاڤۆکێکی نوێ بەناوی دۆیچە-فرانزویچ یوهاربوچە. لە کاتی نووسینی نامەکە، ئەو تەواو ئاگەدار بوو لە تێگەیشتنێکی نوێ و مێژوویی ئەو سەردەم، کە پێویست بوو بۆ کرانەوەی دنیا و مانابەخشین پێی لە بەردەم گەنجانی شۆڕشگێڕ.

نامەکە بەگەلێ رێگە پێشبینیی شۆڕشگەلی ئەورووپیی ١٨٤٨ کرد، کە ناسرا بە "بەهاری نەتەوەکان"، یان "بەهاری گەلان"، ئەمانە بریتی بوون لە چەندان راپەڕینی دڵخۆشکەر کە دواتر وایان لە مارکس کرد (مانیفێستۆی کۆمۆنیست) لە ١٨٤٨دا بنووسێ، نزیکەی سێ ساڵ بەر لەوە پێی وابوو ناپاکی لە شۆڕشەکان کراوە و (برومای هەژدەمی لویس پۆناپارت)ی نووسی (١٨١٥-١٨٥٢). بەڵام لەو ساتانەدا، مارکس دڵخۆشە، بەپەرۆشە، پێشبینیکەرە، زۆر پێداگیرە و تژییە لە ئاگر. ئەو بەهارێکی ئەورووپیی بەچاوی خۆی بینی، وەک چۆن ئێمە ئەمڕۆ بەهاری عەرەبی بەچاوی خۆمان دەبینین. ناوی لە پاریس نا پایەتەختی نوێی جیهان، وەک چۆن ئێمە ئەورۆ وا بە قاهیرە دەڵێین. وشەی "جیهان" یان "جیهانی نوێ" زۆرترین جار لەم نامەیە دووبارە بووەتەوە. مارکس زانی لە بەردەم دەروازەی جیهانێکی

نوێیه. سوور و پێداگیرانه رای گەیاند: "ئەوەی پێویستە خۆی خۆی ڕێک دەخا... بۆیە گومانم نییە لەوەی هەموو بەربەستەکان لادەبرێن." ئەو هەر پێشبینیی شۆڕشەکانی نەکرد، بگرە پێشبینیی هێزەیلی دژە شۆڕشیشی کرد کەوا هەوڵ دەدەن لە ڕێڕەو لایان بدەن، هەروەکو ئێمە ئەمڕۆ وا دەکەین، لە عەرەبستانی سعوودیە و کۆماری ئیسلامی تا دەگاتە وڵاتە یەکگرتووەکان، یەکەتیی ئەورووپا و ئیسرائیلیش.

یەکێ دەبێ واز لە هەموو بۆچوونە پێکەنینئامێزەکانی سپێدەی دووشەم بهێنێ و بچێتە پاڵ پەرۆشیی مارکسی گەنج و هەست بە دەنگ و دیدی قووڵی ئەو بکا، مارکس خۆیشی هیچ دۆگما و ئایدیۆلۆجییەکی پێشینەی بۆ ئەو دیدە نەبوو. ئەو بەنووسیارانی هاوەڵی گوت: "من لەگەڵ هێنانە کایەی هیچ ئاڵایەکی دۆگمایی نیم. بەپێچەوانەوە، دەبێ ئێمە یارمەتیی دۆگماچییەکان بدەین مانای پێگەی خۆیان بۆ خۆیان روون بکەنەوە." مارکس زانی شتێک لە ئارادایە بۆیە هاوکارانی دڵنیا کردەوە کەوا "ئێمە نابێ وەک مەزهەبچییەکان بە بنەمای نوێ ڕووبەڕووی دنیا بێنەوە: "ئەوە راستییەکەیە، ملکەچی بن!" نەخێر: ئەمە وا نابێ. شتێکی تر پێویست بوو. "ئێمە بنەماگەلی نوێ بۆ دنیا لە بنەماکانی خۆیەوە دادەنێین. ئێمە بەجیهان ناڵێین: "شەڕ بوەستێنن، خەباتتان بێهوودەیە. ئێمە دەمانەوێ دروشمی راستەقینەی خەباتەکە یەک بەدەنگی خۆیمان بە ڕووی ئێوەدا بڵێین. هیچ یەکێک لەمانە کارەکە رایی ناکا. گوێی بەزەوییەوە نابوو، گوێی ڕادەدێرا بۆ گۆڕەپانی ئازادیی سەردەمی خۆی. شتێکی زۆر گرینگتر لە بەردەستدا بوو: مارکس بۆ خۆی و هاوەڵانی دووپات کردەوە: "ئێمە تەنیا ئەوە بەجیهان پێشان دەدەین کە بۆچی دەجەنگێ، هەروەها ویژدان ئەو شتەیە کە جیهان دەبێ هەیبێ، جا پێی خۆش بێ یان ناخۆش." لەسەر ئەو سەرنجە، ئەم قسە ژیرانەیە دەکا: "بۆیە دەبێ دروشمی ئێمە ئەوە بێ: چاکسازیی هۆشیاری لە ڕێی دۆگماکان نەکرێ، بگرە لە ڕێی شیکردنەوەی لێڵیی هۆشیارییەوە بێ،

ئەو هۆشیارییەی کە ناڕوونە، جا لە فۆرمی ئاینی یان سیاسیدا دەربکەوێ."

سەبارەت بەو پرۆژەیە، مارکس بەڵێنی دا، "ئەوە ئاشکرا دەکا کە جیهان دەمێکە خەون بەشتێکەوە دەبینێ کە دەتوانێ دەستەبەری بکا تەنیا ئەگەر هۆشیار بێ." پاشان لە ساتێکی دانسقەی لووتکەی مەسیحییەتی ئەورووپیدا هاتووە: "بۆ ئەوەی گوناهەکانی بسڕێنەوە، مرۆ دەبێ تەنیا ئاشکرایان بکا کە بەڕاستی گوناهەکان چین."

جارێکیان مارکس بەمتمانەوە گوتی بەڕاستی لەوانەیە مێژوو خۆی دووبارە بکاتەوە (جارێک وەک تراژیدی، جارێکیش کۆمیدی)، بەڵام جیهان خۆی دووبارە ناکاتەوە. جیهان بەردەوام شت دەدۆزێتەوە، دادەهێنێ، بەردەوام زاڵ دەبێ بەسەر خۆیدا. لە بەهاری عەرەبیدا، جیهان جارێکی تر ئاوساوە بەدیدێکی باشتر و بەهیواتر. هەڵکشانی ڕاپەڕینە سنووربڕەکان لە مەغریبەوە تا ئێران، هەروەها لە سووریاوە تا یەمەن، جیهان سەراوژێر دەکەن. ئەمڕۆ ئەرکی ئێمە ئەوەیە بزانین هۆشیاریی ئێمە لەسەر جیهان لە کوێی گۆڕانی جیهاندایە، بێگومان، بەزەبری مێژوو. ئەو جیهانەی ئێمە تێیدا ناسراوە بە "ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست" یان "ئەفریقیای باکور" یان "جیهانی عەرەب و موسڵمانان"، هەموویان بەشێکن لەو جوگرافیا کۆلۆنیالەی بۆمان ماوەتەوە. ئەو جیهان وا دەگۆڕێ، زۆر بەخێراییش دەگۆڕێ. ئێستە پێمان ناوەتە قۆناخی دۆکیومێنتکردنی ئەو زاراوانەی کە جیهانی پێ دێتە گۆڕین، زاڵ دەبێ بەسەر هۆشیاریی ناڕوون و دەگۆڕێ لەوەی کە سەردەمی کۆلۆنیالی زەبوون بوو و پاش کۆلۆنیالیش جێگیر کرا.

لە تێگەیشتن لەوەی ئێستە لە ئەفریقیای باکور و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست چی ڕوو دەدا، میتافۆرەکانمان (خوزەکان) لێ براوە. پێویستمان بەمیتافۆری نوێیە. تەنانەت وشەی "شۆڕش"، لای هەموو کەس ئاشنا بوو، لە کارل مارکسەوە بگرە تا دەگاتە هەنا ئارندت، ئێستە پێویستی بە دووبارە

بیرکردنەوە هەیە. ئەم زمانە نوێیەی شۆڕش کاریگەریی بەهاری عەرەبی دەگوازێتەوە بۆ سیاسەتی نیشتمانی و نێودەوڵەتی بۆ نەوەکانی داهاتوو. ئەم ڕاپەڕینانە چوونەتە ئەودیو ڕەگەز و ئاین، مەزهەب و ئایدیۆلۆجییەکان، ئەودیو پرسی بۆ یان دژی ڕۆئاوا. زاراوەی "ڕۆئاوا" ئەمڕۆ لە هەموو کاتێکی تر زیاتر بێ مانایە، سەنگی خۆی لەدەست داوە، بیرۆکە و دۆخی لە جێ چووە، باوی پۆستکۆلۆنیالیش نەما. ڕۆهەڵات، ڕۆئاوا، ئاسیایی، کۆلۆنیال، پۆستکۆلۆنیال، ئەمانە هەمووی بەبادا چوون. ئەوەی ئێمە دەیبینین وا لێک دەترازێ ئەوەیە پێی دەگوترا "ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست" (ئەودیویشی) ئاماژەیە بە کۆتاییی شێوەکانی ئایدیۆلۆجیای پۆستکۆلۆنیالی، ئا ئەمە بابەتی سەرەکییە و ئەم کتێبەی تاوتوێی دەکا و ئاهەنگ بۆ بەهاری عەرەبی دەگێڕێ. پۆستکۆلۆنیال زاڵ نەبوو بەسەر کۆلۆنیال، بگرە هەر لەناوی برد. بەهاری عەرەبی بەسەر هەردووکیاندا زاڵ بوو. درامای عەرەبە کەللەڕەقە درەنگکەوتووەکان ئێستە پێی دەگوترێ بەهار، منیش ئەمە بەکار دێنم چونکە ئێمە پێمان ناوەتە قۆناخی کۆتاییی پۆستکۆلۆنیالی، کە خەریکە لە ترۆمایەکی مێژوویی دێینە دەرەوە.

لە سەرەتای ۲۰۱۱ەوە سێ زاراوە دەبینین: شۆڕشەیلی عەرەب، ڕابوونی عەرەب و بەهاری عەرەبی. من زیاتر بەهاری عەرەبیم بەکار هێناوە چونکە ڕاپەڕینەکان لەو وەرزە دەستی پێ کرد، وەک میتافۆرێکیش ئاماژەیە بە وەرزی هیواکان، متمانە، خێروبەرەکەت و لەدایکبوونەوە. دواتر، کاتێ تەنگژەکانی بازنەی یۆرۆ و بزووتنەوەکانی ئەمەریکا بەناوی "ئۆکیوپای وۆڵ ستریت" ناوی "هاوینی ئەورووپی" و "پاییزی ئەمەریکی"یان هێنا کایەوە، جیهان بەگشتی زانی ئێمە کەوتووینەتە ناو زستانێکی تژی لە ناڕازیبوون. ئەمە مانای لیبڕانی میتافۆر نییە کە ڕەنگە تووشی بن ئەگەر بێتو ڕووداوی مێژوویی تر لە جیهان ڕوو بدەن، بگرە بۆ بەجێهێشتنی جێ پەنجەیە بۆ ئەو هیوا کتوپڕەی (هیوای جیهانێکی باشتر) دێتە خەیاڵمان کاتێ هەموو

ئەمانە دەخوێنینەوە.

گواستنەوەی هۆشیاری، لە ڕێی دۆگما یان توندوتیژی نا، ساتێکی نوێیە بۆ دۆزینەوەی جیهانێکی نوێ، بەهۆی خۆشیی ئەوە نا کە بوونی نییە، بگرە بەهۆی بینینی ئەوەی وا دەکرێتەوە. ئێستە کە خەریکم دەنووسم، شۆڕشەکانی عەرەب، هەریەکە بەچەشنێکی جیاواز، جوگرافییەکی نوێی ئازادبوون دروست دەکەن، کە لەنێو نەخشەی کۆلۆنیال یان پێکهاتەکانی پۆستکۆلۆنیالدا نییە. ئەم دووبارە دارشتنەوەیە ئاماژەیە بە رزگارییەکی ڕەگ و ڕیشەیی، نەک هەر تەنیا لەمانە بگرە لە کۆمەڵگە و کایەکانی تری ژیان. ئەم چەشنە بەردەوامەی شۆڕش ڕێگە نەتەوەییەکانی بەستووەتەوە بە نێودەوڵەتییەکان بۆ کرانەوەی زیاتر، ئەمەش دەبێتە هۆی هیوایەکی نوێی جیۆپۆلەتیک. ئەوە ئاشکرایە کە شۆڕشەکانی عەرەبی جوگرافی خەیاڵیمان دەگۆڕن. ئەمە هەستی پێ دەکرێ لە تێکەڵبوونی نارەزاییەکانی باشوور و باکوری دەریای ناوەراست، هەر بەستایلی گۆڕەپانی ئازادیی گەنجان لە یۆنانەوە تا ئیسپانیا، لە ئەمەریکاش لەلایەن بزووتنەوەکانی ئۆکیوپای وۆڵ ستریتەوە ڕادەپەڕن، تەنانەت ئۆنگ سان سو کی هەڵمەتەکەی بۆ دیموکراسی لە بێرما بەراورد دەکا لەگەڵ بەهاری عەرەبی. ئەم شۆڕشانە روو نادەن بەهۆی سیاسەتی رۆئاوا، بگرە سیاسەتی رۆئاوا تێ دەپەڕێنن، بۆیە بوونەتە سەرئێشە بۆ سیستمی سیاسەتی جیهانی. ئەو بناخەیەی کە زلهێزەکان بە هی خۆیانیان دەزانی وا دەلەرزێ. ئەم گۆڕانکارییانە ئاماژەن بۆ ئەو بیرۆکەیەی کەوا شۆڕشەکان نەک هەر تەنیا سیستمی چەوسێنەری کۆلۆنیال رەت دەکەنەوە، بگرە دژی ئایدیۆلۆجییەکانی پۆستکۆلۆنیالیشن کە خۆیان شەکەت کردبوو بە دژایەتیی ئیسلامییەکان، ناشنالیست و سۆشیالیستەکان.

ئەو هۆشیارییە نارِوونەی جیهانی ئێمە هەیەتی لە سیستمگەلی رۆئاوا و ئەوانی ترەوە بۆی ماوەتەوە، ئەمە نابەجێترین خەیاڵ بوو کە نەخشەی

کۆلۆنیالی ئەوروپی بەسەر جیهانی سەپاند و بەجێشی هێشت، سنوورێکی داچەقیوی لە نێوان ئیسلام و رۆژئاوا دروست کرد. هەر ئەو دیدە گەورەیەیە وا ئێستە لە بەرچاومان لەبارێک دەردێ. بەڵام هێشتا ماویەتی: ئەو ئاستەنگەی لە ئاکامی ئەو شۆڕشانەدا ڕووبەڕووی لەتبوونەکانی ناو ئیسلام و موسڵمانان دەبێتەوە (رەگەزی وەک عەرەب، تورک و ئێرانی و... تاد، ئێتنی وەک کورد و بەلوچەکان و... تاد، یان مەزهەبی وەک سوننی و شیعی بەتایبەتی) ئێستە زەق بووەتەوە و تەشەنەی کردووە. ئەم شۆڕشانە کارگەلی بەکۆمەڵن و زاڵن. ناسنامەی نوێ دروست دەکەن، هاریکاریی نوێ پەیدا دەکەن، لەناو بازنەی ئیسلام و رۆژئاوا و لە دەرەوەشی، بەسەر هەموو ئەمانەدا زاڵ دەبێ، بەتایبەتیش بەسەر بەرگی ئەستووری دابەشبوونی کۆلۆنیالی. ئەو جموجۆڵانەی ئێستە لە نێوان ویستی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی پەیدا بووە، هەموو ئەوانی تر وەلا دەنێن. کارە بەکۆمەڵەکە چوارچێوەیەکی نوێ دروست دەکا بۆ مرۆڤایەتی کە لە باوەشی دەگرن و بەهێزی دەکەن. ئەو جموجۆڵانە پشکێنراون لەلایەن هێزەیلی دژە شۆڕش کە ئێستە کار دەکەن، هەروەها زۆریشیان لەسەرە بیدۆڕێنن لەو شۆڕشانەدا.

جیهان، نەک هەر تەنێ جیهانی موسڵمانان، دەمێکە خەونی بەو ڕاپەڕینانەوە دەبینێ. بەلایەنی کەم لەوەتەی شۆڕشی فەرەنسی لە ١٧٨٩، شۆڕشگەلی ئەوروپی لە ١٨٤٨، شۆڕشی رووسی لە ١٩١٧، لەوەتەی بەریتانییەکان خۆیان پێچایەوە و لە ١٩٤٨ هیندستانیان بەجێ هێشت، لەو دەمەی فەرەنسا جەزائیری بەجێ هێشت، ئیتاڵییەکان لە لیبیا رۆیشتن، بۆیە جیهان، نەک هەر تەنیا جیهانی عەرەبی، دەمێکە خەون بە بەهاری عەرەبییەوە دەبینێ. لەو دەمەی جیهانی کۆلۆنیال دەستی کرد بەداگرتنی ئاڵا ئەوروپییەکان، هەروەها هەرکە جیهانی پۆستکۆلۆنیال ئاڵای نوێی بەرز دەکردەوە، جیهان خەون دەبینێ بەدروشمی گەورە و کاریگەر، کە ئێستە خەڵک لەوسەری جیهانی عەرەبییەوە تا ئەوسەری هاوار دەکەن: ئازادی،

دادوەریی کۆمەڵایەتی و شکۆمەندی.

بۆ خۆشکردنی ڕێی ئەو شۆڕشانە تا زیاتر بکرێنەوە، ئاقاری گشتی دەمێکە فراوان بووە، هەروەها ئێستە کاری سیاسی تۆمەتبارە و پێناسەیەکی تری بۆ دەکرێ. بەڵام بەرەی گشتیی یەکگرتوو لەناو چینە کۆمەڵایەتییەکان و لە نێوان ڕەوتە سیاسییە جیاجیاکان، کە هەر لە سەرەتاوە سیفەتی ڕاپەڕینەکە بووە، لەت لەت بووە و بەردەوامیش دەبێ. بەڵام ئەم لەتانە ئاقاری گشتی فراوان دەکەن، تێکی نادەن. ئەو فراوانبوونەی کۆمەڵگە و سیاسەتە هێڵی درێژی ئایدیۆلۆجیی لێ ناکەوێتەوە. لە جیهانی ئەودیو دۆگمای مەسیحییەت، خەڵک بە گوناهباری لەدایک نەبوونە، تا بەهۆی ڕاگەیاندنەوە گوناهەکانیان هەڵوەرێ. لەبەرئەوەی گوناهێکی بنچینەیی نییە، لێخۆشبوونی یەکجارەکیش نییە، کەواتە خەیاڵی گەورەش لە ئارادا نییە، قسەی گەورەی ڕزگاربوونیش مانای نییە. میسالییەکان هەر کراوە و گەورە دەمێننەوە، هەر دەبێ واش بن، بەڵام داوای درک پێکردنیان و تەواوکردنیان پێویستی بە کاری ورد هەیە لەلایەن دەستە خۆبەخشەکان کە لەودیو دەسەڵاتی دەوڵەتە (وەک: یەکەتییەکانی کار، ڕێکخراوەیلی مافی ئافرەتان، گردبوونەوەیلی قوتابیان) هەموو ئەمانە لە ڕێگەی دروستکردنی تۆڕێک لە دەوری تاک، تاک دەپارێزن، بەتوانای دەکەن، تا بتوانێ بەرگەی دەسەڵاتی دەوڵەتی نوێ بگرێ.

بوونی ئەو دەوڵەتە تازمیە ماسولکەیلی دیموکراتیی ئەو شۆڕشانە خاو دەکاتەوە، بۆ ماوەیەکی درێژ و لەبەر هۆیەکی زۆر سادە. ئەو جیهانەی بۆ ئێمە ماوەتەوە ئاڵۆز دەکرێ (زاراوەی مارکسە) بەهۆی هێزەیلی دەسەڵات کە هەر هەموویان پێکەوە کار دەکەن بۆ چەواشەکردنی. شەڕ لە دژی سوپا و دەسەڵاتی ئابووریی دژە شۆڕش ئەو دەست و دەست دەکا لەگەڵ وەلاتانی هۆشیاریی گوێزراو کە دەبێ بەڵێن بەجیهانێکی نوێ بدا. بابەتی کۆلۆنیال (ئێستە شۆڕش دەکەن لەودیو سەرابی دەوڵەتی پۆستکۆلۆنیالەوە) دروست

کرا، بەزۆر سەپێنرا، دیاری کرا وەک بابەتێک بۆ زاڵبوون و باڵادەستیی ئیمپراتۆریەتی ئەوروپا، لەگەڵ چەند شێوەیەکی حوکمڕانی کە لە جەرگەی رۆئاوا هەڵقوولا تا گەیشتە ئەوسەری ئەوانی تر. ئەوروپا جیهانی عەرەبی و موسڵمانی داگیر کرد، لەوسەر تا ئەوسەری، بەپێی ئەو شێوە دەسەڵاتەی کە بەهۆیەوە دواتر خۆی کەوتە ژێردەستی لۆجیکی سەرمایە. ئەوروپا، لە رێگەی دروستکردنی شتێکی خەیاڵی، لێک ترازا چونکە خۆی ئەو شتە خەیاڵییەی لەسەر داگیرکراوەکان دەسەپاند. پۆستکۆلۆنیالیزم شتێکی ئالیەتی بوو لە بەخەیاڵکردنی کۆلۆنیالیزم وەک شتێک کە هیچ نەبوو جگە لە چەوساندنەوەی کرێکار و زاڵکردنی سەرمایە. ئەمە هەرگیز وا نییە و واش نەبووە.

بابەتی پۆستکۆلۆنیال، شتێک زیاتر نەبوو لە بابەتی کۆلۆنیال بەڵام بە خەیاڵی رزگارکردن گەورە کرا، بۆیە خزێنرا و سەپێنرا لە مێژووی کۆلۆنیالی بە هەمان بەزمی کڵاوی بابردوو و هەمان قەناعەتی ئایدیۆلۆجی و سیاسییەوە. بۆ ماوەی زیاتر لە ۲۰۰ ساڵ، هەردوو سەدەی نۆزدە و هەژدە، کۆلۆنیالیزم فۆرمە ئایدیۆلۆجییەکانی پۆستکۆلۆنیالی دەبوو: سۆشیالیزم، ناشنالیزم، نەیتیڤیزم (ئیسلامیزم)، یەک بەدوای یەک، لە ئارامییەوە بەرەو جەنگ، بەڵام بەشێوەیەکی کاریگەر ئاکامەکانی لە ئامێز گرت. هەرکە ئەو فۆرمە ئایدیۆلۆجییە پۆستکۆلۆنیالانە دەستیان کرد بەشەکەتکردنی خۆیان، پێگەی ئەوانەی هەست بەکەمی دەکەن لە ئاسیای باشوورەوە گەشتی کرد و بووە شتێکی ئەکادیمیی ئەمەریکای باکور، پێش ئەوەی بەشێوەیەکی سیاسی کاری لەسەر بکرێ و بچێتە ناو ئەدەبی رەچەڵەکەکان. کەواتە کۆلۆنیالیزم و پۆستکۆلۆنیالیزم تێکەڵ کران بۆ گرتنەوەی شوێنی عەرەب و موسڵمان (وەک باڵا و رەهای ئەوی تر) لە دەرەوەی خودی میتافیزیکی ئەوروپی، لەوێ غەیرە رۆئاوایی هەرگیز بابەتێک نەبووە، پڕیشە لە ئاژانسی مێژوویی. تیۆریستێکی پۆستکۆلۆنیال خێرا گوتی: "من کارم بە

ئەورووپیکردنە". ئەو تیۆریستە لە بەشی ئینگلیزی و ئەدەبی بەراورد بوو، بەڕاستیشی کاری ئەوەیە. کەواتە جیهان مۆڕێکی لە چوارچێوەی خۆی داوە: خۆی دووبارە دەکاتەوە، ئاشکرا دەکا و دەشارێتەوە. لە کۆتاییدا، هۆشیاریی تەواوی مێژوویی بەزاراوەی سەروەریی خۆیان و بابەتی جیهانیانەیان، عەرەب و موسڵمان ئێستە لەو داوە دێنە دەرەوە، پێناسەیەکی تر بۆ مرۆڤایەتی دەکەن، لەودیو دانانەوەی داوی ئەورووپییەکان بۆ مرۆڤایەتی. عەرەب و موسڵمانەکان کە ئێستە شۆڕش دەکەن تەنگژەی بابەتییان نییە.

مارکس لە کۆتاییی نامەکەی بۆ ئارنۆڵد روژ راست دەبێژێ: "کاری سەردەمی ئێمە روونکردنەوەی مانای خەبات و ئارەزووەکانیەتی." راستییەکەی، من بەو ڕوحەوە ئەم کتێبە دەنووسم!.

هاوڕێیان

جیهانی کۆن مردووە

کتێبە کۆنەکان مردوون

نەوەیەک لە زەبەلاحەکانمان دەوێ

منداڵانی عەرەب،

گوێی ئایندەن

ئێوە زنجیرەکانمان دەشکێنن،

حەشیش لە بیرمان دەکوژن،

خەیاڵەکان دەکوژن.

نزار قەببانی (١٩٢٣-١٩٩٨)

## پێشەکی

### بەهاری عەرەبی: کۆتاییی پۆستکۆلۆنیالیزم

بەرەو کۆتاییی ئێران، بزووتنەوەی سەوز و ئەمەریکا (٢٠١٠)، کتێبێکە نووسیم خێرا دوای پەیدابوونی بزووتنەوەی سەوز لە ئێران لە هاوینی ٢٠٠٩، بەڵێنم دا دەست بە چیرۆکەکەم بکەمەوە لەبارەی کرانەوەی بزووتنەوەی مافەیلی مەدەنی لە ئێران و دەنگدانەوە و ئاکامەیلی جیوپۆلەتیکی لە ناوچەکەدا. لە کاتی نووسینی ئەو قسەیەی کۆتایی، وێڕای بەکارهێنانی ستایلی ئەلیگۆریی گێڕانەوە لەو کتێبەدا، مەبەستم لەو وەرچەرخانە زیاتر لە دیدێکی ڕەوانبێژیانەوە بوو نەک ئەدەبی.

ئەو دەمە هێندەم نەدەزانی کەوا ڕووداوگەلی دنیا لەپێشمانە و هەموویان وا دەکەن لە کوێ کۆتاییم پێ هێناوە لەوێ دەست بەچیرۆکەکە بکەمەوە، هەروەها جارێکی تر بیر لەو ڕووداوگەلە نوێیانە بکەمەوە کە خەریکە بزووتنەوەی سەوز لە ئێران دەبووژێنێتەوە، لە مەغریبەوە تا سووریا و لە بەحرێنەوە تا یەمەن (ئەولاتریش، لە کشمیرەوە تا سەنیگال)، هەروەها گرینگی و پێگەی ڕووداوەکانیش گۆڕاون.

درێژەدان بە شرۆڤەکەم سەبارەت بەبزووتنەوەی سەوز لە ئێران تا دەگاتە بەهاری عەرەبی لایەنی هێزی مێژوویی لەناوچوونی شتێک و نوێبوونەوەی ئازادیی جوگرافی فراوان دەکا: کردنەوەی ڕەهەندی شاراوەی دنیا و لەوێوە لەوانەیە هاوسەنگییەکی دادوەرانەتر، باشتر و خۆگرتر بێتە دەستەبەرکرن.

ئەو جۆرە خەیاڵانە پێویستیان بە ڕەگی مێژوویی و یاخیبوونێکی

ئازادانەی کێشی ئەو مێژووە هەیە. پێوەندیی نێوان بزووتنەوەی سەوز و بەهاری عەرەبی (کە هەردووک دەرهاوێشتەی یاخیبوونی درەنگکەوتووی کۆلۆنیالیزمی ئەورووپی و سێبەری کارەساتی درێژکراوەی پۆستکۆلۆنیالن) دووبارە دەروازەی مێژووی کردەوە بۆ هۆشیارییەکی نوێ. مەبەستم لە "یاخیبوونی درەنگکەوتوو" ئەوەیە زنجیرە بزووتنەوەیەکی ئازادیخواز کە چیی تر لەنگەریان نەگرتووە لەناو تەڵەی سەردەمی پۆستکۆلۆنیال، بۆیە دەتوانن پێ بنێنە ناوچەی شۆڕشگێڕی نوێ. شۆڕشی میسری بایەخێکی سەرەکیی هەیە لەم هۆشیارییەدا، چونکە لە گۆڕەپانی تەحریر تەوژمی نوێی مێژوو لە دروشمێکی سەرەکیدا رەنگ دەداتەوە: "گەل داوای رووخانی رژێم دەکا." داوای رووخاندنی رژێمێکی بالادەست ئاماژەیەک نییە تەنیا بۆ کاری سیاسی، بگرە قووڵتر بڵێم، بۆ رێڕەوی بەرهەمی مەعریفەیە لەبارەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەفریقیای باکور، جیهانی عەرەبی و موسڵمانان، رۆژئاوا و ئەوانی ترەوە، یان هەر پاشماوەیەکی تری خەیاڵی کۆلۆنیال (ئۆریەنتالیزم) کە تا ئێستەش ئازادیی ئەو کۆمەڵگانە لە رێیەکی کراوەدا لەق دەکا. ئەو ئاستەنگەی میسرییەکان تووشی بوون لە دەربازبوون لە دەستی ستەمکارێک لە رێگەی گردبوونەوە لە گۆڕەپانی تەحریر بۆ ١٨ رۆژ، بە تەنیا یەک وشە "ارحل، برۆ" لەسەر لافیتەکانیان، درێژە دەکێشێ، هەروەها داوا لە تەواوی جیهان دەکا رژێمی مەعریفە بگۆڕن کە دەمێکە ئێمەیان کوێر کردووە لە هەمبەر رووداوگەلی مێژوویی.

## داهاتوو لێرەیە

ئەوەی ئێمە بەچاوی خۆمان دەیبینین دەکرێتەوە (رەنگە یەکێ وەها سەیری بکا کە راپەڕینی فەڵەستینییەکان دەچێتە قاڵبێکی جیهانی) ساتێکە لە یاخیبوونی درەنگکەوتوو، خاڵی یاخیبوون لە دژی ستەمکارێکی ناوەخۆ و داماڵینی دەسەڵات لە دنیا وەک یەکن، ئێستە هەردووک چوونەتە ئەودیو

تەڵەکانی ئایدیۆلۆجیی پۆستکۆلۆنیال.

سەرگرتنی وڵات-نەتەوەییی بەهاری عەرەبی دەبوایە لەودیو کۆلۆنیالەوە بێ و ئێستەش بەپێچەوانەوە لە ئەگەرەکانی سەردەمی پۆستکۆلۆنیال بزر بووە لە کاتێکدا ئایدیۆلۆجیاکانی دژە کۆلۆنیال بەپێچەوانەی راکان رێگە و شوێنی رزگاربوونی مۆر کردبوو و خستبووە ناو تەڵە! ئەمە ئەو ساتەیە ئێمە دەمێک بوو چاوەڕێمان دەکرد، بەڵام هەرگیز نەماندەزانی و پێشبینیمان نەدەکرد بەتەواوی کەی دێ و لە کام قۆناخی ژیانمان دەبێ.

وروژانێک لەو ساتەدا هەیە، نەک هەر تەنیا لە راپەڕینە شۆڕشئامێزەکان، بگرە لەو هەوڵانەشدا هەیە کە دەیانگێڕنەوە، خەیاڵیان دەکەن، لە ئامێزیان دەگرن و پێناسەیان دەکەن. راستییەکەی، ئەم ساتە وروژێنەرە بەجۆرێکە چەندە هەوڵ دەدەین بیر لەو رووداوانە بکەینەوە وا پێش دێن و لێیان نزیک دەبینەوە، هێندە رووداوەکان خۆیان لێمان نزیک دەبنەوە. بەیانی لە خەو هەڵدەستین، عەقید قەزافی بەڵێنی ئەوە دەدا هیچ بەزەییەکی نەبێ بۆ ئەوانەی سووکایەتی بە ستەمکارییەکەی دەکەن، تا کاتی نووستن، دەبینین لە سوێی ژیانیدا دنیای لێ بووەتە کونە مشک. تەماشا دەکەین عەلی عەبدوڵڵا سالحی یەمەن لەسەر وارگەی ئەلیکترۆنیی BBC News چاونەترس و کەللەڕەقە، چەند ساتێک دوای ئەوە سەیری Al-jazeera.com بکە دەبینی رەوانەی نەخۆشخانە کراوە لە عەرەبستانی سعوودیە. ئەم رووداوانە سەیرن. هەواڵ وەخۆ راناگا و دەگۆڕێ، رووداوەکان بەدوای یەکتردا دێن.

ئەم هەستە سەیرە، لە پەخشان و سیاسەتدا، مانای ئەوە نییە کەوا ئەم راپەڕینە شۆڕشئامێزانە کە ئێمە ناویان لێ دەنێین "بەهاری عەرەبی" کتوپڕ بن یان پێشتر پێشبینی نەکرابن. بیرم دێ بەشدار بووم لە مێزگردێکی کەناڵی ئەلجەزیرە لەگەڵ مەڕوان بیشارە، شرۆڤەکاری گەورەی سیاسی و پێشکێشکاری بەرنامەی "ئیمپراتۆر"، هەر دوای سەرهەڵدانی بزووتنەوەی

سەوز لە ئێران لە حوزەیرانی ۲۰۰۹. ئەو کاتە گوتم ئەگەر بێتو دەسەڵاتدار بام لە هەر شوێنێک، لە مەغریبەوە بگرە تا سووریا، تەماشای بە هۆشیارییەوە تەماشای ڕووداوەکانی ئێرانم دەکرد، چونکە هەر تەنیا گەنجانی ئێران نەبوون دەرگەی جیهانیان لێ داخراوە و ئۆقرەیان لێ بڕاوە و پڕن و تۆقیون لە سیاسەتی وڵاتیان: دەمگوت ئەگەر وام کردبا ئەوا خێرا ناوچەیلی هاوشانی ئێران، تەنانەت ئیسرائیلیش، چاو لە گەنجانی ئێران دەکەن. بیشارە، بیرم دێتەوە، پێ کەنی و گوتی، "مەبەستت ئەوەیە ئێران شۆڕشێکی تر ڕەوانەی دەرەوە دەکا؟" منیش گوتم: "بەڵێ ئەو منداڵانە وا دەکەن." هەروەها ئەوەشم بیرە لە مانگی دواتر لە وارگەی ئەلیکترۆنیی CNN لە ۲۱ی تەمووزی ۲۰۰۹دا لە وتارێکدا نووسیم: "پێم وایە، تاران خاڵی دەسپێکە بۆ بزووتنەوەیەکی مافەیلی مەدەنی کەوا دەگاتە هەر وڵاتێکی ئیسلامی یان عەرەبی، تەنانەت بە ئیسرائیلیشەوە." نزیکەی ساڵ و نیوێک دوای ئەو پێشبینییانە ڕووداوگەلی تونس و میسر ڕوویان دا، بەهۆی هەستی شەڕانگێزانەی بەهاری عەرەبییەوە نەبوو، بگرە بەهۆی ئەو واقیعە تاڵە بوو لەودیو سیاسەتی ئومێدبڕیو کەوا کەشوهەوای کولتووی ناوچەکەی لەوەتەی کۆتاییی کۆلۆنیالیزمی ئەورووپی پێناسە کردبوو، هیچ هیوایەکی نەهێشتەوە جگە لە کاری توندوتیژی و نائومێدی نەبێ.

ئەم هەستە قووڵە ترۆماتاسایە ئێستە پێکڕا ڕووی لە دەوڵەتی ئیسرائیل کردووە. ئەمڕۆ ئیسرائیل ڕووبەڕووی گەلێ ئاستەنگ دەبێتەوە تەنیا لەسەر بیرۆکەی "دەوڵەتی جوان"، نەک لەبەرئەوەی سوپایەکی عەرەبی دژی دەوەستێتەوە، بگرە لەبەرئەوەی بە ملیۆن کەس کە ویستی مافەیلی دیموکراتیان هەیە سەیری دەکەن. وەک وڵاتێکی گارسۆن، ئیسرائیل خۆی لە قوژبنێک ناوە و تەنیا مامەڵە لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی دەکا، بۆیە ناشتوانێ لەو تێڕوانینە ببووری، لەبەرئەوەی ناتوانێ بوونی هەبێ لە کاتێکدا دراوسێکانی هەموو دیموکراسی بن.

## بەهاری عەرەبی خونچەیە

هەروەک کەیسی رووداوە مێژووییەکانی تر، نەتوانرا بەر لە بەهاری عەرەبی بگیرێ. بەڵام پرسیاری چۆن، کەی و لە کوێ دەمێک بوو چاوەڕێی ئاگرلەخۆبەردانی گەنجێکی تونسیان دەکرد، محەمەد بوئەزیزی، لە ١٧ی دیسێمبەری ٢٠١٠.

دوو ساڵی بزووتنەوەی سەوز کە لە حوزەیرانی ٢٠٠٩ رووی دا و چەند مانگێکی تر لە دوای خونچەی بەهاری عەرەبی لە جانیوەری ٢٠١١، ئەوە ئاشکرا بوو ئەوەی ئێمە دەمانبینی دەکرایەوە لە راستیدا راپەڕینگەلێکی کۆمەڵایەتیی گەورە و یەکلاکەرەوە بوو کە پێویستی بەوە کرد پێی بگوترێ "شۆڕش" بەو مانایەی تا ئێستە ئێمە بۆ شۆڕش هەمانە و بۆمان ماوەتەوە. بزووتنەوەی سەوز گفتوگۆی سیاسی و کاری کۆمەڵایەتیی ورووژاند لە ئێران، بەڵام تیۆکراتە شەڕانگێزەکانی لە دەسەڵات هەر هێشتەوە. شۆڕشگەلی تونسی و میسری دوو ستەمکاریان لادا، بەڵام رێژیمی حوکمڕانیان هەر هێشتەوە. راپەڕینی لیبی خوێنی لێ دەچۆڕایەوە بەهۆی کردەی سەربازیی قەزافی و تەداخولی سەربازی ئەمەریکا و ناتۆ. لە ماوەی کەمتر لە شەش مانگی راپەڕینەکاندا، رێژیمەیلی حوکمڕان لە بەحرێن و یەمەن هاتنە هەژان بەڵام هەر لە دەسەڵات مانەوە، یەکێکیان سعوودیە هاوکاری بوو و ئەوی تریان ئەمەریکا وازی لێ هێنا.

راپەڕینی سووری درندانە لەلایەن رێژیمی بەشار ئەسەد سەرکوت کرا، بەڵام جیهان ناشەرعیبوونی رێژیمەکەی بەچاوی خۆی بینی. ئەم شۆڕشانە شۆڕشی ئاکامی و یەکلاکەرەوە نەبوون وەک ئەوەی تێی گەیشتووین لە نموونەکانی شۆڕشگەلی فەرەنسی، رووسی، چینی، کوبی و، شۆڕشەیلی ئێرانی لە ماوەی سێ سەدەی رابردوودا. شۆڕش، لە دیدێکی رادیکاڵانە و گۆڕانێکی کتوپڕی دەسەڵاتی سیاسی لەگەڵ داڕشتنەوەی ئابووریی کۆمەڵگە

(واته چینێک بەسەر چینێکی تردا دەکەوێ) ئەوە نییە ئێمە لێرەدا دەیبینین، یانیش هێشتا تەواو وەها نییە. ئیفلیجبوونێکی قووڵی ڕەگداکوتاوی ئابووریی هەیە لەو کۆمەڵگانە، لایەنی کۆمەڵایەتی و کولتووریی پەک خستووە، هەموو ئەمانە لەژێر باری سیاسەتێکی بێ ئەرک و زەوینەیەکی گەندەڵ دەچن بەڕێوە. هیچ شۆڕشێکی کتوپڕی وەها ناتوانێ بە یەک جار هەموو ئەو پرسانە بگرێتە خۆ. هیچ دیدێکی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی یان کولتووری ناتوانێ گشتگیریی ئەو ڕاپەڕینە کۆمەڵایەتییانە دەربخا. لە جیاتیی نکووڵیکردن لە زاراوەی شۆڕش، ئێمە ئێستە ناچارین جارێکی تر بە بیرۆکە و تێگەیشتنی "شۆڕش"دا بچینەوە.

میتافۆرە بەهێزەکە بۆ وەسفکردنی ئەو کرانەوە یەک لەدوای یەکانەی ڕاپەڕینەکان (یەکێ دەتوانێ لەوە تێ بگا بەڵام هێشتا بەرەو سرووشتی شۆڕش نەچووە) ئەوەیە کە بارەکە وەک ڕۆمانێک دەچێتە پێش نەک وەک داستانێک، کەواتە محەمەد موسەدەقێک نییە، جەمال عەبدولناسر، یان ئایەتوڵڵا خومەینییەک نییە کە ئێمە لێرە بەدوایدا دەگەڕێین، بگرە پێشکەوتنێکی دیالۆگییە بۆ گێڕانەوەی، بە قسەی میخایل باختین، کارەکتەرەکانە ئێمە لە بیرماندا ماون و ڕووداوەکان دەگوازنەوە بەرەو ئاقارێکی کراوە. ئەم ڕاپەڕینانە، لە ماوەیەکی درێژدا، یەک بەرد چییە لە بناخەی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و لەسەرووی هەمووشیانەوە کولتووری ئەو کۆمەڵگایانە ناگۆڕن، ئەمە وێڕای نەجووڵاندنی جیۆپۆلەتیکی ناوچەکەیان و دەسەڵاتی ئەودیو گلۆبال. ئەو شۆڕشانە چەند زیاتر کاتیان بوێ، ئەوەندە لایەنی سۆزیاری، سیمبولی و ئاکامی دامەزراوەییان درێژە دەکێشێ و ڕەگ دادەکوتێ.

بەهۆی ئەو ڕاپەڕینە شۆڕشگێڕییە نێونەتەوەییانە، هەروەها وێڕای ڕاستیی ئەوەی هێزەیلی دژە شۆڕش زەحمەتە بتوانن پێشیان بگرن، لە زاڵبوون بەسەر سیستمی جیۆپۆلەتیکی ناوچەکە نزیک دەبینەوە. بۆیە، دەبێ

دەست بکەین بە چاوخشاندنەوە بە نەخشەی ئەخلاقیی "ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست"، پێش هەموو شتێ بەهۆی سڕینەوەی بیرۆکەیلی پیسی کۆلۆنیال کەوا بە ملیۆن خەڵکی لە ڕۆژهەڵات خستوومەتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. ئەم شۆڕشانە لە وڵاتانی دۆست و دوژمنی ڕۆژئاوادا ڕوو دەدەن، بۆیە جارێکی تر چەق و باڵادەستیی ڕۆژئاوا لە دنیا هاتووەتە هەژان. ئەو ڕووداوانەی لە مەغریبەوە تا سووریا، لە ئێرانەوە تا یەمەن پێش دێن، بەتەواوی جوگرافیای جیهان، بەو شێوەی ئێستە کە هەیە و بیری لێ دەکەینەوە، دەگۆڕن. چیی تر باوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ژێردەست نەما، هەروەها کاتی باکووری ئەفریقیای ژێردەستیش بەکۆتا هات. هێشتا زۆر ماوە بکرێ، بەڵام ئەوەی ناروون و نادیارە ڕێگەکەیە. هێزەیلی دژە شۆڕش بەهێز و بەئۆقرەن (لە ئەمەریکاوە تا ئیسرائیل، لە سعودیەوە تا کۆماری ئیسلامی، لەگەڵ هاوپەیمانانیان لە ڕژێمی حوکمڕان) لەگەڵ ئەوەشدا، لێشاوی لافاوەکە ویستی دیموکراتی گەلێ لەو وڵاتانەی کز کردووە، بۆیە داهاتوو ئایندە دەتوانێ پێمان بڵێ پێوەری سەرکەوتنی ئەو لێشاوە چییە.

ئەو هێزەیلە دژە شۆڕشەی ئێستە تەواو دژی ڕاپەڕینەکان دەوەستێتەوە و دەیەوێ ئاراستەیان بگۆڕێ هەر تەنیا تەداخولی سەربازیی ئەمەریکا و ناتۆ نین لە لیبیا (وەک هەوڵێک بۆ مسۆگەرکردنی پێگەی سەربازیی ڕاپەڕینەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی ئاکامەکەی)، یان تەنیا داگیرکاریی سعوودیە نییە بۆ بەحرێن، یان بەکرێگرتنی ستافی بلاکوۆتەر بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکان لە ئەبوزەبی. هەوڵەکان بۆ چەواشەکردنی واقیعەکە و بەڵگەیلی ڕاستیی ڕاپەڕینەکان هەر تەنیا لەلایەن ڕۆژئاواوە نییە، بگرە دەستی ئەوانەشی تێدایە کە زۆر دوورن لە ناوچەکە.

گۆشەنووسانی ئەمەریکی وەک تۆماس فریدمان هەوڵ دەدەن وێنەیەکی ڕوون لە نیویۆرک تایمز بە خوێنەران پێشان بدەن: "ئەم ڕاپەڕینە، لە ڕەگدا، سیاسی نییە. وجوودییە. ئەمە زیاتر بە قسەی ئەلبێرت کامۆ دەچێ تا چێ

گیڤارا. ئەو ناتوانێ شکۆمەندیی ئەو شۆڕشانەی عەرەب بە زاراوەگەلی سیاسی هەرس بکا. بەپێچەوانەوە، بەڕای فریدمان و ئەوانی تر، کە خەیاڵێکی ئەقڵانییان هەیە، عەرەبەکان کەموکووڕیی شۆڕشی سیاسییان هەیە. ئەو هەردەم وایان باس دەکا گوایە عەرەبەکان بەدوای کڵاوی بابردوو کەوتوون و قەتیش پێی ناگەن: "هەموو ئەو ڕێژیمانەی عەرەب تا ڕادەیەکی زۆر گەلی خۆیان لە شکۆمەندیی سەرەتایی رووت کردووەتەوە. لە ئازادی بێبەشیان کردوون و ڕێیان پێ نەداون بەویستی خۆیان پێش بکەون. فریدمان دوور ڕۆیشتووە و بە تەنیاش نییە لەوەی خۆزگە دەخوازێ بەهاری عەرەبی بە بەرژەوەندیی ئیسرائیل تەواو بێ. هاوشانە فەرەنسییەکەی بێرنارد هێنری ڕێڤی، زۆر دوورتر چووە و پێی وایە تەداخولێکی سەربازیی فەرەنسی بۆ پاڵپشتیی یاخییەکان ئەوە مسۆگەر دەکا کەوا لیبیای دوای قەزافی دەبێتە لای ئیسرائیل.

بەڵام هەموو ئەو هێزانەی دژە شۆڕش، کە تۆقیون لە جیهانێکی ئازاد و دیموکرات لە دەرەوەی دەسەڵاتی سەربازییان و گوتەکانیان، نیگەرانن لە فەشەل چونکە ئەگەر بێتو لێشاوی گەورەی مرۆڤایەتی هات بۆ وەرگرتنەوە و ساخکردنەوەی مێژوو، ئەوە بەکەس ڕاناوەستێ. گەلی ئیسرائیل پێویستیان بەو هاوڕێ هەڵانە نییە، وا باشە (بەم زووانە واش دەکەن) بێنە ناو ڕاپەڕینەیلی دیموکرات. لەبەرئەوەی سەرکردە شەڕخوازەکانیان چی دەکەن و چییان لە دەست دێ ئەگەر بە ملیۆنان کەس لە گۆڕەپانی تەحریر بە پێ چوونە سنووری رەفاح لە غەزە، بە چەک و دەبابە نا، بگرە بە نان و ئاو و خۆراک بۆ ١,٢ ملیۆن مرۆ کە لە کامپێک و زیندانێکی گەورەدا دەژین لەسەر ئەم زەوییە؟ ئەوا ئەو کاتە چەکی ئەتۆمی بەکار دەهێنن؟.

## زاڵبوون بەسەر سیاسەتی بێهیوایی

لە کۆتاییی دوایین کتێبمدا گوتوومە کەوا ئەمەریکا و هاوپەیمانانی تووشی ڕاڕاییەک بوونە بەرامبەر بە کۆماری ئیسلامی: ئەوان بەهێزی دەکەن جا گرینگ نییە چ کارێک دەگرنە بەر لەگەڵ ئەو تیۆکراتە شەڕانگێزە، دەبن بە دۆستی یان دوژمنی. لە هەمان کاتدا، کۆماری ئیسلامی خۆیشی تووشی هاودژێک بووەوە بەرامبەر بزووتنەوەی گەورەی مافەیلی مەدەنی کە لە ڕەگ و ڕیشەوە ئێرانی هەژاند. مەبەستم لە باسکردنی ئەو دوو هاودژییە تیشک خستنە سەر چارەنووسی نەتەوەکان بوو لە نزیکەوە کە زۆرجار بەهۆی جیۆپۆلەتیکی نێونەتەوەییی ناوچەکە هاتووەتە شاردنەوە. ئێستە لەگەڵ سەرهەڵدانی بەهاری عەرەبی، پێم وایە ئەو هاودژییە نەماوە، هەروەها جیۆپۆلەتیکی ناوچەکەش بەجۆرێک هەژاوە کەوا چیی تر کۆماری ئیسلامی تام لە سوودەکەی ناکا، لەبەرئەوەی بەفراوانی و قووڵی لێی تێک چووە. بەهۆی بەشداربوون لە زاڵبوون بەسەر سیاسەتی بێهیواییيان، نەتەوەکانی عەرەب لە ڕاستیدا بزووتنەوەی سەوزیان پتەو کرد بەهۆی بێهێزکردنی کۆماری ئیسلامی و ئاشکراکردنی دەسەڵاتی ستراتیجی لە ناوچەکەدا.

پێم وایە، بزووتنەوەی سەوز ساتێکی مێژوویی بوو کاتێ سیاسەتی نیشتمانی قیت بووەوە و ئاگری سیاسەتی ناوچەیی داگیرساند، پاشان، لە ماوەی بەهاری عەرەبیدا، جیۆپۆلەتیکی ناوچەیی لە بەرامبەردا دیمەی نیشتمانی لەخۆ گرت لە مەغریبەوە تا ئەفغانستان و لە بەحرێنەوە تا یەمەن. ئەم جوڵانەیەی نێوان نیشتمانی و نێونەتەوەیی دوو ئاکامی دەسبەجێی دەبێ: (١) سەر لە هێزەیلی دژە شۆڕش (کە ئەمان دەگرێتەوە ئەمەریکا، ئیسرائیل، سعوودیە و کۆماری ئیسلامی) دەشێوێنێ و لاواز دەکا، هەروەها کۆنترۆڵ یان دابەشبوونی شۆڕشەکان زەحمەت دەکا، (٢) دواجار بەشدار دەبێ لە داڕشتنەوەی نەخشەی ناوچەکە، هەروەها بە

ڕێگەی کـراوە و پێشـبـینینەکـراو دەسـەڵاتی جـیـهـان دادەڕێژێتـەوە. دژە شۆڕشـەکان و کـارەکانیـان (وەک ئۆپەراسیـۆنی سـەربازیی ئەمـەریکا/ناتۆ لە لیبیا، کوشـتنی فەڵەستینییەکـان لەلایەن ئیسـرائیل لە ساڵوەگەڕی نەکبە لە ١٥ی ئایاری ٢٠١١، ئەنجوومەنی هاوبەشیی داگیرکاریی سعوودیە و کەنداو و داگـیرکـردنی بەحـرێن، ڕژێمی خـەلیفـە دڕندانە ڕاپەڕینی شـۆڕشگێـڕی سـەرکـوت کـرد لە وڵات) پشت دەبەسـتێ بەدەسـەڵاتی سـەربازیی بکوژ، لە کـاتێکدا ئۆپۆزیسیۆن بـەگشـتی خـۆی بە ڕاپەڕینی ئاشـتییـانە دەردەبڕێ. لە کاتێکدا جارجـار، هەروەها لە چەند حـاڵەتێکی تایبەتی نیشـتمـانیدا، ڕەنگە دۆخـەکە بێهـیـوا و شـێـواو بێـتـە بەرچاو، هەڵکشـانی لێشـاوی نێونەتەوەیی لەژێر کـۆنتـرۆڵی کـەسدا نییـە. گومـانی تێدا نییـە ئەمـەریکا و هـاوپەیمانە ئەورووپی و ناوچـەییـیـەکـانی ئەوەی لە دەست و دەسـەڵاتیـاندا بـێ دەیکەن بۆ ڕێگرتن لە سەرکەوتنی ئەو ڕاپەڕینە دیموکراتییانە. بەڵام سەر ناکەون.

هـەڵکشـان و داکشـانی لێـشـاوەکە، پێـشکەوتن و دواکەوتنی ئـەو دۆخـانە وەها نامێنێتەوە. من پێم وایە ئێمە دەچینە پێش، ئاگاشمان لە خۆمان نییە، بەڵام چوونەپێـشـەکە بەردەوامـە بەرەو دۆزینـەوەی جـیـهـانێکی نـوێ. ڕێیـەکە تژییە لە تاسە و نابەجێیە، تژییە لە هـەوراز، هـەروەها پاڵپشـتانی ئەمـەریکی و ئەورووپی هەوڵ دەدەن جڵـەوەکە بگرنـەوە، بەڵام ئەو ڕووداوە درامییـانە هـەر دەکرێتەوە وەک ڕۆمـانێکی کۆتا-کراوە نەک داستـانێکی مـەنەلۆجئاسـا. لەم کرانەوەیەدا، ئێمـە گـۆڕانێک بەدی دەکـەین بەرەو گـێـڕانەوەی کـولتـوورێکی کـۆزمـۆپۆلیـتـانی نکووڵی لێکراو و سـەرکـوتکراو، نەک شـۆڕشـێکی کـوێر بە کـارنامـەی سنووردار و کـڵـێـشـەی ڕزیوی سـیـاسـی. هـەردەم جـیـهـانـێکی کـۆزمـۆپۆلیـتـانـی هـەیە لەبارەی ئەو کـولتـوورانە، ئەگـەر ئـەو ڕووداوانە نەبێ، لەژێر هێـز و ناوی "ئاینی" بەرامبـەر "عەلمانی"، "نەریتی" بـەرامبەر "مـۆدێرن"، ڕۆهـەڵاتی" بەرامـبـەر "ڕۆئاوایی" هـاتووەتە شـاردنەوە. ئەم کـڵـێـشـانـە بەپێی تێپەڕبوونی کـات خزمـەتی خـۆی کرد و نوێنەرایەتیکردنی تێکوپێک دا و ئەو

جیهانەی چەواشە کرد ئێمە پێناسەمان کرد و ئێستە ئەوەندە شەکەت بووە هەموو ئەگەرێکی لە دەست داوە. پێم وایە سەردەمی رکابەریی ئایدیۆلۆجی (کە ئەو جۆرە بەربەستە هەلآنەی بەرهەم هێنا، کە هەمووی لەژێر دەسەلآتی کۆلۆنیالی دروست بوون) بەسەر چوو، هەروەها ئەو سەردەمەش بەسەر چوو ئێمە وەک "پۆستکۆلۆنیال" ناسیومانە.

## کۆتاییی پۆستکۆلۆنیال

بەرای من، لە کۆتاییدا سەرکەوتین بەسەر ئەو دۆخەی پێمان دەگوت "کۆلۆنیالیتی" و "پۆستکۆلۆنیالیتی". دواجار کۆلۆنیالیتی شکستی هێنا، بەهەناسەی نوێ هەناسەی ئایدیۆلۆجیی پۆستکۆلۆنیال نەژیا. ئەوەی من، لە دەیەی بووری لە دۆخی ئێرانی و ئیسلامی، پێم دەگوت "پۆست-ئایدیۆلۆجی" تەواو ئاکامی ئەم زاڵبوونەیە بەسەر ئەو دۆخەی تییدا گەلێ ئایدیۆلۆجیا (لە سۆشیالیزمی جیهانی سێیەمەوە بۆ ناشنالیزمی دژە کۆلۆنیالەوە بۆ ئیسلامیزمی سەربازی) خرانە کار و تاقی کرانەوە. هەلومەرجی داستانیی ئەو کۆلۆنیالیتییە دواجار خۆی شەکەت کرد. پەیدابوونی باری زانیاریی بەرهەمهێنان کاریگەرترین دروشمی میسرییە لە گۆرەپانی تەحریر دروست دەبێ: ئازادی، دادوەریی کۆمەلآیەتی و شکۆمەندی. ئەم سەرکەوتنە بەسەر کۆلۆنیالیتیدا، کە دواجار خۆی لەناو پۆستکۆلۆنیالیتیدا ون کرد، ئاماژەیە بە گەرانەوە بۆ بەردی بناخەی ژیانێکی مەدەنی کە لە سەردەمی کۆلۆنیالیزمی ئەورووپی لە ئاسیا و ئەفریقیا رۆ چووبوو لەژێر ناوی رێرەوێکی ئایدیۆلۆجی بەرەو ئازادی. ئەم راپەرینە شۆرشئاسایانە پۆستئایدیۆلۆجییان، واتە، چیی تر شەر ناکەن بە زاراوە و ویستی کۆلۆنیالیتی.

بۆیە ئێمە گەرانەوەیەک دەبینین کە لە رووی سیاسییەوە رێی تێ دەچێ بەلآم لێڵە چونکە کلێشەیەکی روونی شۆرش نییە: واتە دیکتاتۆرێک دەروا و

یەکێکی تر دێتە جێی. لێرە مەبەستم لە "گەڕانەوە" واتە چاکبوونەوەی جیهانیی کۆزمۆپۆلیتانی تێیدا دەکرێ بیرۆکە و کاری مەدەنی و ئازادانە بێتە بەرهەم. بۆیە ئەم کۆزمۆپۆلیتانە بەتەواوی پێشەوانەی "ڕۆئاوایزمە". ڕاستییەکەی، ئەمە کۆتاییی "ڕۆئاوایزم"ە چونکە شەکەت بووە و ڕۆ چووە لە زانیاری. هەر تەنیا ڕۆئاوا نییە ئۆپۆزیسیۆنی دووسەرەی دروست کرد، بگرە یەکەتیی ئەوروپاش لە ڕاستیدا دەگەڕێتەوە ناو سنوورەکانی و ناسنامەی خۆی لەبەر لێشاوی کۆچەرانی تر کە لە ئاسیا و ئەفریقیاوە دێن (ئەمەریکای لاتین بۆ ئەمەریکا دەژین). بەهاری عەرەبی، ئاماژەیە بە دۆزینەوەی جیهانێکی نوێ، گێڕانەوەی متمانە بۆ جیهان، کاتی ئەوەیە جیهان بەئاگا بێتەوە بەهۆی چاکیی خۆی و هێزی ئەو شۆڕشانە. لە ئەنجامدا، یاخییەکان گەڕانەوە نییە بۆ ئایدیۆلۆجیای ڕەها بگرە کشانەوەیە بۆ جیهانێکی کۆزمۆپۆلیتانی کەوا هەردەم سەرکوت کراوە لەژێر چەپۆکی ستەمی ناوەخۆی و ئیمپریالیزمی جیهانی.

سەرهەڵدانی ئەم جیهانی کۆزمۆپۆلیتانە نەک هەر تەنیا کۆتاییی ئیسلامی سەربازی بگرە کۆتاییی تەواوی ئایدیۆلۆجیا ڕەهاکان و لەتبوونە هەڵەکان و ئەو ئیختیارانە ڕادەگەیەنێ کەوا بەسەر جیهانیاندا سەپاندووە. لە کتێبەکەم بەناوی "پێستی قاوەیی، دەمامکی سپی" (٢٠١١) هەوڵم دا بگەمە سەر ئێسکی تاکە ڕۆڵی ڕۆشنبیرە بەئەزموونەکان لە دروستکردنی قەناعەت بۆ پرۆژەگەلی ئیمپریالی لە ڕێگەی خۆ ڕەپێشدان و حەزی سەروشتیی نزمەیانەوە. لە دوای بزووتنەوەی سەوز و بەهاری عەرەبی، پێم وایە، هەموو ئەو درۆ ئایدیۆلۆجییانە روونن بۆیە ئەو "نیشتمانپەروەرە گومڕاکارانە" دەرکەوتن و ڕەهایەتییان ئاشکرا بوو. ئەوان سوودمەند بوون لە جیهانێکی دوو جەمسەری، تێیدا، سەرەتا یەکەتیی سۆڤیەت و ئەمەریکا جیهانیان لەت کردبوو بۆ ئەوەی باشتر حوکمی بکەن، پاشان کاتێ یەکەتیی سۆڤیەت رووخا و ترسی جیهانێکی تاک جەمسەری خێرا بەسەر ئێمەدا

نیشت. سەرۆک جۆرش دەبلیو بوش (١٩٨٩-١٩٩٣) ناوی لەو جیهانە نا "سیستمێکی نوێی جیهان"، هەروەها پرۆژەی "سەدەیەکی نوێی ئەمەریکا" ئەو مۆتەکەیە بوو پارێزکارە نوێیەکانی ئەمەریکا دەیبینی بۆ حوکمڕانی. ئالان بلوم، فرانکسی فوکویاما، ساموێل هەنتینگتن و نیال فێرگەسۆن رابەرانی سەرەکیی سیستمە نوێیەکە بوون، پێش ئەوەی ئەنتۆنیۆ نیگری و مایکل هارت دیدێکی جێگرەوە پێشنیاز بکەن.

پاشان ١١/٩ رووی دا و چووینە ناو سەردەمێکی پۆست-ئایدیۆلۆجی هەر تەنیا پۆست-ئیسلامیزم نا، بگرە پۆست-ئەمێریکانیزم و پۆست رۆئاوایزم، ئەمەش واتە رۆچوونی رۆئاوا وەک خاڵی دەسپێکی مەعریفە و بەرهەمهێنانی دەسەڵات. تۆقینێک پێش هات پێی گوترا "ئیسلامۆفۆبیا" کە خێرا ئەورووپا و ئەمەریکای باکوری داپۆشی، ئەمە مانیفێستۆی زینۆفۆبیا (رکبوونەوە لە بێگانە) بوو پێش هات بەهۆی ترسی بیانییەکان وەک "کرێکارانی میوان". بەهاری عەرەبی کۆتاییی هێنا بە سیاسەتی بێهیوایی. لەم وەرزەی بەهاردا، ئێمە دەچینە پێشێ. لە راستیدا، زۆر نزیکین لە دۆزینەوەی جیهانێکی نوێ، جوگرافییەکی وەها ئازاد کەوا داوای ئاقارێکی نوێ دەکا بۆ رۆشنبیری و هەر خۆشی دروستی دەکا، ئەم سەردەمە سەردەمی هاووڵاتی و ئازادییە مەدەنییەکانە.

## یاخیبوونی دواخراو

مشتومڕی سەرەکیی من لەم کتێبەدا، کەوا لە جەرگەی بەهاری عەرەبیدا دەینووسم، دۆخ خوێناوی و تەقینەرە، تۆقیو و ترسێنەرە، برێتییە لە بیرۆکەی یاخیبوونی دواخراو کە بوومتە بناخەی ئەم راپەرینە شۆڕشئاسایانە کەوا چەندان وڵاتی گرتوومتەوە، هەر لە مەغریبەوە بگرە تا ئێران، لە سووریاوە تا یەمەن. من پێشنیازی ئەو بیرۆکەیە دەکەم لە رێگەی خوێندنەوەیەکی تایبەت بۆ کۆتاییی کۆلۆنیالیتی بەزمانێک کە زۆر روونی

دەکەمەوە. من ئەو شۆڕشانە بە کراوە و نەبڕاوە دەزانم، تێیاندا سیاسەتی نیشتمانی ئاکامی نێونەتەوەیی دەبێ، پێچەوانەکەشی هەر راستە.

شۆڕشی تونس بووە هۆی هەڵگیرسانی بەهاری عەرەبی، هەروەها شۆڕشی نێونەتەوەیی لەو ناوچانە ئاکامی تایەتیی خۆیان هەبووە، وەک ئاشتبوونەوە و لێک نزیکبوونەوەی حەماس و فەتح لە فەڵەستین، کە لە ئەنجامدا کاردانەوە هەبوو لە فەڵەستینییەکان لە لبنان، سووریا و ئوردن، کە هێزەیلی ئیسرائیلیان بەزاند و چوونە ناو خاکی داگیرکراویان. ئەم کارانە ئاماژەیەکن بە کۆتاییی سیاسەتی بێهیوایی و کارکردن، تێیدا ئەمەریکا و هاوپەیمانە ئەورووپیی ناوچەییەکانی لەلایەک بوون و کۆماری ئیسلامی و لایەنگیرەکانی (حەماس، حزبوڵڵا و سوپای مەهدی) لەلاکەی تر نەیانتوانی ئارەزووی دیموکراتی ملیۆنان مرۆڤ بوەستێنن.

کیانی نەخۆشی وەک قاعیدە و ئوسامە بن لادن ئێستە تەواو مردوون، ئەو خەیاڵانەی ئەمەریکا دروستی کردبوون و هەر خۆیشی کۆتاییی پێ هێنان. هەر ئوسامە بن لادن نەبوو نێژرا لە گۆڕەپانی تەحریر، بگرە هێزی سەربازیی ئیسرائیلیش بوو، سوپایەکی سەربازی کە ڕێز لە شایستەییی مرۆ ناگرێ. ئەوەی لە گۆڕەپانی تەحریر سەرکەوت دەسەڵاتی ناتوندوتیژی بێ گوێی مەدەنی بوو، توندوتیژییەکی نوێ بوو، کە تاکە زمانە ئیسرائیل قسەی پێ دەکا، هەروەها ئەو هۆکارانەی کە درێژە بە داگیرکاریی فەڵەستین دەدا. هەمان ئەم شتانە راستن بۆ کۆماری ئیسلامیی ئێران، سووریا و حزبوڵڵاش. حەماس یەکسەر خۆی لە کۆماری ئیسلامی دوور خستەوە و لەگەڵ فەتح یەکی گرتەوە. بەکورتی، ئێمە لە خاڵی ئەزموونکردنی جیهانێکی نوێداین، لە جوگرافییەکی نوێی ئازادداین، لەودیو سنووری خەیاڵەکانی تیرۆریستان و ئیمپریالیستەکان.

سەرهەڵدانی بزووتنەوەی سەوز لە ئێران ئاماژکەیەکی روون بوو بۆ ئەو

ڕێکخستنەی من ناوم لێ ناوە "مۆدێرنیتەی کۆمەڵایەتی" کە شوێنی هەوڵە فاشیلەکانی "مۆدێرنیتەی سیاسی" دەگرێتەوە. باسی ئەوەم کردووە کەوا مۆدێرنیتەی سیاسی تا سەر ئێسک پرۆژەیەکی دۆڕاوە چونکە بنچینەکەی لەسەر ئایدیۆلۆجیای ڕەها بنیات نرابوو کە سەرەتا لە دژی کۆلۆنیالیزمی ئەوروپا دانرا و دواتریش دژی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا. ئەم ڕێکخستنە ڕاستەوخۆیانە سێ جۆرە ئایدیۆلۆجیای جیاوازیان بەرهەم هێنا: ناشنالیزمی دژە کۆلۆنیال، سۆشیالیزمی جیهانی سێیەم و ئیسلامیزمی سەربازی. لە ئێران، ئیسلامیزمی سەربازی هەردوو ئایدیۆلۆجیاکەی تری لەبار بردووە، وزەیانی بردووە، ڕێکخراوەکانیانی لەناو برد، سەرکردەکانیانی کوشت، هەروەها سەرکەوت لە دروستکردنی کۆمارێکی ئیسلامی کە سیستمێکی ئاینیی دڕندانەیە و تەواو وەستا و هونەرمەندە لە پیادەکردنی ستەمکاری. ئەمە سەرکەوتنێکی هاودژ بوو، لەبەرئەوەی کۆماری ئیسلامی لەلایەک ئیسلامیزمی سەربازی تەواو پیادە کرد، لەلایەکی تریشەوە لە ڕێگەی هاودژی و لێڵیی شیعیزمەوە ئیسلامیزمییەکەی شەکەت کرد و بەرەو کۆتاییەکی سەرسەختی برد. پاشان لە کۆماری ئیسلامیدا، ئیسلامیزمی سەربازی سەرکەوت بەسەر ئایدیۆلۆجیا ڕکابەرەکانی و پێدا پێدا بەهێز بوو، هاوکات هونەری ئایدیۆلۆجیاکەی لەبار چوو لەنێو ڕووداوە مێژووییەکان و کۆن بوو. ئەنجامەکە هەر تەنیا کۆتاییی ئیسلامیزم نییە، یان سەرەتای پۆست-ئیسلامیزم، هەروەک لێکۆڵەرانی وەک ئەسیف بەیات وای وەسف دەکەن، بگرە کۆتاییی ئایدیۆلۆجیای داگیرکەرە و سەرەتای دەسپێکێکی نوێیە بۆ هەموو ئەو ئایدیۆلۆجییە ڕەهایانەی بەهۆی ڕکابەریی ئایدیۆلۆجی نێوان ئیمپریالیزمی ئەوروپی و ئەمەریکایی دروست بوون. مەبەست لە پۆست-ئایدیۆلۆجی واتە زاڵبوون بەسەر پۆست-کۆلۆنیال بۆ هەموو ئەو ئایدیۆلۆجیانەی بەرهەم هاتن لە ماوەی دووسەت ساڵی ڕابردوودا لە ئاسیا، ئەفریقیا و ئەمەریکای لاتین، هەموو ئەمانە بەرپەرچی

بالادەستیی کۆلۆنیالیان داوەتەوە و وڵاتی پۆستکۆلۆنیالیان لێ بووەتەوە.

شەکەتبوونی ئایدیۆلۆجیای ئیسلامی واتای کۆتاییی ئەو ئیسلامیزمە سیاسییەش دەدا کە ئێمە ناسیومانە. ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئیسلام چیی تر رۆڵی نییە لە سەرهەڵدانی سیاسەتی تر، دەبێ، چونکە موسڵمانەکان دەبن بە بەشێک و پشکی ئەو سیاسەتە. ئەمە واتە ئایدیۆلۆجیاکانی نێوان "ئیسلام و رۆئاوا" شەکەت بوون، هەروەها ئیسلام وەک ئاینێکی جیهانی دەچێتەوە ناو سیاقە کۆزمۆپۆلیتانەکەی، واتە لە مانیفێستۆ نوێیەکەیدا دەبێ بیرکردنەوەی غەیرە ئیسلامیش پەسند بکا. ئەو جیهانە نوێیەی وا سەر هەڵدەدا و من ناوم لێ ناوە جیهانی کۆزمۆپۆلیتان، کە من پێم وایە هەردەم بناخەی ئەو کۆمەڵگایانە بووە و ئێستە بە مەبەست پاشەکشەی کردووە و بەرەو داهاتوویەک دەچێ. ئەم پاشەکشە بەمەبەستە من پێی دەڵێم جوگرافیای ئازادی.

لینکێکی راستەوخۆ هەیە لە نێوان بزووتنەوەی سەوز و بەهاری عەرەبی، لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە یەکێکیان هەوێنی ئەوی تر بووبێ، هەرچەندە گومان لەوەدا نییە کەوا گەنجانی میسری و تونسی کاریگەریی کارەکانی گەنجانی ئێرانیان لەسەر بوو کە لە ۲۰۰۹دا کردیان و ئەو گەنجانەی کشمیریش کە لە هاوینی ۲۰۱۰دا دژی داگیرکاریی خاکیان لەلایەن هیندستان وەستانەوە، بەڵام لینکەکە ئەوەیە کەوا رووداوەکان لە جیهانی عەرەبی و ئێرانی و پشت ئەوانیش ئاماژکە و سیمبولن بۆ فۆرمێکی نوێی بڵاوبوونەوەی شۆڕش. لەوانەیە کۆماری ئیسلامی و عەرەبستانی سعوودی کەوتبنە داوەوە، ئەمەریکا و ئیسرائیل رەنگە بیانەوێ سعوودیە لەسەر تەخت بمێنێتەوە و کۆماری ئیسلامی بە زاراوەی خۆیان هەرتەکێنن. راستییەکەی، ئەو دوو سیستەمە ئاینی و پێگە عەشایرییەی ئێران و سعوودیە تا سەر ئێسک کاریگەریی بەهاری عەرەبییان گەیشتووەتێ، تووشی گرفت بوونە و تۆقیون لەو راپەڕینە دیموکراتییانەی روو دەدەن. ئەو

دوو ڕژێمە شەڕانگێز و دوژمنکارە لەوانەیە پەنا بەرن بۆ هەر شتێ لە دەستیان بێ تا لە دەسەلات بمێننەوە، بەلام شکست دێنن، ئەمە قورس و ڕەقە، بەلام هەر روو دەدا. یاخیبوونی دواخراو ئێستە پەکی خستوون و دواجار لەناویان دەبا. ئەوانە پیر بوونە، قۆپاونەتەوە، ئەوانە پاشماوەی خەیالی سیاسەتێکی ترسناکن کە دەمێکە ئەو سیاسەتە مردووە. دڕندایەتی، هێز و قۆرخکردنی هەستی ئاینییانەی خەلک تاکە شتن لە دەست ئەو دوو ڕژێمە ماوەتەوە. بەرامبەر و دژیان ئەو شۆڕشانەیە کە بنیان نییە. سەرکەوتنی پێورراویان ئامازەی شکست نییە، بگرە ئامازکەیەکی تەواوە بە تەندروستییان. پێدا پێدا و لەسەرخۆ پێش دەکەون چونکە سوورن لەسەر هەلتەکاندنی ڕژێم چونکە "الشعب يرد اسقط النظام".

## گەڕانەوە بۆ مەیدانی هێزی مێژوو

گەلێک لەمێژە پێمان گوتراوە مێژوو کۆتایی هاتووە. بەهاری عەرەبی ئێمەی گەڕاندەوە ناو مەیدانی هێزی مێژوو. ئەم ڕاپەڕینە شۆڕشئاسایانە هەر بیردۆزێکی بەمۆدێرنکردن دەسەلمێنن: بەڕۆژئاواییکردن، بەئەورووپیکردن، ڕۆژئاوا بووەتە پێوەر بۆ ئەوانی تر، کۆتایی مێژوو، ململانەی شارستانییەتەکان و هەلە. وێڕای ئەمانەش، ئەو بەرە لەژێر پێی تەواوی ڕژێمی بەرهەمهێنانی مەعریفە دەردێنن کە دەمێکە دەستیان گرتووە بەسەر بەش و ئازادییەکانی زانستی سیاسی و دیراسە لە بواری بازرگانی. تەواوی دەزگە تێکەلاوەکەی ئەمەریکای باکور، ئەورووپای ڕۆژئاوا و پڕوپاگەندەکانی ئیسرائیل بوونە هەوێنی توورەییەکی بن نەهاتوو، ئەمانە ماوەی نیو سەدە زیاترە جیهانێکی گەوجی عەرەبییان دروست کرد کە عەرەب بەرەوپاش، توندوتیژی، نالیهاتوویی و بوودەلەیی دەبا. ئەو نووسەرانەی پشتگیریی ئەو جۆرە کلێشە وێرانکارییانە دەکەن، بۆ خوێنەرانی زیندانیکراویان دەنووسن، کە ناتوانن خەیالی جیهانێکی تر

بکەن، بۆیە ئەو عەرەبانەی ئێستە لەسەر شەقام دەبینرێن هەر تەنیا بریکاری مێژووی خۆیان نین، لە راستیدا ئەوانن دۆزەرەوەی جیهانێکی نوێ. ئەمە ئەو ساتەیە کەوا سیستمی خۆر و زەوی کۆپێرنیکەن هاتووە و زەوی لەبەر پێمان دەردێنێ. ئەم جیهانەی وا پەیدا دەبێ هەر تەنیا لەودیو گەشەی ناوچەیی و دابڕی ئەو شتە نییە کە پێی دەڵێن "رۆئاوا"، بگرە لەودیو جەستی کۆلۆنیالیتییە کە بە هەڵە پشتی موبارەک، بن عەلی و قەزافیی دەگرت، بەشێوەیەک کە خۆیان بە سەرانی پۆستکۆلۆنیال ناوزەد دەکرد بۆ ئەو نەتەوانەی وایە بە هەڵە داوای مافەکانی خۆیان دەکەن.

لە خونچەساتی بەهاری عەرەبیدا، ئێمە هەموومان ئازاد کراین لەو نەخشە تەڵەئاسایەی گەردوونمان کەوا لەودیو بۆچوون و لێکدانەوەی کۆلۆنیالیتی بوو. لە شوێنی ئەو خەیاڵانەی کۆلۆنیالیتی، ئایدیۆلۆجییە مەعریفییەکان کەوا هەڵەی رۆئاوایان کردبووە تارمایی بەسەر خەیاڵی ئەوانی ترەوە، ئێمە دواجار کۆتایی داستانێکی پڕ لە توندوتیژی دەبینین کەوا بە ویست و دەستی رۆئاوا چەنەی لێ دەدرا. داستانێکی رۆئاوایی بوو کە بەردەوام خۆی دادەهێنایەوە و ئەوانی تری سەرکوت دەکرد. لەم شۆڕشە بن نەهاتووانەدا، کە یاخیبوونی دواخراو هاتووەتە مەیدان، راستییەکەی ئێمە لەودیو کلێشە دیموکراتییەکانین، نەخشەی سەربەخۆیی جوگرافی خەیاڵی دادەڕێژینەوە و دواجار دەچینە ئەودیو ئازادییەکانی ئەوان، ئەوەش دەگاتە ئەوپەڕی قووڵی و دووریی دروستکردنی کولتوورێکی گشتیی جیهانی نوێ.

## یەکەم

## لەقکردنی جیهان:

## چۆن بەهاری عەرەبی دەستی پێ کرد

بەهاری عەرەبی لە جەرگەی زستان لە ١٧ی دیسێمبەری ٢٠١٠دا دەستی پێ کرد، ئەو دەمەی محەمەد بوعەزیزی، دەسگێڕێکی ٢٦ ساڵان لە سیدی بوزید لە تونس، ئاگری لەخۆ بەردا وەک ناڕەزاییەک لە دژی دەسبەسەرداگرتنی عارەبانەکەی. ئەو کاتە ئەمە کارێکی بزر بوو، هیچ کەس، تەنانەت وەزارەتی بەرگریی ئەمەریکاش، ئەو رووداوەی نەبیستبوو. لە دەرەوەی راداری جیهان بوو، بەڵام کپییەکەی هێندەی نەکێشا. هەر هەمان رۆژ ناڕەزایی دەستی پێ کرد، سەرەتا لۆکالانە هەر لە سیدی بوزید بوو، بەڵام پاشان بە هەموو وڵاتدا پەرت بوو. ناڕەزاییەکە هێندە گەورە و لەناکاو بوو وای لە سەرۆک زەینەلعابدین بن عەلی، کە لە ١٩٨٧ەوە جڵەوی لە دەستە، کرد نوشدارییەک لە ٢٨ی دیسێمبەر دەربکا کە تێیدا گوتی ئەوانەی ناڕەزایی دەردەبڕن بەتوندی دێنە سزادان.

بەهاری عەرەبی یەکەم سەرکەوتن و جووڵەی خۆی وەک ناڕەزاییی جەماوەری و ئیدانەکردنی فەرمی تۆمار کرد، جووڵەیەک کە خێرا بە تەواوی جیهانی عەرەبی ئاشنا دەبێ. لە ٦ی جانیوەری ٢٠١١، ناڕەزاییەکی سەرتاسەری لە جەزائیر دەستی پێ کرد، فڕینی نرخ خاڵی سەرەکیی ناڕەزاییەکە بوو. کەواتە ئێستە دوو وڵاتی عەرەبی چاوشارکێ لەگەڵ میدیای جیهانی دەکەن. لە ٩ی جانیوەری کوشتار و بریندار لەناو خۆپێشاندەرانی بێ چەک لە تونس راگەیەنرا، ئەمە هاوشان بوو لەگەڵ

لێبوونەوەی چەند پۆلیس و سەربازێکی پلە بڵند لە دەوڵەت. لە چەند ڕۆژێکدا، لە ١٣ی جانیوەری، بن عەلی بۆ یەکەم جار لە بەردەم خەڵک تەنازولی کرد و بەڵێنی دا لێکۆڵینەوە لە کوشتنەکان بکا. بەڵام هەر ڕۆژی دواتر بارگەی تێک نا و تونسی بەجێ هێشت و چووە سعوودیە، هاوکات محەمەد غەنوچی سەرۆک وەزیرانی لە جێی خۆی دانا. نزیکەی کەمتر لە مانگێک خۆپێشاندان، تونس ڕووخا و بن عەلی هەڵات. ڕاپەڕین سەرکەوت. جیهانی موسڵمانان و عەرەبی واقیان وڕمابوو و تەماشایان دەکرد و دەیانپرسی: بەڕاستی ئەمە ئاساییە، چما هێندە ئاسانە؟

سێ ڕۆژ دوای ئەوەی بن عەلی تونسی بەجێ هێشت، لە ١٧ی دیسێمبەری ٢٠١١، خاوەن ڕێستورانتێکی میسری ٤٠ ساڵانە، عەبدو عەبدول مونعیم حەمەدا، لە نزیک پەرلەمانی میسری وەک نارەزاییەک لە دژی باری خراپی ئابووری ئاگری لەخۆ بەردا. ئەمە تەواو لاساییکردنەوە بوو، بەڵام هێندە سەرنجی خەڵکی ڕانەکێشا. تا ٢٥ی جانیوەری هیچ ڕووی نەدا، لە پشووێکی نیشتمانی بەبۆنەی ڕۆژی پۆلیسان، بە دەیان هەزار میسری ڕژانە سەر شەقام، خۆیان ناویان لەو ڕۆژە نا "ڕۆژی تووڕەیی"، بە ئاشکرا سەرکۆنەی ڕژێمی موبارەکیان کرد. ئەم جۆرە خۆپێشاندانانە ئاسایی بوو لە میسر، بەڵام ئەمە جیاواز بوو چونکە ڕاستەوخۆ وەڵامی ڕووداوەکانی تونس بوو. هەوڵ و کۆشش لە ئارادا بوو. میدیای دنیا لە ئامادەسازیدا بوو. کەناڵی جەزیرە چاوی لێک نەنا. چوار ڕۆژ پاشتر، لە ٢٩ی جانیوەری، سەربازانی میسری بەسەر شەقام وەربوون و سەرۆک موبارەک، کە لە ١٩٨١ەوە جڵەوەکەی گرتووە، حکوومەتەکەی هەڵوەشاندەوە. بەڵام داوای خۆپێشاندەرانی ڕەت کردەوە و لانەچوو. ڕۆژی دواتر، ئۆبامای سەرۆکی ئەمەریکا داوای گواستنەوەیەکی هێمنانەی دەسەڵاتی کرد لە میسر. لە ٣١ی جانیوەری، بە سەتان هەزار میسری هاتنە ناو گۆڕەپانی تەحریر، بە ڕوحێکی گەورە، سووربوون، وەک کەشوهەوایەکی کەرنەڤاڵئاسا،

خۆپیشاندان سەعات دوای سەعات تەشەنەی دەکرد. یاریی مشک و پشیلە دەستی پێ کردبوو. موبارەک بەڵێنی چاکسازیی دیموکراتیی دا و گوتی جارێکی تر خۆی کاندید ناکاتەوە، بەلام جەماوەر دڵیان بەمە ئاوی نەخواردەوە. لە ١ی فێبروەری، نزیکەی یەک ملیۆن میسری لە گۆرەپانی تەحریر بوون و داوای لاچوونی موبارەکیان کرد. رۆژی دواتر، رێژیم خۆپیشاندانێکی ساز کرد بۆ لاگیریی موبارەک، هەروەها چەند چەکدارێکی لەسەر وشتر نارد تا هێرش بکەنە سەر خۆپیشاندەران. ئەمە کپ کرا و میدیا پێی رانەگەیشت، بەلام خراپ بەسەریاندا شکایەوە. خۆپیشاندەران زیاتر سوور بوون و دنیاش تەماشای دەکرد. رۆژی دواتر، ٤ی فێبروەری، سەتان هەزار میسری ناوی لە رۆژەکە نا "رۆژی رۆیشتن"، داوایان کرد موبارەک لاچێ. لە ٥ی فێبروەری، سەرۆک وەزیرانی نوێ، عومەر سلێمان، گوتی قسە لەگەڵ پارتەیلی ئۆپۆزیسیۆن دەکا، بە ئیخوان موسلمینیشەوە. هەروەها رای گەیاند سەتا ١٥ی مووچەی فەرمانبەرانی حکوومەت زیاد دەبێ. بەلام ئەمە هیچ نەبوو و زۆریش درەنگ بوو: لە ٩ی فێبروەری یەکەتییەکانی کار پێوەندییان بە خۆپیشاندانەکان کرد. موبارەک وتارێکی تری لە ١٠ی فێبروەری دا، ئەمەیان " لە دڵەوە بوو"، بەڵێنی چاکسازیی زیاتری دا، گوتی جارێکی تر خۆی هەڵنابژێرێتەوە، بەلام هەر رەتی کردەوە لاچێ. ئەوانەی لە گۆرەپانی تەحریر بوون سوور بوون لەسەر ئەوەی کە دەبێ بڕوا. رۆژی دواتر، ١١ی فێبروەری، عومەر سلێمان، جێگری سەرۆکی نوێ، رای گەیاند کەوا حوسنی موبارەک لە تەخت هاتە خوارێ و لاچوو و، ئێستە سوپا جڵەوی لە دەستە. تەنیا لە ماوەی دوو هەفتەدا، دوای رووخانی بن عەلی، رێژیمی حوسنی موبارەکیش رووخا: جیهانی عەرەبی تەماشای دەکرد و فێر دەبوو. ئیدارەی ئۆباما لە خەت گیرا، ئەورووپییەکان سەریان سڕمابوو، ئیسرائیل دەترسا. کۆماری ئیسلامی هەڵپەی کرد و خێرا شۆڕشی میسری بە شۆڕشێکی ئیسلامیی لە قەڵەم دا، بەلام ئیخوان

موسلمین یەکسەر بەیاننامەیەکیان دەرکرد و ئەوەیان رەت کردەوە: ئەمە شۆڕشێکی ئیسلامی نییە، ئەمە شۆڕشێکی میسرییە. ئێستە بەهاری عەرەبی گەورەترین سێوی بەدەستەوە بوو، رووداوەکان یەک بەدوای یەکدا دەهاتن. ئاخۆ ئێستە دەبێ نۆرەی کام وڵات بێ؟

لە ١٦ی فێبروەری، نارەزایی لە بنغازی، لیبیا سەری هەڵدا. رۆژی پاشتر، ململانەی زیاتر لەگەڵ پۆلیس و هێزەیلی تەناهی راگەیەنرا. هۆی سەرەکیی گرتنی چالاکوانێکی بواری مافی مرۆڤ بوو بەناوی فەتحی تاربیل، کە ناسراوە بە کارەیلی بێ وچانی بۆ خێزانەکانی قوربانییانی کوشتارگەی ١٩٩٦ لە زیندانی ئەبوسالم، دەگوترێ لەو زیندانەدا زیاتر لە هەزار زیندانی لەدار دراون. لە ٢١ی فێبروەری، بڵاو کرایەوە گوایە سەتان خۆپێشاندەر هاتنە کوشتن لە ململانە لەگەڵ پۆلیس و تەناهی. بەڵام هەموو ئەندامانی ئەو هێزانە دەستیان نەبوو لە سەرکوتکردنەکە. هەر لە سەرەتای راپەڕیندا، دوو فڕۆکەوانی هێزی ئاسمانی، رەتیان کردەوە هاووڵاتیی مەدەنی بۆردمان بکەن، خۆیان گەیاندە مالْتا، لە هەمان کاتدا چەندان پێوەندیی دیپلۆماسی لە یو ئێن لە نیویۆرک لەگەڵ لیبیا پچڕا. لە ٢٢ی فێبروەری، قەزافی، کە لە ١٩٦٩ەوە لە دەسەڵاتە، وتارێکی دا و هەڕەشەی لە خۆپێشاندەران کرد بەسەرکوتکردنی دەسبەجێ. نارەزایی گەیشتبووە تەڕابلوس، لەوێ گەلێ تەقەیان لێ کرا. لە ٣ی ئادار، سەرۆک باراک ئۆباما داوای کرد قەزافی لاچێ. لە هەمان کاتدا، دادگەی نێودەوڵەتیی تاوان (ICG) رای گەیاند لێکۆڵینەوە لەگەڵ قەزافی دەکا بۆ تاوانەکانی لە دژی مرۆڤایەتی. شەڕێکی قورس لە زیوە راگەیەنرا، کە لە ٣٠ میل لە تەڕابلوسەوە دوورە. لە ٩ی ئادار، سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا دەیڤد کامیرۆن و ئۆباما رایان گەیاند کەوا خۆیان ئامادە دەکەن بۆ کردەیەکی سەربازی ئەگەر بێتو قەزافی نێتە خوارێ. لە ١٨ی ئادار، ئەنجوومەنی تەناهیی یو ئێن بڕیارێکی دەرکرد بۆ دانانی ناوچەی دژە فڕین لەسەر لیبیا و دەسەڵاتی بە ناتۆ دا گرتنەبەری

هەموو رێوشوێنێکی پێویست بۆ پاراستنی مەدەنییان، بەڵام سەربازی لەسەر زەوی کەم بوو. لە ١٩ی ئادار، یەکەم بۆردمانی ئاسمانی لەلایەن ئەمەریکا و هاوپەیمانە ئەوروپییەکانی بۆ سەر پێگەکانی لیبیا ئەنجام درا. لە ٤ی ئایار، ICG رای گەیاند قەزافی تاوانی شەڕی ئەنجام داوە و فەرمانی گرتنی راگەیاند. لە کۆتاییی جوون (حوزەیران)، یەکەتیی ئەفریقیا لە پریتۆریا کۆ بووەوە بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەیەکی ئاشتییانە بۆ ئەو چەقبەستنەی لیبیا، لە کاتێکدا عەمید چارلی بوچارد، فەرماندەی سەربازیی کەنەدی کە سەرۆکی کردە سەربازییەکانی ناتۆ بوو بۆ سەر لیبیا، زۆر متمانەی بەخۆ بوو بۆ ناچارکردنی قەزافی بۆ خۆبەدەستەوەدان.

فەرەنسا لەسەر ئاو و ئاگر بوو بۆ ئەنجامدانی کردەی سەربازی بۆ سەر قەزافی. ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی بە فەرمی چووبوونە ناو شەڕ لەگەڵ وڵاتێکی تری ئیسلامی. ئەمەریکا خێرا کردەکانی دایە دەست هێزەیلی ناتۆ، چونکە ئۆباما لە سەرەتای جەختکرنە سەر خۆکاندیدکردنەوەی بوو و ویستی خێرا ئەوە لەسەر خۆی لابەرێ کەوا وڵاتەکەی لە شەڕێکی تر تێوە گلاوە، هەروەها کۆنگرێس پاڵەپەستۆکەی سەری زیاتر کرد بەوەی کە دژی دەستوەردانەکەی بوو لە لیبیا. ئەو دەمانە، ئیسرائیل نیگەران بوو و دەیویست دڵنیا بێ لەوەی کە رژێمی دوای قەزافی دۆستی دەوڵەتی جوولەکە دەبێ. بەڵام پێچەوانەی هەموو راکان، قەزافی سەنگەری داکوتا، بوو بە درک لە بەردەم رەشەبای بەهاری عەرەبی.

ناڕەزایی لە یەمەن دەستی پێ کرد لە ٢٣ی جانیوەری. لە وەڵامدا، لە ٢ی فێبروەری، سەرۆک عەلی عەبدوڵڵا ساڵح، لە ١٩٩٠ەوە لەسەر تەختە، بە پەرلەمانی یەمەنی گوت کەوا جارێکی تر خۆی هەڵنابژێرێتەوە دوای ئەوەی ماوەکەی لە ٢٠١٣ بەکۆتا دێ. لە ٣ی فێبروەری، یەمەنییەکان پلانیان دانا بۆ "رۆژی تووڕەیی" بۆ دەربڕینی ناڕەزایی خۆیان بەرامبەر بە حوکمی رژێمەکە، ئەوە بوو نزیکەی ٢٠ هەزار کەس چوونە سەر شەقامەکانی

سەنعا. تەوەکول کەرمان، چالاکوانێکی بواری مافەیلی مرۆ و رۆژنامەنووس بووە کەسایەتێکی جیهانی چونکە بەهەزاران کەسی هان دا بۆ خۆپێشاندانەکان. لە ١٢ی فێبروەری، هەزارانی تر هاتنە ناو دۆخەکە، داوای چاکسازیی سیاسییان کرد. سەرۆک ساڵح، سەری سڕمابوو لە خێراییی رووداوەکان، هەروەها ئەمەریکاش هەمان دەردی هەبوو، کۆبوونەوەیەکی بەپەلەی کرد. لە ١٠ی ئادار، بۆ وەڵامی خۆپێشاندانی بەردەوام، ساڵح رای گەیاند کەوا دەستوورێکی نوێ دادەنێ. دواتر لە هەمان مانگ، خۆپێشاندان بۆ چاکسازی دەستی پێ کردەوە، دوای ئەوەی قەناسانی پۆلیس تەقەیان لە خۆپێشاندەرە ئاشتەوەرەکان کرد لە سەنعا، ژمارەیەکی زۆریان کوشت. کەسایەتیی باڵای سەربازی، جەنەراڵێکی گەورە، عەلی موحسین ئەحمار، پاڵپشتیی خۆی بۆ بزووتنەوەی نارەزاییەکان راگەیاند.

چەندان وەزیر و کەسایەتیی باڵای تری رێژیم لە دەسەڵات بوونەوە. لە مانگی ئاپریل (نیسان) رەوتی ناسەقامگیری و وەڵامی توندی حکوومەت بەردەوام بوو. سەرۆک ساڵح بەڵێنی دا بمێنێتەوە. لە ئادار، دەیانی تر مردن لە ئەنجامی پێکداادان لە نێوان سەربازان و شەڕوانانی هۆزەکان لە سەنعا. گوێی قیت بووبوو بەهۆی راپەڕینەکە، ئەمەریکا ترسا لە دەستی قاعیدە لە یەمەن. خێرا فڕۆکەخانەکان داخران لە کاتێکدا بە هەزاران لە شار هەڵاتن. لە جون (حوزەیران)، سەرۆک ساڵح بریندار بوو دوای ئەوەی تۆپێکیان لە کۆشکەکەی دا و خێرا بە فڕۆکە برایە سعوودیە. ئێستە سعوودیە بووەتە پەناگەیەکی سەرەکی بۆ ئەو دیکتاتۆرانە لەبن دەستی بەهاری عەرەبی رادەکەن، رێژیمی حوکمڕانی خودی سعوودیە دەستی هەیە و بەتوندی بزووتنەوەکە سەرکوت دەکا. هاوکات، ئەمەریکاش لە زۆر شت دەترسا، چونکە یەمەن هاوپەیمانێکی سەرەکییەتی، هەروەها پێگەیەکی سەربازیی گرینگە بۆ ئۆپەراسیۆنەکانی لە زەریای هیندی و ئەفریقیا.

لە ١٤ی فێبرووەری بەحرێنیش "ڕۆژی تووڕەیی"ی پێشان دا، کە لە ڕێگەی میدیای کۆمەڵایەتییەوە ڕێک خرا. زۆربەی خۆپێشاندەران شیعە بوون. ڕژێمی سونەی حوکمڕان خێرا سەرکۆنەی ڕاپەڕینەکەی کرد، گوتی ئەوەی وان جیاوازە لەوەی بەهاری عەرەبی، ڕاستییەکەی، ڕاپەڕینەکەی ئەوێ دەستی ئێرانی تێدا بوو. بەڵام لەتبوون و پرسی شیعە و سونە شتێکی دەستکرد بوو. ڕاپەڕینەکەی بەحرێن زیاتر لەسەر پرسی گەندەڵیی سیاسی بوو کە ڕەگی داکوتاوە لە وڵات. دوو خۆپێشاندەر لە مەنامە هاتنە کوشتن. بۆ بەرزڕاگرتنی مردنیان، لە ١٥ی فێبرووەری، بە هەزاران خۆپێشاندەر لە گۆڕەپانی پێرل کۆ بوونەوە، هەروەها پارتی سەرەکیی ئۆپۆزیسیۆن لە پەرلەمان کشایەوە وەک نارەزاییەک. لە ١٧ی فێبریوەری، هێرشێک بەیانی زوو گۆڕەپانی پێرلی پاک کردەوە لە هەزاران خۆپێشاندەر کە لەوێ کامپیان دابەستابوو، چوار کەس کوژران. پاشا، حەمەد بن عیسا خەلیفە، ماڵباتەکەی لەوەتەی ١٩٤٢ حوکمی بەحرێن دەکەن، چەند زیندانیێکی سیاسیی ئازاد کرد وەک ئامازەیەکی ئاشتەوایی، لە کاتێکدا فەرمانی کرد بەسەرکوتکردنێکی توندی خۆپێشاندانەکان. هاوکات، کەسایەتییەکی باڵا و ناوداری شیعە، حەسەن موشیەما، سکرتێری گشتیی بزووتنەوەی حەق، لە دەرەوە هاتەوە.

لە ١٤ی ئادار، سعوودیە و وڵاتانی تری ئەنجوومەنی هاریکاریی کەنداو (GCC) سەربازیان نارد تا یارمەتیی هێزەیلی تەناهیی بەحرێن بدەن لە سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکە. ڕۆژی دواتر یاسای عورفی لەلایەن حوکمڕان ڕاگەیەنرا، بەڵام خۆپێشاندان هەر بەردەوام بوو. خێرا دوای ئەوە، بەهۆی ترسی دووبارەبوونەوەی گۆڕەپانی تەحریری میسر، پێگەی سەرەکیی خۆپێشاندانەکان، واتە گۆڕەپانی پێرل، وێران کرا. لە ئاپریل، حکوومەت هەردوو پارتە سەرەکییە سیاسییەکەی قەدەغە کرد کە نوێنەرایەتیی زۆرینەی شیعە دەکەن. چوار خۆپێشاندەر سزای مردنیان بەسەردا سەپا.

له جون، هێـزێکی ئەمنیی زۆر له شـوێنەکـه مـانەوە، هاوکـات ژمـارەیەکی ئێجگار زۆر چالاکوان گیران، زۆربەیان ماوەی دوو سـاڵ حوکم دران. وەک مـاڵی پێگەی کـەشـتـیگەلی پێنجـەمی ئەمـەریکا، بەحـرێن شـوێنێکی ستراتیـجییە بۆ ئەمەریکا. هێزەیلی دەریایی ئەمـەریکا له کەنداوی فارس، دەریای سـوور، دەریای عـەرەبی و کـەنارەکـانی ئەفـریقـیـای رۆژهەڵات تەواو جێگیرە بۆ سەقامگیریی ئەو دوورگە بچووکە.

له ٥ی فێبروەری ٢٠١١، سووریيەکان، هاتنە سەر رێی میسرییەکان، "رۆژی تووڕەیی"یان راگەیاند، تویتەر و فەیسبوکیان بەکار هێنا. بەڵام، تەنیا چەند سەت کەسێک وێران بەشدار بن و گەلێکیشیـان گیران. ئێسـتە "رۆژی تووڕەیی" بووەتە دروشـمی سـەرەکیی بەهاری عـەرەبی، لەو رۆژەدا خـەڵک تووڕەیی و یاخیبوونی خۆیان بەرامبەر بەدەسـەڵات پێشـان دەدەن. له ئادار، خۆپێـشـاندانێکی گەورە له دیمەشق سـاز کرا، داوای ئازادکردنـی زیندانە سیاسییەکانی دەکرد، گەلێکی تریش گیران. له خۆپێشـاندانێکی هاوشێوەی ئەمـه له شاری دەرای باشـوور، هێزەیلی تەناهی خۆپێشـاندەرانیان کوشت، ئەمـه خـۆپێـشـاندانی زیاتری لێ کـەوتەوە. حکوومـەت چەند پێـوەرێکی ئاشتەواییی راگەیاند و هەندێ زیندانی سیاسیی ئازاد کرد، بەڵام بێهوودە بوو. سەرۆک ئەسەد خۆپێشاندەرانی تۆمەتبار کرد گوایە پیاوی ئیسرائیلن. له ١٢ی ئاپریل، چەند سـەربازێک هاتن کـوشتن گـوایە رەتیـان کـردووەتەوە تەقە له خۆپێشاندەران بکەن.

سـەرکـوتکردن بەهێـزتر بوو. له ١٦ی ئاپریل، ئەسـەد بەڵێنی دا یاسـای تەواوی هەڵگرێ. بەڵام گرتنی زیاتر، سەرکوتی زیاتر و کوشتار و برینداری زیاتری بەدوادا هـات. ئەمـەریکا رای گەیاند بەتـەمای سـەپاندنی گـەمارۆی زیاترە بەسـەر بەرپرسـانی سـووریا، له سـەرەتای ئادار یەکـەتیی ئەورووپا گـەمـارۆی زیاتری سـەپاند بەسـەر بەرپرسـانی سـووری له بەرامـبـەر سەرپێچییەکانیان بەرامبەر بە مافەیلی مرۆ. له ٢١ی ئاپریل، باری تەواری

لە وڵات هەڵگیرا، بەڵام ژمارەی قوربانییان گەیشتە سەتان. لە ئادار، دەبابەکانی سووریا گەیشتنە دەرا، بانیاس، حومس و دەوروبەری دیمەشق و هەوڵیان دا خۆپیشاندەران سەرکوت بکەن. لە ناوەڕاستی جون، بە هەزاران سووری هەڵاتن بۆ تورکیا لە ترسی کوشتن و چەوساندنەوە، ئەمە تەنگژەیەکی مرۆییی لەسەر سنووری تورکیا – سووریا دروست کرد. تورکیا تووڕە بوو و ئیدانەی سەرکوتکردنەوەی سووریای کرد. بەڵام سەرۆک بەشار ئەسەد کەللەڕەق بوو، سوپاکەشی کوشندە.

بۆیە لە نێوان جانیوەری و جونی ٢٠١١دا، تەنیا شەش مانگ، نەخشەی رۆهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقیای باکور لە رەگ و ڕیشەوە گۆڕا. لە مەغریبەوە بۆ ئێران، لە سووریاوە تا یەمەن، لەوسەری جیهانی عەرەب و موسڵمانانەوە بۆ ئەوسەری، خۆپێشاندانەکان خۆنەویستانە پەرت و بڵاو بوونەوە، وەک شەپۆلێک، هاوکات ئەنجامیشیان هەبوو.

گردبوونەوەی سەرەکیی ئۆپۆزیسیۆن لە مەغریب لە فێبروەری وای لە شا حەسەنی دووەم کرد، لە جون، بەڵێنی چاکسازیی دەستووری بدا. لە جەزائیر، خۆپێشاندانی هاوشێوە لە جانیوەری سەری هەڵدا لەسەر نرخی خۆراک و بێکاری. لە وەڵامدا، حکوومەت فەرمانی کرد بەدابەزاندنی نرخی خۆراک. لە فێبروەری لە عومان، خۆپێشاندەران داوای چاکسازیی کار و سیاسییان کرد. سوڵتان قەبوس یەکسەر وەڵامی دایەوە و بەڵێنی کار و سوودی زیاتری دا. لە سعوودیە، لە فێبروەری، شا عەبدوڵڵا زیادکردنی سەرفیاتی خۆشگوزەرانیی راگەیاند، بەڵام لە ئادار خۆپێشاندان قەدەغە کرا، دوای ئەوەی چەند گردبوونەوەیەکی بچووک رووی دا، کە زیاتر لە ناوچە شیعەنشینەکانی رۆهەڵات بوون. لەبەر تین و کاریگەریی شەپۆلی خۆپێشاندەران لە جیهانی عەرەبی، ئافرەتانی سعوودی هاتنە مەیدان و داوای چاکسازییان کرد، سووکایەتییان بە قەدەغەکردنی فەرمیی لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل کرد. لە ئادار، لە کوێت، بە سەتان گەنج خۆپێشاندانیان کرد بۆ

چاکسازیی سیاسی، داوای بەشداریی مانادارییان کرد لە کاروباری وڵاتیان. لە مەغریب، لە جون خەڵک دەنگیان دا لە ریفراندۆمێک بۆ دەستوورێک کە هەموار کرا بۆ چاککردنی حوکمی رەهای شا محەمەدی شەشەم.

هیچ وڵاتێکی عەرەبی لە بەهاری عەرەبی قوربانی نەبوو، هەرچەندە پێگە و چرپی شۆڕشەکان جیاواز بوون. لە ١٤ی فێبرەوەری، بە هەزاران دژە حکوومەت خۆپێشاندانیان لە تاران کرد، هاوکات بوو لەگەڵ بەهاری عەرەبی، بزووتنەوەی سەوزی خۆیان نوێ کردەوە. لە ناوەڕاستی جون، ژمارەی قوربانییان بەرز بووەوە، بەڵام لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاواز بوو. لە تونس گەیشتە سەتان، لە یەمەن زیاتر، لە میسر لەوەش زیاتر بوو. لە سووریا لە هەزار تێپەڕی کرد، لە لیبیا ژمارەی کوژراوان گەیشتە سەروو ١٠ هەزار.

هەریەک لەو دەوڵەتانەی پۆستکۆلۆنیال و کڵێشەی سیاسی گرینگییەکی خۆی هەیە لە بەهاری عەرەبی. لە بەحرێنی بچووکەوە بگرە تا میسری زەبەلاح، بە ملیۆنان کەس راپەڕین لە دژی ستەمی ناوخۆ و باڵادەستیی بیانی. هەستانی هەر یەکێک لەو وڵاتانە گرینگییەکی خۆی هەیە. گۆڕانەکان لە تونس تەحەدای هەوڵی یەکەتیی ئەوروپایان کرد بۆ باڵادەستبوونی لە دەریای ناوەڕاست. رووداوەکان لە میسر لە رەگ و ریشەوە کاریگەریی وڵاتە یەکگرتووەکانی کز کرد لە ناوچەکە. توندوتیژی لە لیبیا بووە تێستێک بۆ ناتۆ و یەکەتیی ئەوروپا تا دەسەڵاتی سەربازی و ماسولکەی دیپلۆماسییان تاقی بکەنەوە و کۆنترۆڵی تەواویان لە تەشتی دەریای ناوەڕاست بەدیار کەوت. گۆڕان بە هەر شێوەیەک بێ لە سووریا کار لە جیۆپۆلەتیکی ناوچەکە دەکا لەبەرئەوەی هاوپەیمانی ئێران و حزبوڵڵایە. هاوکات یەمەن ئاکامی خۆی دەبێ بۆ شانشینی سعوودیە تا ئەفریقیای باکور و رۆهەڵات و تا ئەودیو دوورگە. راپەڕینی دیموکراتی لە ئێران دەروازەیەکە بۆ ئاسیای ناوەڕاست. ئەگەر بێتو رژێمی ستەمکار لە کۆماری ئیسلامی برووخێ، راستەوخۆ کار لە پێگەی ئەفغانستان و پاکستان دەکا، پاشانیش

کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست. حوکمڕانی سەربازیی پاکستان ئێستە هەوڵ دەدا بازاڕی نوێ بدۆزێتەوە بۆ خزمەتگوزارییە سەربازییەکانی، بۆ ئەوان ئەو شانشینە بچووکەی کەنداوی فارس زۆر گونجاوە، وێڕای پێویستیی رکابەری نەک هەر تەنیا لەگەڵ کارگەیلی چەکی ئەمەریکا بگرە لەگەڵ کارگەیلی جلی وەکو ستافی بلاکوۆتەر لە تەواوی جیهاندا.

ئاکامەیلی هەرێمی و جیهانیی بەهاری عەرەبی هێشتا ماویەتی بگاتە لووتکە، هەرچەندە کاری خۆیشی کردووە. بۆیە هەڵەیە رێ بە بیرۆکەی بەهاری "عەرەبی" یان "موسڵمانان" بدرێ سەرنجەکان لە چوارچێوە گەورەکە دوور بخاتەوە. هەروەک ئاشکرایە لە ناسەقامگیریی یۆنان، ئیسپانیا و بەریتانیا، ناسەقامگیری هەر تەنیا لە جیهانی عەرەبی یان موسڵماناندا نییە. هەستی ناقایلبوون تەواو بەناخی دەریای ناوەڕاستدا رۆ چووە، هەر لە کۆچی کرێکارانەوە بگرە تا دەگاتە شکستی ئابووریی گەورە گەورە و پێوەری سەیر سەیر. لە سەنیگالەوە تا زیمبابۆی و جیبۆتی، ولاتانی ئەفریقیا هەمووی بەیەکسانی کاریگەریی ئەو راپەڕینانەیان لەسەرە، بەلام ئێستە لە خوار رادارەکەن، لەبەرئەوەی بەشێکن لە نەخشەی "جیهانی عەرەبی". هەرکە تێکەڵبوونی سەرەتای نێوان تونس و یەمەن بلاو بووەوە بۆ لیبیا و دواتر بۆ بەحرێن، یەمەن و سووریا، ئەوە ئاشکرا بوو کە ئەوە دیالێکتیکێکی تازەیە لە نێوان نیشتمانی و نێونەتەوەییدا. ئەگەر هێزەیلی دژە شۆڕش (لە ئەمەریکا، ئیسرائیل و سعوودیەوە بگرە تا دەگاتە حوکمڕانی وەک رێژیمی کۆماری ئیسلامی و حزبوڵلا) هەر دیمەنێکی نیشتمانیان بوێ، ئەوا دیمەنی نێونەتەوەیی بەرگەی ستەمیان دەگرێ و دەگاتە بیناقاقایان. لەسەرووی هەموویانەوە، یەکێ لەو نەخشانەی لەو ناوچانە پەیدا دەبێ، دەبێتە هۆی لەناوچوونی پۆلێنە کۆنەکانی "ئیسلام و رۆژئاوا". جیهان وا لێک دەترازێ و لێک دەبێتەوە، هاوکات لە راستیدا سەنتەر قەت وەها بەهێز نەبووە.

## داڕشتنەوەی نەخشەی جیهان

یەکێ لە چیرۆکە هەر جوانەکانی فەیلەسووفی سۆفیگەریی چاخی ناوەڕاست، شەهابەدین یەحیا سوهرەوەردی (١١٥٥-١١٩١) بەناوی "نامەی باڵندەیەک" باس لە چیرۆکی کۆمەڵە باڵندەیەک دەکا کەوتوونەتە ناو داوێکەوە. هەندێ لەو باڵندانە دەتوانن خۆیان دەرباز بکەن لە داوەکە، بەڵام کاتێ دەیانەوێ بفڕن، دەبینن هەندێ پەت هێشتا هەر بە باڵیانەوە ماوە، ناهێڵن بفڕن. ئەم خوازە ئەلیگۆرییە زۆر بەهێزە، یەکێکە لە کۆتاییە هەرە بەهێزەکانی سوهرەوەردی لە تەواوی ژیانیدا. بەڵام هاودژییەکە هێشتا هەر لە جەرگەی چیرۆکەکەدایە.

ئەو دەربڕینەی سوهرەوەردی بەکاری دێنێ بۆ داوەکە و ئەو شتانەی بەباڵندەکانەوە دەنووسێن و دواجار ناهێڵن بفڕن زۆر گرینگە. دوو وشە بەکار دێنێ "داهولها و باندها". باندها زۆر راستەوخۆیە: واتە کۆی "باند"، کە بە مانای داو یان چاڵ دێ. بەڵام داهۆڵ شتێکی تەواو جیاوازە، دوو شتی هاودژی تێدایە. داهولها شێوەی کۆی داهوڵە، واتە داهۆڵ: وێنەی مرۆڤێک لە دار و پوش و پەلاش یان پەڕۆ دروست دەکرێ بۆ ترساندنی چۆلەکە و تەیروتار تا دانەوێڵە نەخۆن. واتە ئاژەڵێکی ساختەیە و راوکەران دروستی دەکەن بۆ دانانەوەی داو بۆ ئەو باڵندانەی دەیانەوێ بیکوژن.

وشەی داهۆڵ هەم بەواتای داهۆڵ دێ، هەمیش بەواتای مەترسیدار دێ، ئەمەش دوو دیمەن دەهێنێتە بەرچاو. یەکێکیان مرۆڤە ئاژەڵ دەترسێنێ، ئەوی تریان ئاژەڵە دەیەوێ سەرنجی ئاژەڵی راستەقینە رابکێشێ. ئەمە بۆ ئێمە زۆر بەسوودە بۆ تێگەیشتن لەو راپەڕینە شۆڕشئاسایانەی ئاسیا و ئەفریقیا کە ئێمە ناویان لێ دەنێین بەهاری عەرەبی.

داهۆڵەکان لەم کەیسەدا بریتین لە زوڕناژەن (کە دەبێ زوو ئەمە روون بکەمەوە)، کە هێندە دەرناکەون بۆ لێشێواندنی خەڵک، چونکە خۆیان لێیان

شێواوە، کاریتەیەکیان هاوێشتووەتە چاویان، بۆیە ناتوانن ئەوەی راستە لە بەردەمیان ببینن. کاتێ میسرییەکان لە قاهیرە، سوورییەکان لە حەمە هاوار دەکەن: "گەل دەیەوێ دەسەلات برووخێ"، دەسەلات هەر مانای رژێم نییە، بگرە مانای دەسەلاتی مەعریفەش دەگەیەنێ، دەسەلاتی بەرهەمهێنان دەگەیەنێ لە نەبوونی پیلانگێری، لە بزنسدا واتە چەواشەکردنی واقیع بەهۆی دروستکردنی کلێشەی ماندوو و نادیار، ئەمەش رێگەیەکی مەعریفەیە بۆ گەیشتن بەبالادەستی، واتە "رۆژئاوا بەسەر رۆژهەلات بکەوێ،" رژێمی بالادەست بەسەر گەلێکی یاخیبوو.

گێلانەیە وابزانین هەر شۆرشێک، بەو قەوارەیەی ئێمە ئێستە لە ئاسیا و ئەفریقیا دەیبینین، وەک ئەو بالندانە بێ هەول دەدەن بفرن و دوور بکەونەوە لە دۆخەکە، بەبێ درککردنەوەی بەوەی کە دەبێ رژێم بەزۆر لاچێ، ئەوە دەبێ بال لێک دا و هەول بدەن دوور کەونەوە، جا بەهەر شێوەیەک بێ. هەر بزووتنەوەیەکی شۆرشگێری روون و ئاشکرایە هێزەیلی دژە شۆرش و هاوپەیمانی خۆی دەبێ (داهۆلەکان وا لە بالندە ئازایەکان دەکەن دوور کەونەوە). لە کاتێکدا شۆرشەکان هێشتا بەتەواوی نەکراونەتەوە چونکە خەلک ماون بەشدار بن، هێزەیلی دژە شۆرش کار بۆ بەرژەوەندیی خۆیان دەکەن، بمێننەوە و هاوپەیمانی نوێ دروست بکەن و وەک هەمیشە بزنسیان نەوەستێ.

دوو جۆرە داهۆلی زورناژەن هەیە لە کاتی کارکردندا بۆ هەلەگەیاندنی رووداوەکان بۆ موشتەرییەکانیان/لایەنگرانیان. با بەیەکێکیان بلێین شرۆڤەکار و بەوی تریان مێژوونووس. نموونەیەکی شرۆڤەکار بۆ بەهاری عەرەبی، ئەوانەی کە شتەکان بەبۆچوونی خۆیان دەسازێنن، وەک بێرنارد لویس کە ئێستە لەسەر بەهاری عەرەبی دەنووسێ:

"بێگومان گەلانی عەرەب گۆرانیان دەوێ. دەیانەوێ ژیانیان باشتر بێ.

بەڵام ئەگەر یەکێ بپرسێ ئاخۆ دیموکراسییان دەوێ، ئەمە... بیرۆکەیەکی سیاسییە کە هیچ مێژوویەکی نییە، هیچ تۆمارێکی لە جیهانی عەرەبی و موسڵمانانداندا نییە.... ئێمە، بەتایبەتی لە جیهانی رۆئاوادا، بە زاراوەی خۆمان بیر لە دیموکراسی دەکەینەوە... واتە هەڵبژاردن بەپێی ستایلی خۆمان. بەڵام بەڕای من هەڵەیەکی گەورەیە هەوڵ بدەین و بیر لە رۆهەڵاتی ناوەڕاست بکەینەوە بەو زاراوانە، چونکە ئەمە بەرەو ئەنجامی کارەساتئامێزمان دەبا، هەروەک ئێوە پێشتر لە چەندان شوێن ئەوەتان بینی. ئەوان دیارە کە ئامادە نین بۆ هەڵبژاردنی دادوەرانە و ئازادانە.... لە هەڵبژاردانی ئازاد و راستەقینەدا، (پارتەیلی موسڵمان) دیارە کە دەبنەوە و من پێم وایە ئەوە کارەساتە."

لێرەدا، بەلایەنی کەم، ئاسیاناسی روونە، هەروەها رەگەزپەرستی لەودیو رەوانبێژییە جیۆپۆلەتیکەکە شاراوە نییە. بەڵام شتی هاوبەشی نێوان ئاسیاناسیی کۆن و زورناژمنەکان ئەوەیە کە هیچیان هیوایان نییە، متمانەیان نییە بۆ هەر شتێکی، لە دوورەوەش بێ، دیموکراسی بۆ ئەم ناوچەیە.

ئەم جۆرە پێناوییەی دەسەڵات بۆ دەوڵەتێکی گەندەڵ و نابەجێی وەک کۆماری ئیسلامی، هەروەها زورنای کلێشەکانی ئاسیاناسیی کۆن لە جیاتیی ئیسرائیل، ئەوەی لە ئێران لە جونی ۲۰۰۹ رووی دا ئێستە بە گوللەیەک دەچن بە تاریکییەوە بنرێ بە بەراورد لەگەڵ ئەو سەدایانەی بۆ ئازادی هەیە لە ناوچەکەدا. مەرجەعێکی زۆر لەوە فراوانتر هەیە، ئەوەندە فراوانە کەوا شرۆڤەکارانی قوتابخانەی کۆنی ئاسیاناسی یان پسپۆڕانی نوێی بوارەکە توانای ئەوەیان نییە تێی بگەن یان خەیاڵی بکەن. بەڵام کاریگەری تێکەڵاویان ئامازەیە بە بەرهەمی مەعریفییان کە کار لەو شرۆڤەکارە ئەمەریکی و (ئەوروپییانە) دەکا کەوا هەوڵ دەدەن مانایەک بە بەهاری عەرەبی ببەخشن. خودی بەهاری عەرەبی، بە هاواری رۆژانەی

خەڵک "گەل دەیەوێ دەسەڵات بڕووخێ"، ئەم جۆرە قسە کۆنانە ڕەت دەکاتەوە و قسە نوێیەکانیش دەکاتە ڕەها.

درەنگ تێگەیشتنمان لە کرانەوەی ڕووداوەکان، لەگەڵ ئەوەشدا، سنووردار نییە بە شرۆڤەی گەندەڵی و تەنازولات. بەکورتی، نیگەرانیی هەڵەی کاریگەری بەهاری عەرەبی بۆ ئەوانەی کە چاوەڕێن بیانگاتێ فاکتەرێکی حاشاهەڵنەگرە، بەڵام لێکترازانێکیشە بۆ ئەو کۆششانەی دەیانەوێ ڕووداوەکان و شۆڕشەکان بگێڕنەوە. ڕۆژنامەنووسی ناوداری بەریتانی، ڕۆبەرت فیسک، بۆ نموونە، وا دەڵێ: لە ڕاستیدا، "واکاهاتنی عەرەبی" ئەمساڵ (٢٠١١) لە تونس دەستی پێ نەکرد، بگرە لە لبنان لە ٢٠٠٥ دەستی پێ کرد کاتێ، تووڕە بوون لە کوشتنی ڕەفیق حەریری سەرۆک وەزیران (باوکی سەعد)، بە سەتان هەزار لبنانی لە هەموو باوەڕەکان لە ناوەڕاستی بەیرووت کۆ بوونەوە داوای کێشانەوەی ٢٠ هەزار سەربازەکەی سووریایان کرد لە وڵات.

ئەمە قسەیەکە تژی لە خەوش. هاوپەیمانەکانی ١٤ی ئادار (شۆڕشی سیدار) و ٨ی ئادار (لە دژی ١٤ی ئادار پێک هێنرا) مانیفێستۆی نابەجێن بۆ سیاسەتی ڕەگداکوتاوی مەزهەبی لبنان، ئیتر بەمجۆرە لەبەر سیاسەتی بێهیوایی و لەت لەتبوونە کەوا بەهاری عەرەبی سەردەکەوێ. هەم واقیعی هەم واقیعبینانە هەڵەیە بەهاری عەرەبی کەم بکەیتەوە و بیهێنیتە ئاست هاوپەیمانی ١٤ی ئادار، ٨ی ئادار لە بەرچاو نەگری، هەروەها ئەو شۆڕشانە ببەستییەوە بەسیاسەتی مەزهەبی لە لبنان (دیارییەکی پاشماوەی کۆلۆنیالی فەرەنسییە، کە ئێستەش هەر دەبەخشێ). ئەگەر هەر چییەک بێ، بەهاری عەرەبی سیاسەتی مەزهەبی لە لبنان هەڵدەمژێ بۆ خەیاڵە ڕزگاریخوازەکەی، نەک سیاسەتی لەتلەتبووی لبنان کەوا بەهاری عەرەبی دێنێتە ئاستی خۆی.

بەلام تەنانەت لەودیو خەوشی شرۆڤەکاری، ئەم جۆرە مێژوونووسەی بواری کەمکردنەوە هەر تەواو بێ مانایە، بیرۆکەی کلاوی بابردوو هیچ مانایەک نابەخشێتە ئەو شتانەی وا لە بەرچاومان روو دەدەن و دەکرێنەوە. تەنانەت دووانەی ئەقلانی موسلمان - مەسیحی، سونی - شیعی، ینگ - یانگی ئێرانی - عەرەب پتەوتر دەکا، هەروەها نیگەرانیی هەڵەی کاریگەر لەخۆ دەگرێ. بۆ دەسکردن بەهەڵسەنگاندنی ئەو راپەڕینە شۆڕشئاسایانە، هەروەها کۆتاییش بەو قسانە بێنین، رەنگە پێویست بکا لە ١٤ی دیسێمبەری ٢٠٠٨ دەست پێ بکەین، ئەو دەمەی هیچ رووداوێکی سەرەکی لە ئارادا نەبوو بەلام دەستلەملانەیەکی تەن بەتەنی هاوولاتیی عێراقی و سەرۆکی ئەمەریکا بوو: لەو رۆژەدا، لە کاتی پرێس کۆنفرانسێکدا، رۆژنامەنووسی عێراقی مونتەزەر زەیدی هاواری کرد "ئەمە ماچێکی بێ خەوشە لە گەلی عێراقییەوە، تۆ سەگی" و دواتر پێلاوەکەی لە سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج دەبلیو بوش گرت.

قسە و کلێشەگەلی ئاسیاناسی پێشبینیکراو یەکسەر دەستیان پێ کرد و مانا و گرینگیی پێلاویان شی کردەوە لە کولتووری عەرەب و ئیسلامیدا، بەلام، وەک هەمیشە، ئەوانەی باسی ئەو پرسەیان دەکرد وەک سەگێک وا بوون لەسەر درەختێکی هەڵە بڕەوین: لەبەرئەوەی هەندێ جار پێلاو هەر/بەس پێلاوە، تاکە شت ئەوەیە ناڕازیت و دەیهاوێژی. پێم وایە ئەو نموونەی کاتێ مونتەزەر زەیدی پێلاوی لە سەرۆک بوش گرت ساتێکی تەقینەوەیەکی بەهێز بوو، زیاتر باسی ئەوە کرا کەوا چۆن سەرۆک بوش توانی خۆی لەو پێلاوە لابدا و هیچ زیانی پێ نەگا، تەنانەت توانی زاڵ بێ بەسەر پێکەنینە پەستەکەی. ئاماژەی راستەقینەی سیمبولی ئەوەیە کاتێ هیچ شتێ روو نادا، ئەو کاتەی کارێکی وەها هیچ ئەرکێکی نییە.

بەهێزیی ئەو ساتە لە وردیدا ئەرستۆئاسا بوو، ئەو ساتەیە کاتێ ئەرستۆ لە کتێبەکەی بەناوی "سیاسەت" باسی بیردۆزی کاریگەریی ئەدەبی کارێک

دەکا چ لەسەر کارەکتەرەکانی تراجیدییەک یان لەسەر جەماوەر، یان کاریگەریی لەسەر هەردووکیان، بۆیە وزە یەکسان دەکاتەوە و جیهان دەگەڕێتەوە سەر بارە هاوسەنگەکەی. تەواو بەزاراوەی ئەرستۆیی، مونتەزەر زەیدی پێڵاوهاوێژ بەپێی ئەو بیردۆزە پشتی بەستا بە ڕووداوەکە بۆ ئەوەی ئیمپراتۆر بتاسێنێ و بیهێنێتەوە ناو ژینگەکە تا ڕووبەڕووی بابەتەکانی بێتەوە. بیرکەگەل لە شەڕانگێزیی پتەوی فرۆید و ئەرستۆوە یەک دەگرنەوە بۆ بەخشینی مانا بەبۆنەیەکی وەها کاتێ مونتەزەر زەیدی بەئاشکرا رای گەیاند کەوا پانتۆڵی ئیمپراتۆر هاتووەتە خوارێ و بۆیە ئێمەی ڕەوانەی گۆڕەپانی تەحریر کرد.

## راپەڕینەکان بەرامبەر ئیمپراتۆر یان بەرامبەر ئیمپریالیزم؟

نە تەندروستی، نە خزمایەتی، نە ڕەتکردنەوەی ڕەگەزپەرستانەی راپەڕینەکانی عەرەب و ئێران، نە دوای کڵاوی بابردوو دوای ڕۆژی دەسپێک و ڕۆژێکی تر، هیچیان ناتوانن شێرازەی ئەو شتە تێک بدەن ئێستە ڕوو دەدا. خزمایەتی هیچ شرۆڤە نییە، هەروەها نیگەرانیی کاریگەریش ناتوانێ ناخ و ڕۆحی ئەو ڕووداوانە پێشان بدا. ئاماژەیەکی شکۆداری ئەو میسرییانە بوو لە گۆڕەپانی تەحریر کە شتێکیان هەڵگرتبوو ئاڵای تونسی پێوە بوو و دەیانگوت: "ئێوە یەکەم کەسن، ئێمەش بەدواتاندا دێین." مەتەڵی جیگسۆ لێرەدا جێی دەبێتەوە.

با واز لە پرسی شرۆڤەکار و مێژوونووس بێنین، ئەوانەی بەهاری عەرەبی کەم دەکەنەوە بۆ شتێکی وەها نابەجێ، هەروەها ئەوانەشی کە سوورن لەسەر چواندنی بەهاری عەرەبی بەڕووداوی مێژوویی پێشوو، بۆیان نالوێ، ئەو پرسیارەی دەمێنێتەوە ئەوەیە: ئەمە چییە ئێمە دەیبینین و لە بەرچاومان شێوە وەردەگرێ؟ لە کام چوارچێوە ئێمە دەتوانین مانایەکی پێ ببەخشین؟ وێ دەچێ هەمان دیالۆگی نێوان هاملێت و پۆلۆنیەسمان هەبێ:

هاملێت: ئەو هەورە دوورانە دەبینی شێوەیان زیاتر لە وشترێک دەکا؟

پۆلۆنیەس: بێگومان، راستییەکەی هەر دەڵێی وشترە.

هاملێت: من پێم وایە بە راسۆ بچێ.

پۆلۆنیەس: لە پشتەوەڕا بە راسۆ دەچێ.

هاملێت: یان بە نەهەنگێک دەچێ.

پۆلۆنیەس: بەڵێ زۆر لە نەهەنگ دەچێ.

کەواتە کامیانە، نەهەنگ یان وشتر، یان لەوانەیە راسۆ بێ؟ ئێمە چۆن رووداوەکانی "جیهانی عەرەبی و موسڵمانان" دەخوێنینەوە تەواو وەک ئەوەیە چۆن دەیانبینین و بەپێی ئەم بیرۆکەیە شوێنیان بۆ دەکەینەوە، لەگەڵ ئەوەشدا رێیان پێ دەدەین بچنە ناو جیهان و دواتر لە خاڵێکی تر یەک بگرنەوە، جیهانێکی فراوانتر، ئازادتر، کراوەتر، جیهانێک ناتوانین ناوێکی لێ بنێین. بۆ بینینی ئەو جیهانەی وا دروست دەبێ، ئەو جیهانەی ئەو رووداوانە رای دەگەین و بەڵێنی دەدەن، ئێمە دەبێت دەست بکەین بە تێگەیشتن لەو شوێنانەی لەودیو دووانەییی هەڵەی "ئیسلام و رۆئاوا"یە. ئەو دووانەیە، ئەو ململانەیە زیاتر لە شێوەی دووانەی "رۆئاوا و ئەوانی تر" دەکا، ئەمە بەهێزترین ناماقووڵیی نەخشە جیاجیاکانی جیهانە لە ماوەی دووسەت ساڵی رابردوودا. تەواو ئەو نەخشە ئیمپریالانەیە (کۆدەکەی رۆئاوایە) کەوا بەهاری عەرەبی ئێستە دەیگۆڕێ، دایدەڕێژێتەوە و پێشکێشی دەکاتەوە.

ئەگەر ئێمە ئەفسەرانی پروپاگەندەی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا بێنین، وەک فرانکسی فوکویاما (کۆتاییی مێژوو) و ساموێل هەنتیگتن (ململانەی شارستانییەتەکان)، لە دەرەوەی وێنەکە بەجێ بێڵین، چونکە ئێستە پێگەیان تەواو روون بووەتەوە، ئەوا دەبێتە قارەمانانەترین هەوڵ بۆ بەخشینی مانایەک بە جیهانەکەمان لە ماوەی دەیەی رابردوو، ئەوەیە بیرۆکە پێکەوەییەکانی مایکل هاردت و ئەنتۆنیە نیجیر لە کتێبەکەیان بەناوی

ئیمپراتۆر (٢٠٠٠)، دواتر بوو بە مەڵتیتیود (٢٠٠٤) و کۆمۆنوێڵس (٢٠٠٩). ئەوان دەڵێن گوایە سەرمایەی بەجیهانیکراو و تۆڕی گەورەی زانیاریی تەکنەلۆجی و بیرۆکراسییەتی سیاسی و پارە شیمانەی بوونی کۆنترۆڵی یەک ئیمپراتۆری نەهێشتووە لە هەر سەنتەرێکی دنیادا بێ. ئەوان دەڵێن ئێمە لە سەردەمی ئیمپریالیزم دەرچووینە و چووینەتە ناو سەردەمی ئیمپراتۆری، باس لە تۆڕێکی گشتگیری بالادەستی دەکەن، نەک هەڕەمەکی. ئەوەی ئەمڕۆ جیهانی ئێمە پێناسە دەکا پێوەندییە هەڕەمییەکانی دەسەڵات نییە بگرە تۆڕێکی ئاڵۆزی بالادەستییە، سوود لە ڕێژیمی حوکمڕان وەردەگرن و تەواوی جیهان کپ دەکەن. کەواتە ئیمپراتۆر تۆڕێکە، نەک هەڕەمێکی بالادەستی. ئیمپراتۆری "ئامێرێکی لادەر و خراپترکردنی حوکمڕانییە کە پێدا پێدا سنوورەکانی فراوان دەبێ و هەموو دنیا قووت دەدا." ئەوان دووپاتی دەکەنەوە کەوا سەردەمی نەتەوە – وڵات بەسەرچوو، تەنانەت وڵاتە یەکگرتووەکانیش دەتوانێ ڕۆڵی پرۆژەیەکی ئیمپریالیستی سەرەکی بگێڕێ. بیرۆکەی نەتەوە – وڵات ئێستە بووەتە نۆستالجیا، هەر بەتەواوی بێ سوودە.

ئەمە بەرێگەیەکی سەرنج ڕاکێش و روون دەچێ لەپێشمانە بۆ سەیرکردنی جیهانەکەمان، بەڵام کاتێ لە نزیکەوە تەماشای دەکەین وێ دەچێ هاردت و نیجر بەئاسانی خەیاڵی جیهانگیریی "جیهانی رۆئاوا"یان کردبێ کەوا نەتەوە – وڵاتی پۆستکۆلۆنیال و شێوازی ئەوروپی دەکەنە رەوتی رەها، هەر لەسەر ئەوانەش ئێمە بەڕێوە دەبرێین. ئەوان بۆچوونێکی جیاواز لە رەگ و ریشەوەیان نییە لەسەر جیهان، ئەوە نەبێ پرۆژەیەکی رادیکاڵیان پێیە سەبارەت بە کاروباری هەنووکەی دەوڵەت: بەلای ئەوان "جیهانی رۆئاوا" و هەموو سنوورەکانی بەردەمیان هەڵگیراوە لەبەرئەوەی زۆر بالادەستن. "پێکهێنانی ئیمپراتۆر هەنگاوێکە بەرەوپێشی تا دەرباز بین لە نۆستالجیای پێکهاتەیلی دەسەڵات و رەتی هەر ستراتیجێکی سیاسی دەکاتەوە کە باس

له گەڕانەوەی سیستەمە کۆنەکە دەکا، وەک هەوڵدان بۆ زیندووکردنەوەی نەتەوە – وڵات بۆ پاراستنی لە دژی سەرمایەی جیهانی. هەرچەندە لە رووی سیاسییەوە تەواو جیاوازن لە فۆکویاما و هەتینگتن، هاردت و نیجر زۆر بەپەرۆشەوە باوەڕیان بەسەرکەوتنی رۆژئاوایە، هەرچەندە پێیان وایە ئێستە سەرکەوتووە و خۆیشی شەکەت کردووە، هەروەها پێی ناوەتە قۆناخێکی رەهای بالادەستی، واتە جیهانگیریی مەنتیقی خۆیشی. لە کاتێکدا ئەوروپیچییتییان هەر وەک خۆی ماوەتەوە، حوکمی ئەوە دەکەن گوایە رەوتی ئەو بالادەستییەی کە رۆژئاوا هەیەتی چووەتە ناو قۆناخێکی نوێی حوکمڕانییەوە.

لە خوێندنەوەی هاردت و نیجر بۆ ئیمپراتۆری، هەر تەنیا نەتەوە – وڵات نییە باوی نەماوە، بگرە لۆکالیزمیشە. لۆکالیزم بەدەر نییە لە جیهانگیری، بگرە پێوەستە پێوەی، هەر بەردەوامیش دەبن. ئێمە پێویستمان بە دژە جیهانگیری هەیە، لە کاتێکدا پەسندکردنی بەگەردوونیبوونی "جیهانی رۆژئاوا" و گەڕان بەدوای رێگەیەکی بەرگەگرتن کە ئاشنایە بەو جیهانە بالادەستە. ئیمپراتۆری ئێستە بە گشتی لۆجیکی بالادەستیی ئابوورییە، ئاژانسێکی تایبەتی نییە. هاردت و نیجر زۆر دووپاتی دەکەنەوە کەوا نەتەوە – وڵات وا ون دەبێ، هەروەها رەوتی رەهای بالادەستی سەرهەڵدەدا. بەڵام وێ دەچێ راستیی بنەڕەتییان وەلا نابێ کەوا نەتەوە – وڵات هەرگیز ژێردەستەی سەرمایە نەبووە. ئەگەر بەلای وڵاتانی نیشتمانی ئابووریی ئەوروپی، لە سەردەمی ئادەم سمیس و کتێبەکەی بەناوی "سامانی نەتەوەکان" (١٧٧٦) بەولاوە، بیرۆکەی "نەتەوە" تەنیا میکانیزمێک بێ بۆ ناو کتێبان، ئەوا لە جیهانی کۆلۆنیالدا نەتەوە میتۆدێکی جووڵاندن و بەرگەگرتن بووە لە دژی سەرمایەی جیهانگیری. هەر ئەمەیە کەوا هاردت و نیجر پێیان وایە کە پێشکەوتنێکی نوێیە، واتە تۆڕێکی بالادەستی نەک یەک دەسەڵات و یەک ئیمپراتۆر، بۆیە نەتەوە هەر لە رۆژی یەکەمەوە دیلی سەرمایە بووە.

لەگەڵ ئەوەشدا، هاردت و نیجر فەشەل دێنن لە دانپێنان بەوەی کەوا رەوتی بەرگری دەبێ هەر نیشتمانی و هەرێمی بێ، لە کاتێکدا لۆجیکی سەرمایەداری بۆ بالادەستیی جیهانی هەردەم نێونەتەوەیی بووە. تۆ شەڕی بالادەستی بە بەرگری ناکەی، بگرە شەڕەکە لەگەڵ پێگەی بەهێزی بەرگرییەکەیە. بەڵام پێویستییەک هەیە بۆ لەناوبردنی بەگەردوونیبوونی رۆئاوا (وەک بڵێی خوا لە ئاسمانەکانەوە نەخشەی جیهانی بەو شێوەیە داڕشتبێ) و دەبێ چیی تر تێکەڵ نەکرێ لەگەڵ ئەو جیهانەی کە لە بەردەم بالادەستیی ئیمپریالی وەستاوەتەوە.

بە پێچەوانەی ئیمپریالیزم، هاردت و نیجر دەڵێن، ئیمپراتۆر هیچ سەنتەرێکی دەسەلاتی نییە و پشت بەسنوور یان بەربەستەکان نابەستێ. ئیمپراتۆری ئامێرێکی لادەری حوکمڕانەکانە و پێدا پێدا فراوان دەبێ و هەموو جیهان قووت دەدا. بەڵام راستییەکەی ئەوەیە ئەمە هەردەم هەر وا بووە هەم لەناو سەرمایەداری و هەمیش لەناو ئیمپریالیزمدا. بیرۆکەی سەنتەرێکی گەورە و چڕ بۆ کاری سەرمایەداری یان ئیمپریالزم (کۆدەکەی رۆئاوایە) هەردەم خەیاڵێک بووە. کارێکی باشە لەو خەیاڵە چاک بێینە دەرەوە، بەڵام مانای هاتن نییە بۆ ناو قۆناخێکی نوێی سەرمایەداری یان ئیمپریالیزمی. هەر کرێکارێک (میوان یان نایاسایی) لە ئاسیا، ئەفریقیا، یان ئەمەریکای لاتین شایەتی دەدا کەوا سنوورە نیشتمانییەکان هیچ مانایەکیان نییە کاتێ بەدوای نانی رۆژانەیان دەکەون. سەرمایە هەرگیز سەنتەرێکی نەبووە. ئیمپریالیزم، کە بیرمەندانی وەک ماکس وێبەر و شومپیتەر درکیان پێی کردووە، تا سەر ئێسک سەرمایەدارییە، چەوساندنەوەی کرێکار لەلایەن سەرمایەدار لە نەخشەی جیهانی گەلێ زۆر بووە. ئەم کارەی سەرمایەدار سەنتەرێکی وەهمیی دروست کردووە، تا خۆی لەناو بالادەستیی شارستانیدا بنوێنێ، بۆیە دواجار دەبینین بیرۆکەی ئەورووپینیزم هاتە ئاسایی ناساندن، کە پێشکەوتنێکی پۆزەتیڤە. بەڵام کاتێ لە

سۆنگەی کاری کۆلۆنیالەوە تەماشای دەکەین، سەرمایەداری لە سەرەتادا جیهانی بوو، هەر بۆیە پرسیاری ئەوەی بۆچی "لێرە" پێشکەوت نەک "لەوێ" بەراستی کارێکە بەرهەمدار، لەبەرئەوەی هەر لە سەرەتاوە سەرمایەداری جیهانی بووە و رووداوێکی جیهانیش بووە و قەیدی نەبوو ئەگەر بێتو لە ئاکامی ئەخلاقیاتی پرۆتێستانت یان شۆڕشی پیشەسازی لە ئەورووپا رووی دابا، یان لە ئەفریقیا، ئاسیا، یان ئەمەریکای لاتین، یاخۆ بەبۆچوونێکی جیهانی بودی، هیندو یان ئیسلامی. وەک فانون دەڵێ، ئەورووپا داهێنەری جیهانی سێیەمە و هەرواش دەمێنێتەوە، مەبەستی لە جیهانی سێیەم واتە جیهانی داگیرکراو، هەر واش دەبێ لەژێر کارەکانی سەرمایەدار، کە هەردەم لە ناوەوەڕا کار دەکا بۆ قایمکردنی بالادەستیی خۆی. سەرمایەداری هەرگیز سەنتەرێکی نەبووە، بۆیە سنووریشی نییە.

ئیمپریالیزم قەت بەبێ تۆڕێکی داوودەزگەی مادی و پێوەری کاری نەکردووە کەوا ئاسانکاری دەکەن بۆ شاردنەوەی دڕندایەتییەکەی، لەبەرئەوەی سەرمایەدار بەتوندی سنووورە نیشتمانییەکانی بڕیوە و بەدوای کەرەستەی خاو کەوتووە، بەدوای کرێکاری هەرزان، بازاڕەکان، هەر بۆیە کرێکاری هەرزان بە قاچاخ هاتووەتە ناو سەنتەرەکانی سەرمایە. ئەوەی هاردت و نیجر لە ئەکادیمیادا دۆزییانەوە، هێزی دڕندانەی سەرمایە و کاریگەریی نابەجێی کرێکار، لە راستیدا دەمێکە زانراوە و ئەزموون کراوە.

هاردت و نیجر دەڵێن: بەڵام شیمانەی سەرەتاییی ئێمە ئەوەیە کەوا ئیمپراتۆرییەکی نوێ سەروەرییەک دروست دەکا، پێچەوانەی هەردوو بۆچوون دەبێتەوە (بۆچوونی لاگیری و وەستانەوە لە دژی حوکمەکانی ئەمەریکا لە دنیا). وڵاتە یەکگرتووەکان هیچ سەنتەرێک بۆ پرۆژەی ئیمپریالیستی دروست ناکا، راستییەکەش ئەوەیە هیچ نەتەوە - وڵاتێک ناتوانێ ئەمڕۆ ئەم کارە بکا. ئیمپریالیزم بەسەر چوو. هیچ نەتەوەیەک نابێتە سەرۆکی جیهان بەو شێوازەی کاتی خۆی وڵاتە ئەورووپییەکان وا بوون.

هەر ئەو بۆچوونە وردەی سەنتەربوونی ئیمپراتۆرییە، کە هەرگیز بوونی نەبووە، ئێستە باسی لێوە دەکرێ. نە وڵاتە یەکگرتووەکان و نە هیچ نەتەوەیەکی تر هەرگیز ئەو پێگەیەی نەبووە. هەر لەبەر ئەو هۆیەشە کەوا هەردەم راپەڕین هەبووە لە دژی ئیمپریالیزم. ئەو بۆچوونەی گوایە سەرمایەداریی جیهان سەنتەر و سنووری هەیە هەردەم وەهمێکی بەهێز بووە کە یارمەتیی یەک دەسەڵاتی داوە و کۆدەکەی "رۆژئاوا"یە، ئەوانی تری جیهانیش هەمووی خراونەتە پەراوێز، ئەمەش بەرهەمێکی ئایدیۆلۆجیی باڵادەستیی سپییەکانە کە ناوی لێ نراوە ئەرکی شارستانیبوون. ئەم بەرهەمە تا ماوەیەک باوەڕی پێ دەکرا، ئێستە دواجار لە کارەکانی هاردت و نیجر بەرەنگاری دەکرێتەوە. بەڵام ئەم دانپیانانە درەنگە جیاوازییەکی کەم دروست دەکا لەو رێگەیەی کەوا کاری مادیی سەرمایەداری لە جیهاندا بەربڵاوە (بڕینی سنوورە نیشتمانییەکان بەتوندی بۆ دزینی کەرەستەی خاو، مسۆگەرکردنی کرێکاری هەرزان و فراوانکردنی بازاڕ)، نەک لەبەر ئەو راستییەی کەوا جیهانەکانی تر لە دەوری ئەو سەنتەرە وەهمییە هەردەم خۆیان لە بیر بووە و بە دڵ کاریان کردووە لەو گەردوونە جیاوازانەی خۆیان.

بیرۆکەی ئیمپراتۆریی هاردت و نیجر لە بنەڕەتدا هەر بەسەنتەرێکی ئەورووپی دەمێنێتەوە، تەنانەت ئەورووپیچییەکانیش دەڵێن رۆژئاوا سەرکەوتنی بەسەر ئەوانی تردا هێناوە، هیچ ئیختیارێکیان نییە جگە لە داننان بەو سەرکەوتنە، هەروەها دەگەڕێتەوە بەدوای شێوازی تر بۆ بەرگەگرتنیان لە ناوخۆی خۆیان. وێڕای ئەو ئەورووپیچییەتە، تیۆلۆجیی قووڵی مەسیحییەت هەیە کەوا باس لە بەرگەگرتنی سیاسی دەکا. هەر لە سەرەتای نووسینی "ئیمپراتۆر-٢٠٠٠"، دووانەییی هاردت و نیجەر پێشنیازی ئەوە دەکەن لە رێگەی جیاکردنەوەی نێوانی ئیمپراتۆر و ئیمپریالیزم توانییان ئاماژە بە مەسیحییەتبوونی خەیاڵی ئیمپراتۆری بکەن، لەبەرئەوەی زاراوەکان هەر لە سەرەتدا مەسیحی بوون لە تیۆلۆجیی پۆستمۆدێرن کەوا ئەوان دایانهێنا.

جیاوازیی هاردت و نیجر بۆ ئیمپراتۆر، کە بۆ ئەوان دووسەرەیە، ناوەڕۆک و گرینگە و لە ئیمپریالیزمەوە هاتووە کەوا دووسەرەیە، ناوەڕۆکدارە و گرینگە، هەروەها سنوورەکانیشی جێگیرە، کە بە روونی مەیسحییەت پێشان دەدا. بەڵام تا کاتی دەرکەوتنی کۆمۆنوێڵس (٢٠٠٩) کەوا هەردوو بیرۆکەکەی خۆشەویست و شیعر تەواو روونی دەکەنەوە کەوا ئێمە پێویستمان بە بیرمەندانی مەسیحییە. نابەجێیی سەرەکیی ئەو جۆرە بیرۆکانە، کە ئێمە فێریان بووبووین چۆن بیانبینین و بیانچوێنین بەلایەنی کەم لەوەتەی پەیدابوونی سۆشیۆلۆجیی ئاینی ماکس وێبەر، ئێستە بووە چوارچێوەی بیرمەندانی مەسیحی کە جارێکی تر هەوڵ دەدەن جیهان بکەن بە مەسیحی لە بەرگی عەلمانیەتدا، ئەمەش داگیرکارییەکی مەسیحییەتە بۆ رەخنە و بۆچوونەکانمان. بێگومان هیچ گرفتێک لەگەڵ هەردوو مارکسییە مەسیحییەکە نییە کە جیهان لە رێگەی دووربینی مەسیحییەتەوە دەبینن. بەڵام گرفتەکە ئەوەیە ئەو دیدە چۆن دەسازێ بۆ جیهانێکی غەیرە مەسیحی لەژێر باڵی بەزەییی مژدەدەردانی کۆلۆنیالی مەسیحی لەبەرئەوەی مشتومڕەکان لە نێوان بارتۆلۆمی دو لاس کاس (١٤٨٤-١٥٦٦) و خوان گینیسی دو سوپەلڤا (١٤٨٩-١٥٧٣)، یەکێکیان دژی دەوەستێتەوە و ئەوی تریان پاڵپشتیی کۆلۆنیالیزمی ئیسپانی دەکا بە زاراوەی مەسیحییەت.

رووداوەکانی ٩/١١ لە ئەمەریکا و هەردوو داگیرکاریی ئیمپریالیستانەی دوو وڵاتی سەروەری موسڵمانان لەلایەن ئەمەریکا، ئاماژەن بە مانیفیستۆی پرۆژەی سەدەی نوێی ئەمەریکا، کە بەرەنگاری تیۆری کۆتاییی ئیمپریالیزم و سەرهەڵدانی ئیمپراتۆریەت دەکات. داگیرکردنی ئەفغانستان و عێراق ناوچەیی و سنووربڕ بوو، ئەمە شێوازێکی زۆر کۆنی ئیمپریالیزمە. هێندەی نەبرد بینیمان ئیسرائیل لبنانی داگیر کرد لە ٢٠٠٦ و غەزەی لە ٢٠٠٨ و ٢٠٠٩ گرتەوە، کە دوو کاری ئیمپریالیستانەی بچووکی ئیسرائیلە بە هاوکاریی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا. ئەمە خراپ شکایەوە و وای لە حزبوڵڵا و

حەماس کرد پێوەندی بکەن بە سوپای مەهدی، کە لە پێشتر زۆر بەهێزترن، پێوەندی بکەن بە سووریا و کۆماری ئیسلامی کە پێکەوە هاتن شەڕێکیان کرد لە دژی ئەمەریکا/ئیسرائیل و هاوپەیمانە ئەورووپی و ناوچەییەکەیان. هەموو ئەمانە ناوچەیی و سنووربڕ بوون، بە بەرنامەی نیشتمانی و نیوچە نیشتمانی کە ڕووبەڕووی ئیمپراتۆریەتی ئەمەریکا و هاوپەیمانی ئەورووپی و ناوچەییەکەیان بوونەوە.

ئێمە دەبێ جیهانی فرە بناسینەوە و لێی بکشێینەوە کەوا ڕۆژئاوا حەشاری داوە. ئیمپریالیزم هەردەم ئیمپراتۆرێک بووە، واتە ئیمپریالیستێکی ئیمپراتۆری، ئەگەر بێتو درک بەوە بکەین کە ئەو سەرمایەدارییە قەت سەنتەرێکی نەبووە، هەروەها بەرهەمی شارستانییەتی سنوورەکان میکانیزمێکی وەهمی بووە بۆ پاڵپشتیکردنی یەک بالادەستی و پێشکەوتنێکی تاکلایەنە، ئەوا زیاتر لە پرسەکان تێ دەگەین. سەرهەڵدانی بەهاری عەرەبی ڕێی تێ دەچێ و زۆریش ئاساییە ڕێ لە بەتیۆریکردنی ڕۆژئاوا بگرێ تا نەبێتە ئیمپراتۆریەتێکی جیهانی، هەروەها شیمانەی ئەوەش هەیە کەوا وەهمەکان بکەونە ناو داوی جیهانێک کە ئێمە هەوڵی چاککردنی دەدەین.

بێگومان هاردت و نیجەر باش ئاگەدارن، ڕاستییەکەی دەشارنەوە، لە ئەورووپیچییاتی دیدگەیان بۆ جیهانێکی نوێ، بەڵام ئەو باسەی ئەوان دەیکەین لەوە زیاتر ئاشکرا دەکا:

> ئەو جینۆلۆجییەی ئێمە بەدواوەین لە شرۆڤەکانمان لە ئیمپریالیزمەوە بۆ ئیمپراتۆریەت یەکەمیان ئەورووپی و پاشانیش ئەورووپی - ئەمەریکی دەبێ، نەک لەبەرئەوەی ئێمە باوەڕمان بەو ناوچانە هەیە یان بە سەرچاوەی تەواوی بیرۆکەی نوێ و داهێنانی مێژوویی، بگرە لەبەرئەوەیە کەوا ئەم ڕێگەیە بۆ

باڵادەستیی جوگرافیی هاوتەریبە لەگەڵ ئەو بیرۆکە و کارانەی کە ئێمە ئەمڕۆ لە ئیمپراتۆریەتدا دەیبینین و هەنگاوێک دەچنە پێشەوە، هەروەکو باسمان کردووە، ئەمە هاوتایە لەگەڵ پێشکەوتنی رەوتی سەرمایەدارانەی بەرهەم. لە کاتێکدا جینۆلۆجیی ئیمپراتۆریەت لە ناوجەرگەی ئەورووپیزمدایە، بەڵام بوونی دەسەڵاتەکانی بۆ هیچ هەرێمێک سنووردار نییە. لۆجیکەیلی حوکم، کە لە هەندێ رووەوە سەرچاوەیان گرتووە لە ئەورووپا و ئەمەریکا، ئێستە بوونەتە هۆی باڵادەستی لە سەرانسەری جیهاندا. لەوەش گرینگتر، ئەو هێزانەی کە رکابەری لەگەڵ ئیمپراتۆر دەکەن و کاریگەرن ئەوانیش سنووریان نییە بۆ هیچ ناوچەیەکی جیۆپۆلەتیکال. جوگرافیای ئەو دەسەڵاتە جێگرەوانە، واتە کارتۆگرافیای نوێ، هەر بەرێوەیە بێتە نووسین، یان لە راستیدا ئەمڕۆ لە رێگەی بەرگەگرتنەوە، خەباتکردن و ئارەزووەکانی فرەبوون دێتە نووسین.

ئەم بۆچوونەی جوگرافیای جیهانی درێژە دەدا بەجیاکردنەوەی پێگەی کۆلۆنیال لە سەنتەربوونی سەرمایەداری و ئەو سۆنگەیەکی جیهانیی پێ دەبینن. مەرجی کۆلۆنیالیتی، کە یەکڕێیە لەگەڵ کاری سەرمایەداری، شوێنێکی نییە لەناو سەرمایەداری یان لەناو ئیمپراتۆریەتدا. لەبەرئەوەی غەیرە رۆئاوا لە راداریاندا نییە، ئەوان دەڵێن: "لە سەردەمی گەیاندنی ئێمەدا، هەموو شتێک لە خەباتەکاندا دەکرێ، گفتوگۆ و گەیاندن نەبێ." گۆڕەپانی تیاننمێن، چیاپاس، لۆس ئەنجلۆس، فرەنسا، راپەڕین و کۆریای باشوور لەو جۆرە خەباتانەن کە نەک تەنیا پێوەندییان بە یەکترەوە نییە، بگرە بە هیچ شێوەیەک نەگەیەنران و باسیان لێوە نەکرا. چیی تر چینی پرۆلیتار وەک جاران نەماوە، ئەمەش مانای ئەوە نییە چینەکە کز بووە یان نەماوە. ئەو بۆچوونەی گوایە ئەو جۆرە خەباتانە رێیان لێ گیراوە و ناتوانن

بچنە شوێنێکی تر، ئەمە وا نییە، ئاسۆیانە دەڕۆن و گەیشتوونەتە ئاستێکی جیهانی، هەر ئەم بۆچوونەش بوو، بەداخەوە، وایان کرد ڕووداوەکانی ٢٠١١ و زیندووبوونەوەی دروشمی "گەل دەیەوێ دەسەلات بڕووخێ" هێندە بڕ نەکا.

کێشەی ئەم جۆرە کارانەی وەک هاردت و نیجر ئەوەیە بەردەوام یەک قەوان لێ دەدەنەوە، ئەویش قەوانی بالادەستیی ئەوروپایە، جگە لەو چ جیهانێکی تر شک نابەن، ئێستە یەکێ هەر خەیالی بۆ بالادەستیی ڕۆئاوا دەچێ کە بەجیهانی کراوە، هەروەها لە سیاسەتێکی پێشکەوتوودا دەیانەوێ بە زاراوەی خۆیان بەسەریدا زاڵ بن. ئاگەداری هیچ جیهانێکی تر نین، نەک هەر تەنیا جیهانەکانی رابردوو، بگرە ئەو جیهانانەی وا پەیدا دەبن وێڕای "جیهانی ڕۆئاوا" کەوا خەیالیانی دیل و داگیر کردووە. پێگەیەکی تری بەرگریکردن لە دژی بەجیهانیبوونی ئیمپریالیستی درک کردن و داننانە بە فرە جیهانی کەوا پێشتریش هەر هەبووە و بەردەوامیشە، ئێستە وا پێش دەکەوێ، بەرهەمی ئیمپریالی "ڕۆئاوا"، کە بەرهەمی بیری فوکویاما و ساموێل هەتینگتنە، هەروەها بیرە داگیرکراوەکانی جیهان کە تا ئێستەش قسە بۆ ڕۆئاوا دەکەن، سەرکەوتووانە دەمامکدار کراون. ئەوەی لە ڕاستیدا هاردت و نیجەر دەیکەن بەسەر بەجیهانبوونی سەرمایەداری ناکەوێ، بگرە خۆراکە بۆ هێز و دەسەلاتی ئەو جیهانەی وا سەر هەڵدەدا. ئەگەر بێتو باسی ئەو فرەیییە بکەین کە تێیدا بەرگری نییە لە دژی ڕۆئاوا (واتە سەرمایەداری جیهانی)، بگرە بەرگری لە جیهانە تایبەتەکان و هاوپەیمانانی نیشتمانی و نێوتەوەییدا هەن کەوا بەهۆیانەوە ئەو فرەییە پێش دەکەوێ و دەمێنێتەوە.

بەهاری عەرەبی جیهانێکی تر دەدۆزێتەوە، جیهانێک کە زۆری پێ دەچێ، ئەو جیهانەی پۆستکۆلۆنیال بەڵێنی دابوو بەلام فەشەلی هێنا و قسەی خۆی نەبردە سەر، بۆیە شاردییەوە، هەروەها ئەو جیهانەی کەوا نەخشەی ئیمپریالی ڕۆئاوا شاردبیەوە. بۆچوونەکانیان ماقووڵ و گەورەن، هاردت و

نیـجـەر رۆئاوا گـەورە ناکـەن، تەنانەت لاقـەیشـی ناکـەن. بەهۆی وەسـفی فەلسەفییان، گەورەییەکەی زیاتر میتافیزیکی دەکەن، بەتایبەتی لەم ساتەدا کەوا خەریکە بارگەی تێک دەنێ.

## ئیتنۆس (ئیتنی) لەژێر چاکبوونەوەدا

ئەگەر بێـتـو دووانەیی گـەورەیی و فـەلسـەفی بکەینە غـەیرە مـەسـیـحی و بەکاری بێنین تا یارمـەتیـمان بدا لەو رووداوە کـاریگەرانە تێ بگەین، ئەوا دەبێ واز لە بیـرەوەری و قـسـەوباسی تیلیـۆلۆجی بێنین، واتە دووبارە کۆکـردنەوەی دوانەبڕاوی مێـژوو، دەبێ زیاتر خـۆمـان بسازێنین لەگەڵ ئەو ساتانەی ئێـمـە تێـیـاندا دەژین و ئەو راپەڕینە دیموکـراتیـیـانە دەبینین. گەورەیی ئەو پێشکەوتنانـەی روو دەدەن لە چەندان وڵات پێویستی بە وەها دیدێکە کە گەورە بێ و درک بە قۆناخی گواستنەوەی جیهان بکا کە ئێمە وا دەیبینین، بەڵام لە رووی مێژووییەوە دەبێ درک بە هەر نەتەوە – وڵاتێک بکا تێیدا راپەڕینەکان سەرچاوەیان گرتووە. بەواتایەکی تر، بۆ تێگەیشتن هەر یەکێ لەو رووداوانە، لە تونس، میسر، سووریا، ئێران، بەحرێن، یەمەن یان ئەفغانستان، دەبێ لە یەک کاتدا لە رووی مێژووییـەوە فەلسـەفی بین و لە رووی جوگرافیشەوە فراوان بیر بکەینەوە. هەریەک لەو وڵاتانە پێویستی بە زاراوەی مێژوویی و فەلسەفی هەیە، بەتایبەتی بۆ ئەزموونگەلی کۆلۆنیال و پۆسـتکۆلۆنیـال، هـەروەها هـاوکـات لە رێگەی هاوکـارێکی گـەورەیی ئاسۆییـیـەوە دەبێ ئاگەدار بین کەوا خـەریکە جـوگرافیـیـەکی نوێی ئازادی دەبێ لەدایک. مێژوو هەر بەشتێکی دەرەکی دەمێنێتەوە بۆ ئەو وڵاتانەی وا لەناو دۆخەکەن، لە کاتێکدا رێ بە جوگرافیا دەدا فراوانبوونی جیهان رایی بکا. نە لە رووی مـێژوویـیـەوە سـووربوونە و نـە لە رووی جـوگرافـیـشـەوە پێـدادەگـرن، بەڵام لە یەک کـاتدا لە رووی جـوگـرافی و مـێـژوویـیـەوە ئەو رووداوانە گەورەن و بەهۆیانەوە هەستێکی نوێ هاتووەتە ئاراوە.

پەیدابوونی جوگرافیایەکی جیهانی نوێ، لایەنە مێژووییەکەی بەرهەمی کۆلۆنیال (رۆهەڵاتی ناوەڕاست) نا، بنەمایەکە بۆ تێگەیشتن لەو راپەڕینانە، هاتنە دەرەوە لە جیهان کە تەنیا ئەزموونی مێژووی تایبەتی کۆلۆنیالی هەیە، نەک پیرۆزیی ئایدیۆلۆجیاکان ئەوەی کە هانس جۆرج گادەمار بە مێژووی کاریگەری ناو دەبا.

لەم حاڵەدا ئێمە دەتوانین ئەو فاکتە دیاری بکەین کەوا رووداوەکان لە ئەفریقیا و ئاسیا هەر تەنیا کۆدی "جیهانی عەرەبی و موسڵمانیان" پێ نادرێ، کە ئێمە دەبێ پێیان بڵێین لەژێر چاککردنەوەدان، کە چیی تر بوونی نییە بەڵام هەر بەسوودە. بۆچی زاراوەکە هەر پێویستە و تەنانەت بەرهەمداریشە، هاوکات چیی تر بوونی نییە و دەشڵێن دژە بەرهەمە؟ بەشێوەیەکی ستراتیجی بەرهەمدارە، بەڵام پێویستە، چونکە ئەو بالادەستی و کاریگەرییانەی وڵاتانی تر هەیانە ئێستە کەوتووەتە ژێردەستی بەهاری عەرەبی، ئەمەش شت بەرهەم دێنێ و شت لەناو دەبا، هەروەها زۆر زەحمەتی دەکا بۆ ئەمەریکا و هاوپەیمانانی ئەورووپی و ناوچەکە، یان کۆماری ئیسلامی و دۆستانی، بتوانن بەوردی بەدوای راپەڕینەکاندا بچن. هۆکارێکی تر هەیە بۆچی ئەمە دژە بەرهەمە، ئەویش ئەوەیە: ئێمە چەندە ناوی کۆنی جیهانیی ئازادمان بۆ بمێنێتەوە ئەوەندە وێنە تازەکەی بەرچاومان لێڵتر دەبێ و ناتوانین ناوێکی لێ بنێین، چونکە ئەم رووداوانە لە راستیدا بەرەو دیالێکتیکی کراوە دەچن کە پابەندە بەچاکبوونەوە و دۆزینەوەی جیهانە نوێیەکان کەوا چیی تر ناتوانن بە جیهانی عەرەبی یان موسڵمان پێناسە بکرێن. دۆڕاوەکان لەو رووداوانەدا هەر تەنیا هاوپەیمانانی ئەمەریکا نین، وەک تونس، میسر یان سعوودیە، بگرە کۆماری ئیسلامی و دۆستەکانیەتی لە ناوچەکە، وەک حزبوڵڵا، حەماس و سوپای مەهدی، مەگەر خۆیان لەو کۆمارە بکەنەوە (وەک چۆن حەماس خێرا خۆی لە ئێران کردەوە) هەروەها خۆیان لە چارەنووسی رووخاوی ئەو رێژیمانە وەدوور بگرن.

کەواتە ئەوەی زاراوەی "جیهانی عەرەبی و موسڵمان" دەیشارێتەوە ئیتنییە (عەرەب) و ئایدیۆلۆجییە (ئیسلامی) کەوا دەمێکە جیهانی عەرەبی و ئیتنییەتی عەرەبی شێواندووە، ئەمەش پێویستی بە فاکتی کۆزمۆپۆلیتانی کۆمەڵگەکان هەیە. ئەوەی ئێمە دەیبینین دەکرێتەوە قۆناخی گواستنەوەی ئیتنیی "جیهانی عەرەب و موسڵمانە" بۆ ناو ئیتنیی راپەڕینێکی ئەخلاقی و خەیاڵی، کە هێشتە ماوەیەتی ئاکامەکانی تەواو وەدیار کەون.

دوایەمین گەورەترین شۆڕش کە لە ناوچەکەدا رووی دا شۆڕشی ئیسلامی بوو (١٩٧٧-١٩٧٩)، کە ساز کرا لەسەر بنچینەی خەیاڵگەلی وەک ئازادی و سەربەخۆیی کەوا دواتر دڕندانە وەلا نران کاتێ سیستەمێکی ئاینیی ستەمکار جڵەوی گرتە دەست. ئەمڕۆکە سی ساڵ بەسەر ئەو سیستەمە ئاینییە ستەمکارەدا تێپەڕیوە، ئەمە باکگراوندێکی قووڵی راپەڕین و شۆڕشەکانی ئەمڕۆیە کە ئێمە پێیان دەڵێین بەهاری عەرەبی. ئەوەی جیهان لە دەورەی کۆماری ئیسلامی پێشانی دەدا درۆیەکی مێژووییە کە سیستەمە ئاینییەکە سی ساڵە خۆی لەو دەدزێتەوە، لەبەر فاکتی کۆزمۆپۆلیتانی ئەو کۆمەڵگایانەدا، کە رژێمی حوکمڕان بەتوندی سەرکوتی کردووە، ئێستە گەڕاوەتەوە بۆ جیهان و وا ئێمە بەچاوی خۆمان دەیبینین. واتە، ئەم شۆڕشانە هەڵگەڕانەوەی کۆماری ئیسلامیی چەوساوەیە: ئێران دەبوایە رەتی بکاتەوە بەخۆی بڵێ "شۆڕشی ئیسلامی" و دەبوایە دژی ئەو بەرهەمە بێ کە پێی دەڵێن کۆماری ئیسلامی. ناوچەکە کۆماری ئیسلامی فڕێ دەداتە دەرەوەی بازنە، پەیکەرە ئێسکی لەناو دۆلاب وەدەر دەنێ، ئەو راپەڕینە مەزنە ئاشکرا دەکا کە هیواکانی شۆڕشی ١٩٧٩ی دروست کرد، پێش ئەوەی دڕندانە سەرکوت بکرێ، قوربانییانی ئەتک کران، کوژران، بە کۆمەڵ نێژران. پێگەی گۆڕستانی خاڤەران، تێیدا رژێم بە هەزارانی خوێن سارد کرد و کوشتی لە هەشتاکان، ئێستە بەگوێی پیاوانی ئاینیی شەڕانگێزدا دەزرینگێتەوە.

پارێزکارە نوێیەکان لە ئەمەریکا دەترسن لەوەی نەبادا بەهاری عەرەبی ببێتە هۆی "راپەڕینێکی تری ئیسلامی"، لە کاتێکدا ئێران خێرا خۆی گەیاندێ و گوتی ئەمە شۆڕشێکی ئیسلامییە، بەڵام خێرا لە قەوچەی درایەوە. بەڵام ئەوەی سی ساڵ پێش ئێستە لە ئێران رووی دا شۆڕشێکی ئیسلامی نەبوو، هەروەها ئەوەی خەڵک بۆی جەنگا کۆمارێکی ئیسلامی نەبوو. لە باتیی ئەمانە، شۆڕشێکی گەورەی کۆزمۆپۆلیتان بەتوندی و زۆرداری بە ئیسلامی کرا بەهۆی سەرکوتکردنی شۆڕشە کولتوورییەکان، سەرکوتکردنی زانکۆ، کوشتنی بە کۆمەڵ، دوورخستنەوە بەزۆر و زۆرداری و زۆریی تەنگژەی ناوچەیی. کۆماری ئیسلامی سی ساڵی سەرف کرد لە چەوساندنەوەی گەلەکەی، وێنەیەکی شەرعیەتی دروست کرد و پێگەیەکی شۆڕشی دا بە خۆی، ئێستەش ئەو شۆڕشە گەورانەی لە دەوروبەری روو دەدەن هەمان ئەو تۆقینانەیان تێدا دەبینرێ کە سیستەمە ئاینییەکە کردی و کوشتی. بۆیە بەرپرسانی کۆماری ئیسلامی هێندەی ئەمەریکا، ئیسرائیل و سعوودیە نیگەرانن و دەترسن، وەک ئەوانیش دەیانەوێ سەرکوتیان بکەن و لە گۆڕیان نێن.

بەڵام هەموو ئەمانە ئاوە بەژێر پردەوە. بەهاری عەرەبی خونچەی دەرکردووە، وەک پشکوتنی جوانیی گوڵی بەهاران، لەو ئاوە لێڵ و قوڕاوییەی کە وەختێک دڕندە و خاکێکی بێ پیتی هەبوو، سەر دەردێنن.

دووەم

## بەرەو جوگرافیایەکی ئازاد

لە وتارێک بۆ ئەلجەزیرە، "ئاخۆ منداڵانی فەلستین کەمتر شایەنن؟"، (٢٠١١)، جۆزێف مەساد، سکۆلەرێکی ناسراوی بواری سیاسەتی مۆدێرنی عەرەب و مێژووی رۆشنبیری، بەرێککەوت پرسیارێکی سەرنج ڕاکێش دەکا (هەرچەندە زۆر کەم ورووژێنراوە) لە گەرمەی ململانەی عەرەب-ئیسرائیلدا:

> ئەو شتە چییە لەبارەی منداڵانی جوولەکە و عەرەب کەوا یەکەمیان رەپێش دەخرێن و دووەمیان وەپاش لە وتارەکانی سەرۆک باراک ئۆبامادا، یان بڵێین لە میدیاری رۆئاوادا بە گشتی؟ ئاخۆ منداڵانی جوولەکە ژیرترن، قشتترن، سپیترن؟ ئاخۆ ئەوان شایەنی سۆز و هاوکارین، منداڵانی عەرەب شایەنی نین، لەبەرئەوەی منداڵانی جوولەکە گوناهیان نییە و نابێ بە تاوانی دێبابیان پیس بکرێن، کە زۆرجار بە "منداڵانی ئیسرائیل" ئاماژەیان پێ دەکرێ؟ یان، ئاخۆ منداڵانی عەرەب هێندە مەترسیدار بن، هەرەشەچی بن، تاوانبار بن، تەنانەت رەش و ناشیرین بن، دۆخێکە تەنیا فۆبیای عەرەبی دەیگرێتەوە، واتە ترسی رۆئاوا لە منداڵانی عەرەب؟

مەساد لە درێژەی وتارەکەیدا بە وردی و تەواوی باسی رەهەندە مێژووییەکانی زاراوەی "ئەرەبۆپێدەفۆبیا" فۆبیای عەرەبی دەکا.

کەی و لە کوێ ئەرەبۆپێدەفۆبیا (Arabopaedophobia) سەرهەڵدەدا؟، یان، هەمان پرسیار ئاوەژوو کەیتەوە، ئەم جۆرە رەپێشدانە بێ شەرمانەی

منداڵانی ئیسرائیل بەسەر عەرەب لە پای چی؟ زیاتر لە جارێک، سەرۆک باراک ئۆباما منداڵانی ئیسرائیلی بەمنداڵانی چواندووە و بەراورد کردووە، بەڵام قەت نەیوێراوە خەیاڵی ئەوە بکا منداڵانی فەڵەستینی وەک مالیا و ساشا حسێب بکا. بۆچی؟ مەساد لەو بارەیە دەڵێ:

گرینگە سەرنجی ئەوە بدەی کەوا ئۆباما لەوانەیە چاوی کەوتبێ بەو کچە قژزەردانە (کە وێنەیان گیرا کەوا پەیامی مردنیان دەنووسی کاتێ لبنان بۆردمان دەکرا لە جولای ٢٠٠٦) کاتێ چەند مانگێک لەمەوبەر سەردانی کیریات شمۆنای کرد، لە جانیوەری ٢٠٠٦. پاشان گوتی شارۆکەکە بە شارۆکەیەکی ئەمەریکی دەچێ، لەوێ دەنگی منداڵانی ئیسرائیل دەبیستێ کەوا "وەک منداڵانی خۆم یاری دەکەن".

چەندانی جاری تر هەبووە ئۆباما منداڵانی ئیسرائیلی بەمنداڵی خۆی زانیوە. بەرگری لەو ئۆپەراسیۆنەی ٢٧ی دیسێمبەری ٢٠٠٨ کرد کە ئیسرائیلییەکان پێیان دەگوت "بەرەو ڕابەرایەتی"، سەرۆکی تازە هەڵبژێردراو گوتی: "ئەگەر یەکێک تۆپ بە ماڵی منەوە بنێ کەوا دوو کچەکەم تێیدا خەوتوون لە شەودا، ئەوا ئەوەی لە دەسەڵاتم دا بێ دەیکەم بۆ وەستاندنی ئەمە. بۆیە پێشبینی دەکەم ئیسرائیلییەکانیش هەمان شت بکەن." ئەمە هەمان ئەو ئۆپەراسیۆنە بوو کەوا بەئەنقەست منداڵانی ئیسرائیلی کرانە نیشانە لەلایەن سوپای ئیسرائیلی و هەندێ جار وەک قەڵخانی مرۆیی هاتنە بەکارهێنان یان لە تەقەی هەڕەمەکیدا کوژران، ئەمە ڕاستییەکە تەنانەت لە ڕاپۆرتی گۆڵستۆونی جەربەزە و ڕەخنەلەخۆگردا باسی لێوە کرا. منداڵ هەر منداڵە: چ جیاوازییەکی هەیە لێرە، یان لەولا بکوژرێن؟ دەبێ هەردوو کوشتار سەرکۆنە بکرێ. باشە لەبەرچی باراک ئۆبامای سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان خۆی کوێر دەکا و منداڵانی فەڵەستینی نابینێ، بەڵام کاتێ باسی منداڵانی ئیسرائیل دەکا یەکسەر

منداڵانی خۆی بیر دێتەوە؟ ئێ خۆ ئۆباما ئیسرائیلی نییە، ئەو ئەمەریکییە، بگرە ئەفریقی-ئەمەریکییە. ئەمانە چ پەیوەندییەکیان پێکەوە هەیە؟

مەساد دوو کەڕەتان بە بەڵگە باسی ئەوە دەکا ئۆباما منداڵانی ئیسرائیلی (قژزەرد)ی بە منداڵانی خۆی زانیوە، ئەمە ئەو پرسیارە قووت دەکاتەوە، باشە چۆن دوو کچی ئەفریقی - ئەمەریکی، لە دێبابێکی ئەفریقی - ئەمەریکی وەها ئاسان وێک دەچوێنرێن و بەراورد دەکرێن لەگەڵ منداڵانی قژزەرد، لەسەر حسێبی پشتگوێخستنی منداڵانی فەڵەستینی؟ باشە لەبەرچی وەک مەسیحییەک، بۆ نموونە، سەرۆک منداڵە فەڵەستینییە مەسیحییەکان بەهی خۆی نازانێ، یان وەک کوڕە موسڵمانێک، فەڵەستینییە موسڵمانەکان بە هی خۆی نازانێ، یان وەک نەوەیەکی ئەفریقی، منداڵانی عەرەب بە هی خۆی نازانێ؟ سیاسەتی رەگەزپەرستی وێکچوواندن و بەراوردکردن ئاماژەیە بە زێدەڕۆیی تێکەڵکردنی منداڵانی ئیسرائیلی و ئەمەریکی بۆ نێو تاکە پۆلێنێک کەوا مێژوویەکی خوێناویی کۆیلایەتیی ئەفریقی وەلا دەنێ. ئەو پۆلێنە، زۆر کاریگەرە لە جیۆپۆلەتیکی باڵادەستیی جیهانی، کۆدەکەی "رۆئاوا"یە. منداڵانی ئیسرائیلی و ئەمەریکی "رۆئاواین"، کۆدەکە وا فەرمان دەکا، منداڵانی فەڵەستین، عەرەبن، رۆئاوایی نین، بگرە رۆهەڵاتین. هەروەک شاعیری باڵای ئیمپریالیزمی بەریتانی رودیارد کیپلینگ (١٨٦٥-١٩٣٦) دەڵێ:

ئاخر رۆهەڵات رۆهەڵاتە و رۆئاواش رۆئاوا، ئەم دووانە قەت یەکناگرن،
تا ئەو دەمەی زەوی و ئاسمان بمێنن لە بەردەم حوکمڕانی مەزنی خوادا....

ئۆباما منداڵانی خۆی بە رۆئاوایی دەزانێ و بۆیە یەکسەر بە منداڵانی ئیسرائیلیان دەچوێنێ، نەک بە منداڵانی فەڵەستینی، چونکە ئەوان سەر بە هۆزێکی جیان، ئەوان رۆهەڵاتین، واتە بە تەواوی لە دیدی رۆئاواییدا بەدەرن، چونکە جیهانی نین، ئەوان "ئەوان"ی ترن، پارچە پارچە کراون، با

نایانگرێتەوە، لە دەرەوەی شارستانیەتی مرۆڤایەتین، ئەو مرۆڤایەتییەکەی کە کۆدەکەی دیسان "رۆژئاوا"یە. فەلەستینییەکان، هەر هەموویان، شان بەشانی عەرەبەکانی تر، موسڵمانن، تەواوی ئاسیا، ئەفریقیا و ئەمەریکای لاتین، تەواوی جیهان لە دەرەوەی ئەو پۆلێنە تایبەتەی "رۆژئاوا"ن، ئەوانە جیهانی نین. ئەوان لە جیهانی "ئەوان"ی تردا دەژین، جوگرافیا و پێگەیان سەرچاوەی ترسی "جیهانی رۆژئاوا"یە. ئەگەر ئەو منداڵانە رێیان پێ بدرێ هەناسە بدەن، بە مرۆڤ حسێب بکرێن، شتێکی خراپ روو دەدا: "رۆژئاوا" نامێنێ. چیی تر بوونی نابێ. ئەو جۆرە منداڵانە و دێبابیان دەبێ هەر لەژێرەوەی مرۆڤ بن بۆ ئەوە مرۆڤایەتیی رۆژئاوا (جیهانیبوونی) هەر بمێنێتەوە. منداڵانیان، بوونیان، هەناسەدانیان، داوایان، ئازادییەکانیان، نابێ پیادە بکرێن لەبەر "رۆژئاوا".

بەهاری عەرەبی نەخشەی باڵادەستیی داگیرکاران دەشێوێنێ، سەراوژێری دەکا. جیهانی عەرەب و موسڵمانان، کە بەم زاراوەیە باس دەکرێ لە مێژوویەکی درێژی باڵادەستیی کۆلۆنیال، مێژووی رۆژهەڵاتناسی و فێربوون و خەیاڵکردن. هەروەها پسپۆرانی بواری لێکۆڵینەوەش دەڵێن درێژەپێدەری سیاسەتی داگیرکاریی هیندستانە لە سەدەی هەژدە تا داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئەمەریکا لە سەدەی بیست و یەک، ئەمەیە باڵادەستیی رۆژئاوا بەرامبەر بە "ئەوان"ی تر. رۆژهەڵاتناسان، خودی خۆیان، بەهۆی خزمەتەکانیان، ئیمپریالیزمی بەریتانی و ئەمەریکی بەیەکتری گرێ دەدەن لە رێگەی کارێکی سەرکەوتووی رۆژهەڵاتناسییانە: ئاسیایەک دروست دەکەن، بەهۆی دی ئێن ئەیە تژی لە خەوشەکەی، خزمەتی رۆژئاوا بکەن بۆ باشەی خۆیان. کتێبخانە و مۆزەخانەکانی دنیا، رۆژنامەوانی، هونەری نواندن و بینین، نیگاری خەیاڵی و تا دوایی کەسایەتیی عەرەب و موسڵمان بە رەها، مەترسییەکی رەها وەسف دەکەن، رێک پێچەوانەی سپییەکان، ئەو سپییانەی کە ئۆباماش پێیان دەچێ و باسیان دەکا. ئەمە ئەو رژێمی

مەعریفەیە، ئەو شێوە خەیاڵی و سۆزدارییەیە، قەناعەت بەخۆی دێنێ کەوا موسڵمان و عەرەبەکان ناتوانن هەرسی دیموکراسی بکەن لە کاتێکدا بەتەنیا خۆیان رووداوێکیان پێش هێناوە لە جیهان کە هیچ پێوەرێکی مێژوویی پێی راناگا، ئێستە بەهەموو هێز و توانای بەرەنگاری ئەو رووداوە دەبنەوە، چونکە دەترسن لەوەی نەبادا بەهۆی ئەو رووداوە بەری بن پێیان بێتە هەڵتەکان. ناسەقامگیریی ئەو رێژیمی مەعریفەیە یەکەم و دوایەمین راستییە لەبارەی ئەم راپەرینانەوە.

لە دژی باڵادەستییەکی رەهای خەیاڵی، بەهاری عەرەبی دەستی پێ کرد و بەرەو جوگرافیایەکی ئازاد پێ هەڵدەگرێ.

## بەنائیتنیکردنی جیهانەکان

لە ناوەراستی ئەپریلی ٢٠١١دا، لەلایەن موسۆ دو ئەمەریکا لە مەدرید داوەت کرام تا وتارێک لە کۆنفرانسی مۆزەخانەگەلی ئیتنۆگرافی ئەوروپا پێشکێش بکەم، لەوێ پارێزەران و بەرێوەبەرانی مۆزەکان تاووتوێی کێشەیەکی ئەخلاقییان دەکرد کە دووچاری بووبوون لە پێشاندانی کولتوور و کەلەپووری خۆیان بە کەسانی غەیرە ئەوروپی بۆ چێژوەرگرتن و خۆشی و پەروەردەی میوانە ئەوروپییەکان. مۆزە ئیتنۆگرافییەکان و تەواوی پرۆژەی ئیتنۆگرافی کە لەسەریدا بنیات نراون و پاشماوەی سەردەمێک بنیات دەنێن تێیدا پرۆژەی ئەوروپیی کۆلۆنیالیی مۆدێرنیتە لە دەستی کۆلۆنیالیتی چەوساوەتەوە، بنەرەتی خۆی لە دەست داوە بەهۆی جڵەوێکی گەردوونی کەوا زاڵ و سەپێنرا بەسەر ئەو کولتوورەی پێوەندیی بە جیهانەوە هەیە. ئەو دۆخەی ئێمە ناوی لێ دەنێین پۆستکۆلۆنیالیتی ئەو ساتە مێژووییەی رەخنەیە لە پێوەندیی ئەو دەسەڵاتە تێیدا ئەوروپا پرسیاری ئیتنی خۆی قووت دەکاتەوە بەو شێوە گەردوونییەی کە هەیە و داوای کز پێشاندانی ئیتنییەکانی تر دەکا کە داگیری کردووە، بە ئیتنیی کردووە، لەناو مۆزەی

داناون، هەمووی بە یەک کات دەخاتە ژێرپێ. ئەمڕۆ ئەو سیاسەتە کۆنەی ئیتنی بەسەرچووە بەهۆی پێویستی و پێشەنگی کولتوورێک کەوا دەبێ زاڵ بێ بەسەر سۆزی مرۆ بەسەر مرۆدا و بەسەر سروشتدا، ئەمە ئاماژەیە بە وتارەکەی ماکس فیبەر "ئەخلاقی بەرپرسیارەتی"ی گەل بەرامبەر گەل چونکە هەموو گەلان ئەم جیهانە ناسک و لاوازە پێک دێنن. ئەم زاڵبوونی کولتووره بەسەر ئیتنیدا رێی تێ دەچێ بەهۆی درککردن بەو جیهانانەی کەوا هەردەم بوونیان هەبووە بەلام بەهۆی بالادەستی و فێڵی رۆژئاوا هاتوونەتە چەوساندنەوە، بەلام زاڵبوونەکە پێش دێ تەنیا لە رێگەی داننان بە فرە جیهانی کە وا ئێستە سەرهەڵدەدا. زیندووبوونەوەی پۆلێنی "جیهانی عەرەب و موسڵمان" لەو راپەڕینە دیموکراتییانەدا یەکێکە لەو جیهانانە.

فراوانتر قسە بکەین، هەروەها رەچاوی پێش و پاشی بەهاری عەرەبی بکەین، جیهانەکان چین و لە کوێن کەوا سەرهەڵدەدەن بۆ زاڵبوون بەسەر نووشتەکانی "رۆژئاوا"؟ ئەو جوگرافییە خەیاڵی و راستییە کلیلە بۆ دووبارە بیرکردنەوە. ئەمە روونتر دەبێتەوە ئەو دەمەی باسی سووری جوگرافی دەکەین کە تێیدا ئەم جیهانانە سەرهەڵدەدەن لە رێگەی راپەڕینی شۆڕشئاسای زەبەلاح. بۆچوونی ئەوەی کە ئەم شۆڕشانە لە "جیهانی عەرەب و موسڵمان"دا روو دەدەن بێگومان یەکسەر بەشێوەیەکی خەیاڵئاسا بەرهەمدارن لە کاتێکدا لە راستیدا تژین لە خەوش. نەتەوە ئەفریقییەکان لە سەنیگالەوە بگرە تا جیبۆتی، نەتەوە غەیرە عەرەبەکانی ئەفغانستان، پاکستان و ئێران، هەروەها ولاتانی غەیرە موسڵمان لە ئیسپانیاوە تا یۆنان و، ولاتانی ئەودیو دەریای ناوەڕاست بەباشترین شێوە رەنگیان داوەتەوە لە بزووتنەوەکانی Occupy Wall Street (وۆڵ ستریت داگیر کە)، ئەمانە بەجۆرێک لە جۆرەکان رەنگدانەوەی دیاردەی گۆڕەپانی تەحریرن. ئەم راستییە نێونەتەوەییە ئاماژەیە بە جوگرافیای گوێزراو کە ئێمە وا تووشی دەبین. لەژێر دۆخی گشتیی ئەو لێکترازانە جیهانییەی جوگرافیاکان،

"جیهانی عەرەب و موسڵمان" ڕەوتێکی هێندە بەهێزە کە وەک پەندی پێشینان وایە بۆ ئەوانی تر.

## بیردۆزی هەڵتەکینی داگیرکاری

لە کتێبەکەی بەناوی فێمینیزم بەبێ سنوور (٢٠٠٦)، سکۆلەری ناسراوی فێمینیستی نەتەوەیی چاندرا تاپێد مۆهانتی دەگەڕێ بەدوای ڕێگەکانی "تیۆری هەڵتەکینی داگیرکاری و پراکتیزی هاریکاری." ئەو ئافرەتە دەڵێ:

> هەر گفتوگۆیەکی پێکهێنانی ڕۆشنبیری و سیاسیی "فێمینیزمی جیهانی سێیەم" دەبێ بە دوو پرۆژەی دەسبەجێ باس لە خۆی بکا: ڕەخنەی ناوەخۆی فێمینیزمی تاکگەرای ڕۆئاوا و هاوکێشەی خەم و ستراتیجەکانی فێمینیستی سەربەخۆ کەوا وابەستەن بە توخمی مێژوویی، کولتووری و جوگرافی. پرۆژەی یەکەم پرۆژەیەک بۆ تێکدان و هەڵتەکاندن، دووەمیان پرۆژەی بنیاتنان و دروستکردنەوەیە. هەرچەندە ئەو دوو پرۆژەیە هاودژی یەکترن... ئەگەر بێتو ئەو دوو ئەرکە لە یەک کاتدا بکرێن، فێمینیزمی جیهانی سێیەم تووشی مەترسیی پەراوێزخستن یان پەراگەندەیی دەبێ هەم لە ڕەوتی سەرەکیی چەپ و ڕاست و هەمیش لە گوتارەکانی فێمینیستی ڕۆئاوا.

ئەمە نموونەیەکی تەواوە بۆ بیردۆزی هەڵتەکینی داگیرکاری، ئاسان لە ڕێگەی ملکەچکردنی زاراوەی "ڕۆئاوا" بۆ جووتە لێدوانێکی تەنازولئاسا، هاوکات دەست لە خۆی هەڵگرێ و بەرەو بەدیلی "جیهانی سێیەم" بچێ وەک کارێکی ڕەوای جیۆپۆلەتیک. بەڵام جیهانی سێیەم خۆی لە خۆیدا دروستکراوی جیهانی یەکەمە، واتە ڕۆئاوا. بۆچی وا باشە ئێمە مشتومڕ بکەین و پەسندی ئەوە بکەین جیهانی یەکەم ئێمەی لە کوێ فڕێ داوە؟ مەبەست لێرە تەواو پێگەی ئەو زاراوەیە، سێیەمبوونی ئەو جیهانە و

یەکەمبوونی جیهانی رۆژئاوا، کە شتێکە کەس پرسیاری لێ ناکا، کە هەردەم پرسیاری سەرەتا و کۆتا بووە. کوا یەکەم، ئەی دووەم چی بەسەر هات، ئەی باشە بەدەسەلاتێک بەشە سەرەکییەکەی مرۆڤایەتی خراوەتە ناو جیهانی سێیەم؟ تا دوو پۆلێنی رۆژئاوا و جیهانی سێیەم بمێنێ، هەتا ئەگەر بخرێتە ناو کەوانەشەوە، ئەوا ئەو سنوورانە قەت نایەنە بڕین. لە راستیدا سنوورەکان ئەستوورتر کراون و تۆکمەتر کراون.

جوگرافیا نەخشەیەکی شاراوەی خەیاڵ و ئایدیۆلۆجیا و بالادەستیی سپییەکانە. لەسەر بنچینەی ئەو جوگرافیایە گوتارە ئیتنۆگرافییەکان بنەچەی پێش مێژووی مرۆی سپی و چارەنووسیان بەشێوەیەک دەگێڕنەوە گوایە هەر سەرۆکی گەردوون بوونە. لەم پرۆسەیەدا، کولتوورەکانی ئەودیو و ژێرەوە و ئەزموونەکانیان هەمووی لە مۆزەخانە هەڵگیراون، هەروەها رژێمێکی بەرهەمهێنانی مەعریفە کە ناتوانێ رووداوە جیهانییە مێژووییەکانی وەک بەهاری عەرەبی هەرس بکا بەو شێوەیەی ئێمە تێیان دەگەین، ئەوەی فێر کراوین، هەر ئەوە پاڵپشتیی لێ دەکرێ. ئەرکەکە هەڵتەکاندنی ئەو رژێمی مەعریفەیە، هەروەک چۆن میسرییەکان، تونسییەکان و ئەوانی تر وا رژێمە ستەمکارەکان کە دەمێکە حوکم دەکەن هەڵدەتەکێنن. رووخاندن و هەڵتەکاندنی رژێمێکی سیاسی و رژێمی مەعریفە دەبێ دەست بەدەست بڕوا.

بالادەستیی تۆماتیکی و دروستکراوی "رۆژئاوا" لە جوگرافیا خەیاڵییەکەدا، کە ئێمە بۆمان ماوەتەوە لە دەرهاوێشتەی کۆلۆنیالیزمی ئەوروپا و ئیمپریالیزمی ئەمەریکا، تاکە هۆیە بۆ دروستکردنی ئیتنی کەوا رەگی ئیتنۆگرافییە، هەروەها بناخەی مۆزەخانە ئیتنۆگرافییەکانە، بەبوونی ئەمانە جیهان بە دامەزراوەیی و پارچە پارچە دەکرێ و دەکرێ بە یەکەی زۆر بچووک. لەگەڵ تەقینەوە و تەشەنەکردنی "رۆژئاوا" وەک پۆلێنێکی دروستکراو لە دوای رووخانی یەکەتیی سۆڤیەت، هەروەها لەگەڵ

یەکگرتنەوەی ئەورووپا، دەمەتەقێی نێوان ئەمەریکا و یەکەتیی ئەورووپا لەوەتەی شەڕی عێراق، ئێستەش لەوەتەی راپەڕینەکانی ئاسیا و ئەفریقیا، ئەو مۆزەخانە ئیتنۆگرافیانە خۆیان خراوەتە ناو مۆزەخانەوە. ئێمە دەچینە ناو هۆڵەکانی ئەو مۆزەخانانە و دەپرسین چی وای لە هەندێ خەڵک کردووە کەسانی تر لەناو بۆکسی شووشە دابنێن و تەماشایان بکەن، جا بۆ خۆشی، دڵرفێنی، پەروەردە یان زاڵبوون بێ.

لە مۆزەخانەی مێژووی سروشتیی ئەمەریکی لە نیویۆرک، خەڵکی لەگەڵ منداڵەکانیان بەناو هۆڵەکانی پێشانگەکەدا دەچن، تەماشای ئەمەریکییە ئەسڵییەکان، ئەفریقییەکان، ئەسکیمۆییەکان، هیندییەکان، عەرەب و ئێرانییەکان و تا دوایی دەکەن، ئەمانە تێکەڵ کراون و چوێنراون بە ئاژەڵی سەیر سەیر، لە داینەسووڕەوە بگرە تا دەگاتە گاجووت، یاک، فیل، زەڕافە، شێر، شامپانزی و تا دوایی. جارێکیان لە پاسەوانێکی ئەفریقی – ئەمەریکیی مۆزەخانەیەک نزیک بوومەوە و پرسیم، ئەی کوا سپییەکان، مەگەر ئەوانیش شارستانیەتیان نییە شایەنی ئەوە بێ لەودیو ئەو شووشانەوە دابنرێن و خەڵکی سەیریان بکا؟ لەسەرخۆ پێ کەنی و بەمنداڵێکی گوت "تکایە دەستی لێ مەدە" چونکە منداڵەکە زۆر چووبووە پێش لە هەڵۆیەکی ناو شووشەیەک کە لە تەنیشت چەند کەسایەتییەکی زەردەشتی و جوولەکەدا دانرا بوون. لە مۆزەخانەی مێژووی سروشتی، کە ئیتنۆگرافیا و باخچەی ئاژەڵانی تێکەڵ بەیەک کردووە، مرۆڤ و ئاژەڵ پێکەوە کۆ کراونەتەوە. لێرەدا، رابردووی "رۆئاوا" یەکسان کراوە بە ئێستەی "ئەوان"ی تر، لە تەک باشترین ئاژەڵدا دانراون، ئەمە شاوڵییە بۆ ئەورووپا، ئاسۆییە بۆ جیهان، هەروەها گەردوونی و شرۆڤەکارییە بۆ شانشینی ئاژەڵان.

ئەرکی دامەزراوەیی مۆزەخانەی ئیتنۆگرافی فەرمانکردن و ناونان بووە لە جێگرەوەکانی مۆدێرنیتەی ئەورووپی بەهۆی دەسەڵاتدان بەو خەیاڵە

دروستکراوەی رۆژئاوا. ئەو مۆزەخانانە، بەشێوەیەکی شاولی رۆژئاوا کۆ دەکەنەوە، رێکی دەخەن و دەیپارێزن، بەڵام بەشێوەیەکی ئاسۆیی هی ئەوانی تر، واتە یەکسانکردنی مێژووی رۆژئاوا بە جوگرافیای جیهان. مۆزەخانەکان ئالیەتن، بەڕاستی شتەکان باش پێناسە دەکەن، لە ئاسان خوێندنەوەی مۆدێرنیتەی ئەوروپی کەوا پێگە و خەیاڵەکەی باڵادەستیان دەسەپێنێ و پیشان دەدا، لایەنی ئیلاهی و عەلمانیەتی خۆیان پیشان دەدەن. ئاخۆ مۆزەخانەکان بەڕاستی کار دەکەن بۆ "ئێمە"یەکی گشتگیر و رێک بەبێ ئەوەی بە وشە باسی مۆدێرنیتەی ئەوروپی بکەین کە هەردەم بیرۆکەی کۆلۆنیالیتی بردووەتە پێش و سەرکوتی ئەوانی تر دەکا؟ ئاخۆ مۆدێرنیتەی پۆستکۆلۆنیال، بەتایبەتی، دابەشکردنی دیموکراتییانەی هۆ و پێشکەوتن، بووەتە رەوتێکی نوێی جیهانی ئێمە؟ ئەگەر دووسەت ساڵی رابردوو هەر ئامارژەیەک بن، راستییەکە ئەوەیە بۆچوونی پۆستکۆلۆنیالیتی درێژەی بە باڵادەستیی کۆلۆنیالی جیهان داوە و کردوویەتی بەباڵادەستیی بەرهەمهێنانی مەعریفە لە دژی ئەو گەلانەی رادەپەڕن نەک تەنیا بۆ رووخاندنی رژێمە حوکمڕانەکانیان، بگرە ئەو رژێمانەش کەوا تەڵە بۆ خەبات و گوتارە زاڵەکانیان دادەنێنەوە.

## بەنیشتمانیکردنی جوگرافیا

لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا، کۆواری ناشنەڵ جیۆگرافیک، کە دڵی خەیاڵی ئیمپراتۆرەکەیە، پیسکەی سەرەکیی وەلانان و کەمکردنەوەی ئیتنۆگرافیا، کولتوور و کەشوهەوای ئەوانی ترە. کاتێ ئەمەریکییەکان تەنانەت ئەورووپییەکانیش گوێیان لە وشەی "عەرەب" دەبێ یان شتێک لەبارەی بەهاری عەرەبییەوە دەخوێننەوە یان لە تەلەڤزیۆنەکانیان دەبینن، دادوەرانەیە بڵێم ژمارە کەڵەکەبووەکانی ناشنەڵ جیۆگرافیکیان بەلانی کەم ئامارژەیە بەهاوێنەیەکی گرینگ، بگرە ئامێرێکی سۆز و بینایی گرینگە، بەهۆیەوە

دەبینن، دەبیستن و یان دەخوێننەوە. دوو تاقیکردنەوەی گرینگی کۆواری ناشنەڵ جیۆگرافیک، کە دامەزراوەیەکی گرینگ و دیارە لە وڵاتە یەکگرتووەکان و ئەورووپا کە دەگاتە هەموو قوتابخانەیەکی دوورەدەست، کتێبخانەی گشتی، ماڵێک، دەمێکە وردەکاریی ئەو نەخشەیەی لە بیری خەڵکدا چەسپ کردووە کەوا خۆیان بەدوور دەگرن لە کولتوورەکانی تر تا زیاتر ئاشنایان بکەن بە باڵادەستیی مێژووی گەردوونیی خەیاڵی خۆیان، نەک ئەوانی تر. لە ١٩٩٣، کاترین أ. لوتز و جێین ل.کۆڵنس، لە لێکۆڵینەوە پێشەنگەکەیاندا (خوێندنەوەی ناشنەڵ جیۆگرافیک، ١٩٩٣)، ئەوە دەخەنە روو چۆن ئەو کۆوارە خۆی کردووە بە پەنجەرەیەک بۆ تێڕوانین لە جیهان کە لێیەوە خەڵک پێی ئاشنا بووە، بەڵام جەماوەری ئەمەریکای باکور ئاشنا دەکرێن بە شوێن و گەلانی "ژەهراوی" بۆ ئەوەی بێزارییان بڕەوێتەوە. کۆوارەکە زۆر بەکەمی دەپرژێتە سەر کولتوورەکانی تر و خەڵک لەبارەیانەوە فێر ناکا، بەڵام زۆر شت فێری خەڵک دەکا لەبارەی جیهانێکی سیستماتیکی ئیتنۆگرافی دوورەپەرێزەوە. نزیکەی دە ساڵێک دواتر، لە ٢٠٠٠، لیندا ستیت، لە لێکۆڵینەوەکەی (پەردە و خەنجەر: سەدەیەک لە پێشاندانی جیهانی عەرەبی لە ناشنەڵ جیۆگرافیک، ٢٠٠٠)، ئەوە دەخاتە روو چۆن هەمان کۆوار بەردەوام گەلانی عەرەب و موسڵمان بە مەترسیدار پێشانی گەلی ئەمەریکای باکور دەدا.

ئەوەی ناشنەڵ جیۆگرافیک لە راستیدا دەیکا نوێنەرایەتیی ئەو کولتوورانە نییە بگرە راستییەکەی دروستکردنیانە بە ساختەیی. لە دیدێکی رەخنەگرانەی توندەوە، نوێنەرایەتیکردنی باش و خراپ هەیە: هەموو خراپەکان بە باشی پێشان دەدرێن و هەموو باشەکانیش بە خراپی. کۆوارەکانی وەک ناشنەڵ جیۆگرافیک و تەواوی میدیای گشتی کە نوێنەرایەتیی ئەمەریکای باکور و ئەورووپای رۆئاوا دەکەن نوێنەرایەتی ناکەن، بگرە پێشان دەدەن: ئەوانە واقیع دروست دەکەن، کاری ئەندازیاریی

بۆ دەکــەن و بەرهــەمی دێنن. لە ڕێگەی ئەم جــۆرە گــێــڕانەوە و تۆمــار و چوارچێوە وێنەییانەوە، بۆچوون، ڕەنگ، هەڵوەستە و تا دوایی، بۆشاییەک وێنە دەکــەن کــە "غــەیرە ڕۆئاواییــیــە" بۆ ئەوەی باڵادەســتــیی ڕۆئاوا زەق بکەنــەوە. بەرهەمــهێنانی ئیتنۆگرافیی غــەیرە ڕۆئاوا بنچــینەی بیرۆکــە و ئەندازیاریی ڕۆئاوایە. ناشنەڵ جیــۆگرافیک ئاوێنەی "ئەوان"ی ترە، چونکە ئەگەر ئەوانی تر بەم شێوەیە دەربکەون، ئەوا ڕۆئاوا زیاتر باوەڕی بەخودی خۆی دەبێ. ئەگەر نکووڵی لە هاوێنە ئیتنۆگرافییەکانی ڕۆئاوا بکەی، ئەوا بەرەو نەمــان دەچێ، چونکە هیــچــیان نییــە پێشــانی بدەن، گــۆشــەکــان ئاوەژوون. بەهاری عەرەبی بریتییە لە لادانی ئەو ئاوێنەیە، کۆتاییی کۆواری ناشنەڵ جیۆگرافیکە.

## ئەنسرۆپۆلۆجی و کۆلۆنیالیزم

ئەوەی لە کەیسی ناشنەڵ جیۆگرافیک بەدیمان کرد تەنیا وێنەیەکی گشتییە بۆ پرۆژەیەکی ئەنسرۆپۆلۆجیی قووڵ وەک بنەمــا. لینکی نێوان دەســەڵاتی کۆلۆنیــال و جەماوەری داگیرکراو، وەک بەرگی نووسیارکراوی تەلاڵ ئەسەد بەناوی ئەنسرۆپۆلۆجی و دژە کۆلۆنیــال (١٩٧٣)، پێشانی دابوو لە سەرەتای حەفتاکان. ئەم کارە گرینگە بۆیە دەبێ هۆشیارانە تەماشای بکەین:

> چیرۆکی ئەنســرۆپۆلۆجــی و کۆلۆنیــالیزم بەشێکە لە چیرۆکێکی گەورەتر کە دەوڵەمــەندە بە کارەکتــەر و حــاڵەت بەڵام گرێیــەکەی ســادەیە. کــاتێ ئەورووپا دنیــای داگــیــر کــرد و حــوکــمی کــرد، خــەڵکەکەی چوونە دەرەوە تا تێکەڵ بن لەگــەڵ گەلان و شــوێنەیلی تر. بــازرگــان، ســەرباز، مــژدەبــەران، بیناســاز و بەڕێوەبــەرانی ئەورووپی، هــەمــوویان لەگــەڵ دەســەڵاتی ئەوانــەی لە وڵات مــانەوە، یارمــەتیی گواســتنەوەی بابەتە غــەیرە ئەورووپیــیــەکانیان کــرد، تا ڕادەیەک توندوتیژ بوون لە ئاراستە مۆدێرنەکەیان... (چیرۆکەکە)

باسی بالادەستیی داگیرکاریی ئەورووپی دەکا، وەک چەوسێنەرێکی کاتیی خەڵک نا، بگرە وەک پرۆسەیەکی بێدەنگی گۆڕینێکی رەگ و ریشەیی، تێیدا ئارەزووە کۆنەکان و رێگەکانی ژیان تێکوپێک دران و هی نوێ شوێنیانی گرتەوە.... ئا لەو جیهانەدا بوو ئەنسرۆپۆلۆجی پەیدا بوو و وەک بنەمایەکی ئەکادیمی گەشەی کرد. ئەنسرۆپۆلۆجییەکان، یەکەم جار یارمەتیی پۆلێنکردنی مرۆڤایەتیی غەیرە ئەورووپییان دەدا لە رێگەی گێڕانەوەی چیرۆکەیلی سەرکەوتن و پێشکەوتنی ئەورووپا، پاشان لە ئەورووپا چوونە دەرەوە و لە وڵاتە ژێردەستەکان گیرسانەوە تا لە نزیکەوە سەرنج بدەنە کۆمەڵگە غەیرە ئەورووپییەکان و وەسفیان بکەن، بەشداری بکەن لە بۆنە کولتوورییە نەریتییەکان یان رەوتیان بەرەو گۆڕانی کۆمەڵایەتی. ئەمڕۆ هیچ خەوشێک لە پێشنیازی ئەوەدا نییە کەوا مەعریفەی ئەنسرۆپۆلۆجی بەشێک بووە لە فراوانبوونی دەسەڵاتی ئەورووپا، هەرچەندە رێککەوتنێکی گشتی هەیە کەوا ئاکامەیلی وردی ئەو قسە ئازایانەیە دەبێ روون بکرێتەوە... ئەگەر رۆڵی ئەنسرۆپۆلۆجی بۆ کۆلۆنیالیزم گرینگ نەبووبێ، پێچەوانەکەشی راست نییە. پرۆسەی دەسەڵاتی ئەورووپیی جیهانی سەنتەر بووە بۆ ئەرکی ئەنسرۆپۆلۆجیی تۆمارکردن و شرۆڤەکردنی رێگەکانی ژیانی دانیشتوان، هەتا ئەو کاتانەی ئەو دەسەڵاتە پشتگوێ خراوە، یان حسێبی بۆ نەکراوە. هەر تەنیا دەسەڵاتی داگیرکاریی ئەورووپا نەبوو ئاسانکاریی بۆ چوارچێوەی کاری ئەنسرۆپۆلۆجی کرد (هەرچەندە ئەم خاڵە بەناوبانگە شایەنی ئەوەیە بەزاراوەی جوانتر و ئەخلاقی تر باسی لێوە بکرێ)، بگرە ئەو راستییە بوو کەوا دەسەڵاتی ئەورووپی، وەک قسە و کردە،

هەردەم بەشێک بوو لە واقیعی ئەو ئەنسرۆپۆلۆجیستانەی دەیانویست تێ بگەن، هەروەها بەشێک بووە لەو ڕێگەیەی دەیانویست تێ بگەن.

ئەو "گۆڕان"ەی تەلاڵ ئەسەد باسی دەکا کارێکی بنەڕەتییە بەهۆیەوە غەیرە ئەوروپییەکان بوونەتە مرۆی نامۆ. بەواتایەکی تر، ئەوانە کران بە مرۆڤ تەنیا وەک شتگەلێک بۆ بابەت و لێکۆڵینەوەی ئەنسرۆپۆلۆجیی بالادەستیی داگیرکاران. بۆیە هەر تەنیا "ئارەزووە کۆنەکان و ڕێگەکانی ژیان" نییە تێکوپێک دراون و هی نوێ هاتوونەتە شوێنیان و تەواوی جیهان، هەروەها هۆشیاریی ئەو جیهانە، تێیدا ئەو ئارەزوو و ڕێگەیانەی ژیانی تێدایە، لەسەر نەخشەی زەوی سڕانەوە. بتەوێ و نەتەوێ، ئەم پرۆسەیە تا ڕادەیەک نادیارە و کەس نایبینێ، بەلام خاڵێکە پێویستی بە تێڕامانە لەوەی ئاخۆ ئەو دەسەلاتە داگیرکارە مێژووییەی سڕینەوەی ناسنامە و شتەکانی تر لە جیهان دەتوانێ ئاوەژوو بکرێتەوە، ئاخۆ ڕێی تێ دەچێ جیهانە کۆنەکان بگەڕێنەوە سەر باری پێشووی خۆیان. ئەسەد تەواو بۆی چووە و دەڵێ "هەر لەم جیهانەدا بوو کەوا ئەنسرۆپۆلۆجی پەیدا بوو و وەک بنەمایەکی ئەکادیمی گەشەی کرد." مەبەست لەو جیهانەی ئەسەد واتە جیهانی داگیرکاری، ئەو جیهانەی خۆی خۆی نووسیوەتەوە و باسی خۆی و ئەوانەی کردووە کە داگیری کردوون. پۆلێنکردنی ئەنسرۆپۆلۆجیی جیهانی غەیرە ئەوروپی داهێنانی جیهانی غەیرە ئەوروپی بوو، کە پێش ئەوروپای مۆدێرن و پێش هەسارەی داگیرکراو بوو. ئەو جیهانەی کە ئەنسرۆپۆلۆجی دایهێنا، بەردەوامیشە لە سەرانسەری جیهان لە داهێنانی، نەک تەنیا لەلایەن نەوەی نوێی ئەنسرۆپۆلۆجیستەکان، بگرە داهێنرا لەلایەن جیهانی بالادەستیی ئەنسرۆپۆلۆجیستە سپییەکان. گرینگە ئەوەمان لە بیر بێ کەوا حاڵەتەکە هەر ئەوە نییە ئەنسرۆپۆلۆجی هەر تەنیا جیهانی هەنووکەی پۆلێن کردبێ. ئەنسرۆپۆلۆجیستەکان جیهانێکیان داهێنا، لە ڕێگەی نەهێشتن و

سڕینەوەی ئەو نەخشەیەی بەرەنگاری داگیرکاران دەبووەوە، ئەم وڵاتانە بەهۆی ئەو داهێنانەوە، ملکەچی نەخشە نوێیەکە بوون. ئەسەد دەگاتە خاڵێک بەزەییی بە شتەکاندا دێتەوە و پێشنیاز دەکا: "ئەگەر ڕۆڵی ئەنسرۆپۆلۆجی بۆ داگیرکاری گرینگ نەبوو، ئەوا پێچەوانەکەشی ڕاست نییە." بەڵام ئەم خاڵە هەر تەنیا پشت نابەستێ بە پێوەندیی نێوان ئەنسرۆپۆلۆجی و کۆلۆنیالیزم. ئێمە وا دیاردەی پۆستکۆلۆنیالیتی بەجێ دێڵین، بۆیە ئەوەی ئەمڕۆ بۆ ئێمە گرینگە ڕۆڵی سەرەکیی ئەنسرۆپۆلۆجی لە ڕەشکردنەوە، بوون و بەرگەگرتنی جیهانە غەیرە ئەورووپییەکانە لە هەمان کاتدا هەر ئەنسرۆپۆلۆجییە ئەوە ئاشکرا دەکا کە کۆلۆنیالیزم ئەوانەی ئەو جیهانانەی داگیر کردووە. بەواتایەکی تر، ئەنسرۆپۆلۆجی، ئالیەتێک بوو لە داگیرکاریی ئەورووپا بۆ چەندان وڵات، وەک سەربازێکی بە چەک وابوو. خامەی ئەنسرۆپۆلۆجی بەهێزتر بوو لە شمشێری ئەفسەرانی داگیرکار، هەر واش دەمێنێتەوە.

خێرا دوای لێکۆڵینەوە ئەنسرۆپۆلۆجییەکەی تەلاڵ ئەسەد لەسەر دروستکردنی ئێتنۆگرافیای ئەوانی تر لە ڕێی پرۆژەیەکی کۆلۆنیالی کەوا ئێدوارد سەعید لە کتێبەکەی بەناوی (ئۆریەنتالیزم، ١٩٧٨) لە شێوازی نەریتیی پێشاندانی ئەدەب و زاراوەی سیاسی (ئۆریەنت)ی کۆڵییەوە. (ئۆریەنت)، لە تەلاڵەوە تا ئێدوارد سەعید، دیاردەیەکی جوگرافی بووە، هەر واش دەمێنێتەوە، لە دژی جیهانی ڕۆژئاوا هاتە کایەوە، هەر لە کۆنەوە، بۆ چاخی ناوەڕاست، دواتر هەر بەکار هێنرا و تا ئێستەش هەر بەردەوام دێتە بەکارهێنان. دیاردە جوگرافییەکە ئەو کاتە گەردوونێکی خەیاڵی بوو کەوا ڕۆژئاوا دروستی کرد، دواتر وردە وردە زاراوەی "ڕۆژئاوا" لە بریی بەکار هێنرا. لە دیزاینی جوگرافیاییدا، دروستکردنی هەردوو زاراوەی "ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا" دوو گەردوونی ئەخلاقی دژ بەیەکن، ئەمەش کارێکە ڕاستییەکی نامۆ ئاشکرا دەکا کەوا "ئۆریەنت" هیچ جێگە و پێگەیەکی نەبووە، وەک

تارمـــاییـیــەک وابووە، هەمــوو ئەمــانە ئامــاژەن بەوەی (ئۆریەنت) واتە لە دەرەوەی واقیعە: ناواقیعییە و فڕی لە دنیاوە نییە.

ئێدوارد سەعید دواتر پشتگیریی رەخنە ئەنسرۆپۆلۆجییەکەی تەلال سەعیدی کرد، زیاتر لە وتارێکی راستەوخۆ بەناوی "پێشاندانی داگیرکراوان: پێناوەکانی ئەنسرۆپۆلۆجی" (١٩٨٩). لە کۆتاییی نەوەتەکاندا، تەواو روون بوو کەوا بنەمایەکی کۆلۆنیالیی ئەنسرۆپۆلۆجی هەردەم ئەنسرۆپۆلۆجیی گەلانی تر بووە، کە ئەم راستییە دواجار بووە هەوێنی وتارێکی سەرنج راکێش، "بەشەکانی ئەنسرۆپۆلۆجیای ولاتە یەکگرتووەکـــان" (٢٠٠٧)، لەلایەن نیکۆلاس دو جـــینۆڤـــا، کـــە ئەنسرۆپۆلۆجیستێکی یاخییە و دەڵێ:

> سەرەتا، لەبەر ئەو غیابە لێڵ و ناوازەدا، دەبێ راشکاوانە درک بەوە بکەین کەوا هیچ گرەنتییەک لە ئەنسرۆپۆلۆجیی ولاتە یەکگرتووەکاندا نییە (تەنانەت گرەنتییەک رەخنەییش بێ کە من باسم کردووە)، لەوانەیە ئەمە بەقسەیەکی لۆجیکی بێ.

ئەرکی سەرەکیی ئەم بنەمایە تازە ئاشکرا کرا کە هەر تەنیا دروستکردنی جیهانێک نییە بۆ ئەنسرۆپۆلۆجیست بۆ زانین و بلاوکردنەوەی پرۆژەکانی داگیرکاران، بگرە ئەو ئەگەری ئەوەش هەیە کەوا چاوێکی ئەنسرۆپۆلۆجییانە بە ماڵەوەدا بخشێنرێتەوە. ئەوەی ئەنسرۆپۆلۆجی قەدەخەی کرد، چاودێریکردنی چاودێران بوو، چونکە ئەگەر ئەو چاوەی پێدا بخشێنرێتەوە، ئەوا تەواوی ئاماژەکان، وەک ئەو چەکەی داگیرکاران روویان پێ لە خەڵکی کردووە، تەواو پێچەوانە دەبوونەوە، ئەو کاتە تەقە لە داگیرکارە ئەنسرۆپۆلۆجیستەکان دەکرا، وەک بڵێی هەمان ئەو ئەنسرۆپۆلۆجیستەی دیراسەی "مرۆڤخواردن"ی دەکرد، ئێستە بەهاراتی پێدا کراوە، رێک خراوە و بەکار براوە.

ئەوەی ئێمە دەیبینین لە بەهاری عەرەبیدا دەکرێتەوە رزگاربوونێکی مەعریفییە لە جوگرافیایەکی کۆن، بالادەست، نامرۆڤانە و داگیرکارانە، ئەو جوگرافیایەی ئەنسرۆپۆلۆجیستەکان نەخشیان کێشاوە بۆ داگیرکاران تا حوکمی تێدا بکەن. بەهۆی گرتنی بازنەیەکی گشتیی جیهانی و گێڕانەوەی ئاژانسی مێژوویی، دواجار جیهان وەک هەسارەیەک دەرکەوت، نەک دووانەیەکی میتافیزیکیی شەڕانگێزی رۆئاوا - رۆهەلات. بەلام ئەو دەرکەوتن و دۆزینەوەیە هەردەم دوا دەخرا لەلایەن دەسەلاتی جوگرافیا کۆنەکە کە رەتی دەکاتەوە واز لە سیفەتە دڕدۆنگەکانی بێنێ.

لەوەتەی ساتەوەخت چەسپینی ئەنسرۆپۆلۆجی وەک بنەمایەک تا دەرکەوتنی تۆماس فریدمان، دەستوورێکی بنەمایی دڕندانەی سەرەتایی دەبینین، هەموویان لە گەڕانن بەدوای مرۆڤایەتی بەتێڕوانینی پیاوی سپیی ئەوروپای مۆدێرن وەک تاکە چارەنووسی ئەو دۆخە. پرۆژەکە تەواو هیگیلییە، چونکە مێژووی هیگل و ناپلیۆن بوونەتە چەقی گێڕانەوەی مێژوو. ئەم بیرۆکە هیگلییەی مێژوو ئاماژەیە بەمێژووی جیهانی پێش مۆدێرن و جوگرافیای جیهانی غەیرە ئەوروپی وەک دوو رەوتی هاوتەریبی ئەقل و پێشکەوتن کە پێکەوە هاتوون بیرۆکەی "ئەوروپا" وەک دوا وێستگەی مێژوویان دروست کردووە: هەمان مێژوو کەوا هیگل لە ئەوروپا لە ۱۸۰٦ دەستی پێ کرد (ئەو دەمەی ناپلیۆن شەڕی جینا - ئورستدتی بردەوە و هیگل وای زانی روحی جیهانی لەسەر ئەسپدا بینیوە) و فوکویاما کۆتاییەکەی لە واشنتۆن لە ۱۹۸۹دا راگەیاند (ئەو دەمەی جۆرج دەبلیو بوش سیستمێکی نوێی جیهانیی راگەیاند). دیاردەی کۆلۆنیالیزم، لە راستیشدا، دۆخی کۆلۆنیالیتی هەردووک رەوتی کوێرانەن و چارەسەری ئاکیلەس بۆ بیرۆکەی مێژوو، کە تەنیا بنەمای مێژووی پێوە بەند نییە، بگرە تەواوی زانستە کۆمەلایەتییەکان و بنەما مرۆییەکانی لەسەرە. لەو سۆنگەیەوە دەبینی کەوا ئەنسرۆپۆلۆجی شتێکە تۆ بەرامبەر ئەوانی تر

دەیکەی و سۆشیۆلۆجی شتێکە کەوا تۆ بۆ خۆتی دەکەی. بنەمای سۆشیۆلۆجی، لە ئۆگست کۆمت (١٧٩٨-١٨٥٧) بەولاوە، هەر تەنیا دیراسەی کۆمەڵگەی ئەوروپی نییە، بگرە دایدەهێنێ، لە رێگەی خۆبەدوورگرتنی کۆمەڵگە لە کۆمەڵگە بچووکەکانی هەردوو جیهانی پێش مۆدێرن و جیهانی غەیرە ئەوروپی. ئەو جیهانە ناوی کۆمەڵگەی نەخراوەتە پاڵ، یان ئەوەتا هاریکاریی میکانیکی کۆمەڵگەی بچووکە لە چاوی هاریکاریی ئۆرگانی کۆمەڵگەی ئەوروپی، یان مرۆڤی سەرەتاییی ئەنسرۆپۆلۆجیی رۆژئاوایە.

لەوانەیە ئەوروپا بەڕاستی، وەک فانن گوتی، دروستکەری جیهانی سێیەمە. بەڵام ئەمە دوای ئەوە هات کە ئەوروپا جیهانی سێیەمی دانابوو: ئەم دووەش هەرگیز بەیەکتر نەگەیشتن.

## نەخشە جێگرەوەکانی جیهان

قسەی من ئەوەیە دەسپێکی بەهاری عەرەبی ساتی دەستپێکردنی هەر تەنیا مێژوویەکی نوێ نییە، بگرە، لەوەش گرینگتر، خەیاڵێکی رزگاریخوازیی جوگرافییە کە لە هیچ شوێن و کونێکەوە سەری هەڵنەداوە. هەردەم فرە جیهانی هەبووە. پێچەوانەی پرۆژە وێرانکردنی جیهان لەلایەن ئەنسرۆپۆلۆجی و ئۆریانتالیزم، هەردەم رەوتی جێگرەوە هەبووە بۆ دووبارە بیرکردنەوە لە جیهانێک کە جوگرافیای جیاواز بێ. خۆزێ مارتی (١٨٥٣-١٨٩٥)، بۆ نموونە، لە وتارەکەی بەناوی "ئەمەریکامان" (١٨٩٢)، باسی بوونی جیهانێک دەکا تەواو جیاوازە لە "جیهانی رۆژئاوا" لەژێر تا باڵادەستیی داگیرکاریی وڵاتە یەکگرتووەکان، هەروەها لە رێگەی فراوانکردنی رۆژئاوا. شەڕی لە دژی داگیرکاریی ئیسپانی، مارتی باش دەیزانی کەوا هێزی داگیرکاریی داهاتوو تاکە باڵادەستیی ئەمەریکا دەبێ، بۆیە بیرۆکەیەکی جیاوازی "ئەمەریکامان" پێشان دەدا.

نموونەیەکی تر ئەمێریکۆ کاسترۆیە (١٨٨٥-١٩٧٢)، مێژوونووسێکی ناسراوی ئیسپانیا، کە لە کتێبەکەی بەناوی "ئیسپانییەکان: پێشەکییەک بۆ مێژوویان، ١٩٤٨"، نیشتمانەکەی بردە دەرەوەی چوارچێوەی ئەورووپا و باسی جیهانێکی تەواو جیاوازی کرد کەوا ئیسلام و یەهودییەت بە قەد مەسیحییەت گرینگ دەبن. دەیویست ئەوە پێشان بدا کەوا مێژوو و کولتووری دوورگەی ئیبیریان بەتەواوی وەک بیرۆکەی ئەورووپا نییە. دروستکردنی سێ نەریتی داهاتوو، ئیسلامی، مەسیحی و یەهودی، هەر لە سەدەی نۆیەمەوە کارمکتەرێکی بێوێنەی لەسەر ئیسپانیا هەبووە. دروستکردنی بیرۆکەی ئیسپانییەکان دەستەبەر کرا لەسەر حسێبی توندوتیژییەکی گەورە بەرامبەر ئەو سێ هێزە دروستکراوە. کاسترۆ بەدوای ئەوەدا دەگەڕا شوێنی ئەفسانەی ئیسپانی - ئەورووپی بگرێتەوە بەبیرۆکەیەکی دڵسۆزانەتر و باشتری ئیسپانیا لەسەر خودی خۆی. چەندان نموونە هەن کە هی زۆر پێش ئەو کاتەن. بۆ نموونە، ئیبن خەلدون (١٣٣٢ - ١٤٠٦)، کە لە کتێبەکەی بەناوی (ئەلموقەدیمە) باسی تەشتی دەریای ناوەڕاست دەکا وەک یەکەیەکی گەردوونیی شارستانییە. یەکێکی تر ئەلبیرونییە (٩٧٣-١٠٤٨)، کە لە کتێبەکەی بەناوی "هیندستان" باسی تێڕوانینی جیهانێک دەکا تێیدا ئیسلام، کەلەپووری یۆنانی، کولتووری هیندو رەوتی مێژووی جیهانیی ئیمپراتۆری خەزنەوییەکانن. نموونەی سەردەمی نوێ ئەمانەن: ئیتینە بالیبارس، لە کتێبەکەی بەناوی گەلی ئەورووپا، رەنگدانەوەکان لە هاوولاتیی نیشتمانبڕ (٢٠٠٣)، هەروەها سێلا بن حەبیب لە کتێبەکەی بەناوی کۆزمۆپۆلیتانیزمێکی تر (٢٠٠٨)، هەردوویان رێگەی جێگرەوەی داڕشتنەوەی نەخشەی جیهانن.

زۆر پێویستە ئاگەداری ئەوە بین کەوا ئەمانە و جێگرەوەکانی تری نەخشە بە شێوازێکی دانسقە زێدەڕۆییان تێدا کراوە. دەستووری ئیتنی وەک ساتێکی پێناسەکردنی نەتەوەکان، دۆخ و کولتوورەکان جیهان دەخاتە نێو

ئایدیۆلۆجیا دژەکانن کارەساتبارترین دەربڕینی ئەوروپی، وەک هۆلۆکۆستی جوولەکە، کە دوایەمین وەرگێڕانی زاراوەی تیرۆرە لە دەستی کۆلۆنیالی جینۆسایدی رواندا لە ١٩٩٤. لە پەیدابوونی جیهانێک لەم جیهانەدا، کە دارماوە لە وەهمە بۆماوەییەکانی، بالادەستیی ئیتنی بەپێناسەی ئیتنیی ناشنالیزم و جیهانی دابەشکراو شوێنی دەگرێتەوە بە کولتوورێکی هۆشیاریی گشتیی ناسکیی ئەم جیهانە.

کۆچی زیاتری کرێکاران لە سەرانسەری جیهان ساتێکی گرینگی ئەم جوگرافیا نوێیەیە، لەبەرئەوەی هەموو سنووره جوگرافییەکان کاریگەریی کراوەی پێویستیی ئابوورییان لەسەرە. دیدی ئەوروپایەکی رەش بەشێک لەو شتانەیە کە ستەمکارێتی وەک موعەممەر قەزافی هەر لە دەسەلات دەهێڵێتەوە (سێف ئیسلامی کوڕی نوشداریی دا ئەوروپا کەوا ئەفریقییەکان لە لامپەدوسا دەبن ئەگەر بێتو خۆی و باوکی ولات بەجێ بێڵن). ئەم گۆڕانە کیشوەرییانە ماوەی نیو سەدە زیاترە هەر لە دروستبووندان، بەڕێژەیەکی ئێجگار خێرا، ئەمە مەرجدارە بەهۆی خولانەوەی کرێکار و بەدوای یەک کەوتنی سەرمایەکان. هەروەها ئەم کۆچە بەکۆمەڵە ئاکامەیلی زیاتری لێ دەکەوێتەوە. لە ئەوروپا ئیسلامۆفۆبیا تازەترین مانیفێستۆی زینۆفۆبیا (رکبوونەوە لە بێگانە)یە کەوا یەک دەگرنەوە لەگەڵ ماوەی کۆچی بەکۆمەڵ.

پێویستیی جەختکراوەی زاڵبوونی کولتوور بەسەر ئیتنی دووپات کراوەتەوە لەلایەن کارەساتە ژینگەییەکانی بەم دواییانە لە کەنداوی مەکسیکەوە تا دەریای ژاپۆن، ئاکامی بەرچاوی جیهانی لێ دەکەوێتەوە. ئاوی ئاوێتەی رادیۆئاکتیڤ لە زەمینلەرزەی تێکدەری پێگەی ئەتۆمی رژاوەتە ناو زەریای هادی، سەلمێنراوە کەوا هەور لە چینەوە تا کەناری رۆئاوای ئەمەریکا پیس بووە. کاردانەوەی زنجیرەی ئەتۆمی و ئاکامە ترسناکەکانی ژینگەیی هیچ سنوورێکی ئیتنی ناناسێ، هەروەها بیرکردنەوە لە چۆنیەتیی وەستانەوە لە دژی ئەم رووداوانە کێشەیەکی ئەخلاقییە نەک ئیتنی.

لەبەرئەوەی کۆچی کرێکاران و کارەساتی ژینگەیی دوو فاکتەری سەرەکین کەوا جوگرافیای ئێستە دەگۆڕن، ئێمە نەخشەیەکی ئەخلاقی دروست دەکەین کە لە داهاتوو تووشی دەبین. بیرۆکەی بەهاری عەرەبی دەبێ ڕووبەڕووی ئەو هێزانە بکرێنەوە کە ڕووبەڕووی مرۆڤایەتی دەبنەوە، ئەوان دەبێ زیاتر بیری لێ بکەنەوە.

جوگرافیای ئازاد بە خەباتی گەلان دەست پێ دەکا بۆ نان و شکۆمەندی، لەوێوە، نەخشەی ئەخلاقیی جیهان دروست دەبێ بۆ لەخۆگرتنی هەسارەیەکی ناسک. لەسەر ئەم نەخشەیەدا، نە ڕۆژهەلات هەیە، نە ڕۆژئاوا، نە باشوور، نە باکور، تژییە لە ئەقلانیەتی ئایدیۆلۆجی، هەریەکە و لە دژی ئەوی تر. کاتێ وشەیەک/جیهانێک (ڕۆژئاوا) گرێ دەدرێ بە ئەقڵ و پێشکەوتن، ساتەکانی شێتبوون و تەقینەوە پەرت دەبن تا ڕووتی بکاتەوە لە هەر هیوایەکی رزگاربوون. ئیتنۆگرافیا و مۆزەکانی ئیتنۆگرافیا هەن لەناو پێکهاتەیەک تێیدا ئەورووپا چاودێری دەکا و غەیرە ئەورووپییەکان چاودێری دەکرێن. ئەمەش ئەورووپا هەر تەنیا لە دەرەوەی مێژوو دانانێ، بگرە لە دەرەوەی جوگرافیاش دایدەنێ. لەسەر ئەم نەخشە ئیتنۆگرافییەی جیهان ئەورووپا زۆر بە ڕوونی دیارە، ئەمە وەهمێکە کە خۆی دەبینێ و کەسیش نایبینێ، دەبێتە بابەتی گرینگی ئیتنۆگرافی، ئەرشیف دەکرێ، لە مۆزەکان هەڵدەگیرێ. بەهۆی نکووڵیکردن لە غەیرە ئەورووپی بۆ بەرژەوەندیی ئەورووپا، بەهۆی دزین لە ئاوێنەی "ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوایی" تێیدا ڕۆژئاوا خۆی دەبینێ، جیهانە دروستکراوەکان ئەورووپا بۆ خودی خۆی دەگێڕنەوە، بۆ مادییەتەکەی، تاکو بتوانێ لە مۆزەکان هەڵبێن، وەک پاسەوان، نەک وەک پاسەوانی لێکراو، پاشان لەبەرئەوەی پاسەوان و پاسەوانیکراو دەگەڕێنەوە بۆ جیهان، یانیش ئەوەتا هەردوویان جیهانە تازەکان لە ئامێز دەگرن.

ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا، ئۆریەنت و ئۆکسیدنت، زیاتر لە دوو سەدەیە تارمایی یەکتر بوونە، لەوەتەی داهێنانی "ڕۆژئاوا"، بەکورتی "شارستانیەتی ڕۆژئاوا"،

له دوای شۆڕشی فرەنسیی ۱۷۸۹، كه پێدا پێدا شوێنی مەسیحییەت دەگرێتەوە، ئەمەش واته سیاقێكی پۆلێنكراوی بنەماڵه ئەوروپییەكان لەوەتەی كەوتنی ڕۆما له ٤٧٦ی پاش زایین. داهێنانی ڕۆژئاوا و هەموو شارستانییەكانی تر (هیندی، ئیسلامی، چینی و... تاد) بەهۆی كارەكانی ئۆریەنتالیستەكان، كه له جیهاندا بڵاو بوونەوە، هێنده سەركەوتوو بوو، زۆر باش مێژوویان داگیر كرد، چوونەوە پێش سەردەمی نەمری، تا ڕۆژئاوا بكەن بەپێوەری ڕاستی و سەنتەرێكی ئەخلاقیی گەردوون. "ڕۆژئاوا" له ڕاستیدا خۆی به پێگەیەكی جوگرافیی مەسیحییەتێكی شاراوە دەزانێ (وا پێشان دەدا) ویستی ڕەحم به جیهان بكا و هەڵی گرێ بۆ دووەم هاتنەوەی حەزرەتی مەسیح. داهێنانی "ڕۆژئاوا" وەك پێگەیەكی شاراوەی مەسیحییەت هاوكات بوو لەگەڵ داگیركاریی جیهان. له داگیركردنی سیوتا لەلایەن پورتوگالەوە له ١٤١٥ تا داگیركردنی میسر له ١٧٩٨ لەلایەن ناپلیۆن، تا داگیركردنی جەزائیر له ١٨٣٠ لەلایەن فرەنسییەكان، لەوێشەوە تا دەست بەسەرداگرتنی كۆمپانیای هیندستانی ڕۆژئاوا له ١٨٥٨ لەلایەن بەریتانییەكان، داگیركردنی ئەمەریكایەكان، ئاسیا و دواتر ئەفریقیا لەلایەن ئەوروپییەكان هاوكات بوون لەگەڵ دروستكردنی "ڕۆژئاوا" بەشێوەیەكی سیستماتیكی وەك جیهانێكی باڵادەست كه خۆری هەموو ئەوانەی كوژاندەوە كه داگیری كردن. ئەمڕۆكه، ئازادبوونی ئەو وڵاتانه لەژێر دەستی ئەو مێژووە داخراوە دەسكردە هەر تەنیا ڕزگاریان ناكا لەژێر چەپۆكی ڕێژیمە داینەسوورەكان كه حوكمیان دەكەن، بگرە، لەوەش گرینگتر، ئازاد دەبن له جوگرافیای بێهیوایی تەڵەئاسا، كەوا بەردەوام خۆری ڕۆژهەڵاتی داپۆشیبوو و وایان لێ كرد بەزۆری له ڕۆژئاوا هەڵبێ. خۆرە نوێیەكە نه له ڕۆژئاوا و نه له ڕۆژهەڵات، نه له باشوور، نه باكور هەڵدێ، ئەگەر له جیهانێكی تەخت و ڕەوا نەبێ، ئەوا دەبێتە خەیاڵ و ئەخلاقییەن تەواو نابێ. خۆرە نوێیەكە، له جیهانیبوونی درەوشاوەی هەسارەی زەوی دەڕوانێ، ڕێك و

نەبەردان دەوەستێ، بە هێزێکی موگناتیسی لە ناوەندی گەردوون دەوەستێ. نە هەڵدێ و نە ئاوا دەبێ. تەنیا لەوێ دەمێنێتەوە، تەماشا دەکا، لە زەوییەکی ناسک کار دەکا و بەردەوام بەدەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە، خەیاڵی پێچەوانەکەی خۆی دەکا لە چیاکان و دۆڵەکان، لە رووبار و زەریاکان، دەریاچەکان و شوێنە سروشتییە جوانەکان هەڵبێ. لەبارەی ئەو دیمەنە جوانەوە، کە ئێستە کازیوەی کوژاوەتەوە، باراک ئۆباما ناتوانێ چارەنووسی منداڵانی ستەم لێکراو و هەزار لە سەرانسەری جیهاندا دیاری بکا، بەلام چارەنووسەکە بەچاوی خۆی دەبینێ، چارەنووسی ئەو منداڵانە وەک هەمان چارەنووسی منداڵانی خۆی دەبێ.

## سێیەم

## زمانێکی نوێی یاخیبوون

تا چ رادەیەک بیرۆکەی "شۆڕش" شیاوە لە خوێندنەوەی ڕاپەڕینەکانی ئێستەی جیهانی عەرەبی؟ ئاخۆ ئەو شۆڕشانە پێویستیان بە زمانێکی نوێ هەیە بۆ خوێندنەوەیان؟ زمانێک لەگەڵ دەسەڵاتی پێشەنگیان بسازێ، مانایان بزانێ.

کتێبەکەی هەنا ئارندت بەناوی "لەبارەی شۆڕش"ەوە (١٩٦٣)- کە دیراسەیەکی بەراوردکاریی شۆڕشی ئەمەریکییە (١٧٧٦) و فرەنسی (١٧٨٩)، هەردەم دەخوێنرێتەوە و شرۆڤە دەکرێ وەک قسەیەکی رەخنەیی لەبارەی بیرکردنەوەی مارکسەوە لەسەر شۆڕش لە رێگەی بەزمیی هاتنەوە ئەو شتەی ئەو پێی وایە سەرکەوتنی شۆڕشی ئەمەریکییە لە بەرامبەر فەشەلی شۆڕشی فرەنسی. رەخنەی ئارندت لە شۆڕشی فرەنسی ئەوەیە دۆخی ئاووریی خەڵکی فرەنسی شۆڕشگێڕەکانی لە رێی سەقامگیری یاسایی و مەرامی سیاسی لادا. ئەو پێداویستییە ئابوورییانە، ئەو پێی وایە، لە راستیدا قایلکەر نەبوون، بۆیە شۆڕشیان لە رێی راستیی مەرامی سیاسی ترازاند، لەگەڵ کرانەوەی گشتی بۆ بەشدارییەکی فراوانتر، کاریگەرتر و گشتگیرتری هاوولاتییان. ئارندت (١٩٠٦-١٩٧٥) هێندە رای لە شۆڕشی ئەمەریکاش نەبوو. پێی وابوو شۆڕشەکە لە چوارچێوەی گرێنتییە دەستوورییەکانی مافەیلی سیاسی دەرنەچوو، بەلام شتێک هێندە نابەجێ بوو کەوا زۆرینەی ئەمەریکییەکان بەشدار نەبوون لە پرۆسەی سیاسیدا.

نیگەرانیی سەرەکیی ئارندت پێشاندانی شیمانەی سیاسیی زۆرترین بەشداربوونی گشتی بوو، بێ لە ئاژاوەیەک کەوا ئەو تێکەڵی کرد لەگەڵ شۆڕش، ئەو شۆڕشانەی کە خۆیان بە دەستپێکردنەوەی مێژوو دەزانن. ئارندت دەڵێ بیرۆکەی مۆدێرنی شۆڕش وەک "مێژوو کتوپڕ نوێ دەبێتەوە" تەواو نادیار بوو پێش شۆڕشەیلی ئەمەریکی و فرەنسی. لە باتیان، جیاوازییەکی گرینگی کرد، لە خوێندنەوەی بۆ شۆڕش، لە نێوان سەربەستی (liberty) و ئازادی (freedom). ئەو دەڵێ سەربەستی بریتییە لە ئازادی لە پێوەدانگێکی نەسەلمێنراو، ئازادیش بریتییە لە توانای بەشداربوون لە کاروباری گشتی، ئەمە فراوانکردنێکی بەئەنقەستی بازنەی گشتییە بۆ بەشداریی سیاسی. شۆڕشەیلی ئەمەریکی و فرەنسی وەک نموونە وەرگرت، پێشنیازی ئەوەی کرد کەوا سەرەتا شۆڕشەکان هێزێک بوون بۆ گێڕانەوەی شتەکان بۆ باری پێشووی خۆیان، بەڵام لەو ناوەدا توندوتیژییەکی ڤایرۆسی رووی دا لە راپەڕینە شۆڕشئاساکە. ئەوە لە دوای شۆڕشی فەرەنسی بوو، ئەو پێی وایە، کەوا بیرۆکەی "شۆڕش" هەڵوێستی هاوچەرخ و رادیکال و بەرگەگرتنی وەرگرت. شۆڕشگێڕە فرەنسییەکان هەڵە بوون لە لەبیرکردنی، ئەو پێی وایە، ئەوەی کەوا ئەرکیان تەنیا سەربەستکردنی خەڵک لەژێر چەپۆکی چەوساندنەوە، بۆ ئەوەی بتوانن ئازادی بدۆزنەوە، هەروەها نەیانتوانی باسی هەژاری و دانسقەییی دۆخەکە بکەن. بۆ شۆڕشگێڕەکان باش و هاوکات مەترسیدار دەبوو بیریان لەوە کردباوە کەوا دەتوانن رێگەچارەیەکی سیاسی بۆ بێبەشبوونی ئابووری بدۆزنەوە. سوودی شۆڕشی ئەمەریکی، ئەو باوەڕی وایە، ئەوە بوو پرسەیلی ئابووریی لەبەر دەرگەی ئەنجوومەنی دەستووری بەجێ هێشت. لە بەشێکدا بەناونیشانی "سەربەستییەکانی دەستوور"، ئەو ستایشی شۆڕشگێڕە ئەمەریکییەکان دەکا بۆ کۆکبوونی گشتیان لەبارەی ئەوەی کەوا مەبەستی شۆڕش بۆ دەستووری ئازادی و دامەزراندنی سیستمێکی کۆمارییەوە بوو.

ئارندت پەلەی كردووە لە خوێندنەوەیەكی دژە ماركسییانە بۆ شۆڕش، زۆربەی قسەكانی لە جێی خۆیانن، تەنانەت دانسقەن، كاتێ تەماشایەكی كرانەوەی بەهاری عەرەبی دەكەین، ئەو قسانە بەجێن. لەلایەك باسی دووانەییەك دەكا كە هەوڵ دەدا بۆ گرێنتیی دەستووریی سەربەستییە مەدەنییەكان، ئازادبوون لە ستەمكاری، ئازادیی بەشداربوون لە كاری سیاسیی نیشتمان، لەلایەكی ترەوە، باسی ئەوە دەكا كەوا فاكتەرە گەورە، گشتگیر و ئابوورییەكان رۆڵیان نییە لە كاركردنە سەر ئەوانی تر ئەگەر بێتو ئەو شۆڕشانەی ئارندت بەراوردی كردن بخەینە چوارچێوەیەكی مێژووییەوە. شۆڕشی فرەنسی رێڕەوی گۆڕی بەرەو پرسی كۆمەڵایەتی، لەبەرئەوەی ناشۆڕشگێڕەكان دەیانویست، لەبەرئەوەی ململانەی چینەكان تەواو بەرچاو و ئۆرگانی بوو بۆ راپەڕینە شۆڕشئاساكان، هەروەها چینی كار قسەیەكیان هەبوو لەو پرسەدا. لە شۆڕشی ئەمەریكی ئەو پرسە كۆمەڵایەتییە هێشتا ئۆرگانی نەبوو بۆ راپەڕینەكان، فراوانییەكی ئێجگار زۆر، چینی كار هێندە پشتیان بەخۆیان نەدەبەست، هەروەها دەنگنەدانی كۆیلەكان لە بواری گشتی وای كرد تەواو بەشدار نەبن لە شۆڕشەكە. بۆیە لە بنەڕەتدا شۆڕشەكە گردبوونەوەی چەند پیاوێكی رۆشنبیر بوو، هاتن دۆكیومێنتێكی یاساییان نووسی، تێیدا سەربەخۆیی خۆیان پێناسە كرد بۆ دەسەڵاتی كۆلۆنیال و لەو ساتە بەدواوە بڕیاریان دا خۆیان حوكمی خۆیان بكەن. دوو سیاقی تەواو جیاواز هەبوو: یەكێكیان ئەورووپیی كۆن، ئەوەی تریان ئەمەریكیی نوێ بوو.

شۆڕشی فەڕەنسی هیچ ئیختیارێكی نەبوو، بۆیە ناچار بوو باسی پرسی چینایەتی (كۆمەڵایەتی) بكا، لە كاتێكدا شۆڕشی ئەمەریكی بەوپەڕی توانا هەوڵی خۆلادانی دا لەو پرسە. سیاقی دوای هۆلۆكۆست، دوای هیرۆشیما بۆ شۆڕش هێندەی ئەمانە گرینگە، تەواوی دیراسەكەی ئارندت نیگەرانییەكی پێوە دیارە. ئەمڕۆ، هەركە كرانەوەی بەهاری عەرەبی دەبینین،

دۆخـێکی ئابووریی تەواو جـیـاواز زاڵە بەسـەر هـەمـوو شـتـێکدا، کـاری تێکدەرانەی، ئابووریی نیـولیـبـرالەکـان، چاوچنۆکـیـیـەکی بێـوێنە، کـاری نابەرپرسیـارانە و نابەجێ، هـەموو ئـەمانـە وایان لە ئابووریی کینێسی کرد ببن بە ستراتیجییەکی بەرچاو بۆ مانەوە، بەڵام تەنیا بۆ ماوەیەکی کاتی.

ئەمـڕۆ، لەبەرئەوەی خـەباتـی چینـایەتی لە شـۆڕشـی فـەڕەنسی بووەتە دیاردەیەکی جیـهانی، ئەوانەی هـاتوونەتە ریزی شۆڕشەکانی عەرەبی راستن داوای باشـتـربـوونی دۆخی ئابـووری دەکـەن، لەبەرئەوەی کـاری سـەربازیی جیهـانی و نیولیبرالیزم و کاری نابـەجێ ئۆقرەی لە شـۆڕشگێڕان هەڵگرت. رۆشنبـیـرە پێـشـەنگەکـانی عـەرەب نـوشـداری دەدەن کـەوا باڵادەسـتـیی ئیـمـپـریالی ئەمـەریکی یان ئەوەتا پارمـەتیی سـەرانی عـەرەب دەدەن راپەڕینـەکـان سـەرکـوت بکا، یانیش هـاوکـاریی بەهـاری عـەرەبی دەکـەن تا نەتەوەکانی عەرەب لەسەر هێڵی ئەولەویاتی ئابووریی نیولیبرالەکان بپارێزێ و بهێڵێتەوە. "بڕیاردەرانی ئەمەریکا تا دێ زیاتر تێ دەگەن،" جۆزیف مەساد نوشـداریی دا، "کـەوا ئـەمـەریکا دەبێ شـەپۆلی دیموکـراتی لێ خـوڕێ لە ناوچەکەدا، لەو وڵاتانەی تێیدا ناتونێ شـەپۆلەکە هێور کاتەوە، بەم کارەشی، دەبێ مـەرجی سـیـاسـی دابنێ بۆ پاراسـتـنی کـاری نارەوای ئیـمـپـریالی ئابووریـیـان لە هـەمـان کـات دەبێ وەک پێشـتـر مـامـەڵەیان لەگەڵدا بکا نەک هەڕەشەیان لێ بکا. ئەو زیاتر ئەمە روون دەکاتەوە:

> پارەی سـعوودی، پارەی ئەمـەریکی و IMFی بەدواوەیە، هـەروەها بانکی جیـهانی پلان دادەنێ و تەمـویلی هـەموو بژاردە بزنسـەکان و رێکخـراوە ناحکوومـەتیـیـە بیـانییـەکـان دەکا بۆ تێکشـکاندنی کۆمەڵگە مـەدەنییـە تازەکە لە رێگەی بەکارهـێنانی هەمان زمـانی نیـولیـبـرالی پێکهـاتـەی کـۆسـازاندن کـە IMF (تەمـویلی پارەی نێودەوڵەتی) لە حەفتاکانەوە بەکاری دێنێ. راستییەکەی، ئۆباما و هـاوەڵە بزنـسـمـانەکـانی ئێـسـتـە بانگەشـەی ئەوە دەکـەن کەوا

سەپاندنی سیاسەتی زیاتری ئابووریی نیولیبرال تاکە داوای شۆڕشگێڕانە لە میسر و تونس، ئەگەر هەموو جیهانی عەرەبیش نەبێ، رۆژئاواش هەر ئەوەی پێ خۆشە. ئەمە هەمان ئەو سیاسەتە داگیرکارانەیە، کە لەلایەن IMF بەسەر پۆڵەندا سەپێنرا (هەروەها سۆلیدارنۆسکی بەرهەم هێنا لە ١٩٨٠)، دواجار بووە هۆی رووخانی یەکەتیی سۆڤیەت، لەبەرئەوەی بەرەو ئەوە هەنگاویان دەنا تەواوی جیهانی دووچاری هەژاری بکەن، بەتایبەتی ئەفریقیا، جیهانی عەرەبی و ئەمەریکای لاتین. لەم دیدەوە، ئەمەریکا دڵنیای دەکاتەوە کەوا هەمان سیاسەتی ئابووریی ئیمپریالی دەبێ لەلایەن سەرمایەی نێودەوڵەتی بێتە سەپاندن و لەلایەن موبارەک و بن عەلی بێنە جێبەجێکردن، ئەمە هەر تەنیا ئەوا ناپارێزێ، بگرە لەژێر پەردەی دیموکراسی بەهێزتریان دەکا.

بتەوێ و نەتەوێ، نیولیبرالیزمی بەجیهانیکراو بەڕاستی دەتوانێ ئەو سیاسەتانە جێبەجێ بکا، بەڵام ئەمە تەواو دەکەوێتە سەر هەستیارانی ناو بەهاری عەرەبی. پرسەیلی سیاسی و ئابووری شان بەشانی یەکترن، هەروەها بێ ئازادییە مەدەنییەکان یەکەتیی سەربەخۆی کرێکاران نابێ، رێکخراوەکانی مافەیلی ئافرەتان، یان گردبوونەوەی قوتابیان سەربەخۆ نابن. ئەمانە لە بەرامبەردا (هەر دەبێ بەتەواوی داواشی بکەن) داوای ئازادیی دەربڕین، ئازادیی چاپەمەنی و ئازادیی گردبوونەوەی ئاشتییانە دەکەن، هەموو ئەمانە پێویستن نەک هەر تەنیا بۆ گرێنتیی ئازادییە مەدەنییەکان، بگرە بۆ دامەزراندنی دەستەی خۆبەخشان بۆ پاراستنی تاک لە تۆتالیتاریانیزم، هەروەها بۆ پاراستنی چینی لاوازی کرێکاران لە دژی سەرمایەداریی مرۆڤخۆی نیولیبرال کە زۆر باش دەتوانن لەنێو ئەو یارییەدا گەوز بدەن. هەموو ئەم بۆچوونانە دەکرێ لە پێگەیەکی فراوانتری گشتیدا

بێنە دەربڕین، لەنێو بەشداریی سیستماتیکی و ڕێکیی سیاسییەوە قسەیان لەسەر بکرێ، هەروەک ئاندت پێشنیازی دەکا، چونکە بەڕاستی ئێمە ئەمەمان لە میسر بینی کاتێ میسرییەکان بە ملیۆن لە ناوەڕاستی جولای ٢٠١١دا گەڕانەوە گۆڕەپانی تەحریر دوای سەرکەوتنی شۆڕشەکەیان لە ناوەڕاستی فێبرووەری. کەواتە دەتوانین سوود لە دووانەییی ئارندت وەربگرین لە ڕێگەی پێشخستنی بۆچوون و بیرتیژییەکانی نەک بەهۆی ڕەحمکردن بە شۆڕشی فرەنسی لە دژی شۆڕشی ئەمەریکی، بگرە بەهۆی تێکەڵکردنی هەردووکیان.

## شۆڕشێکی کراوە

خوێندنەوەم بۆ بەهاری عەرەبی ئەم بیرۆکەیە دەخاتە ڕوو کەوا بەهارەکە شۆڕشێکە کۆتاییەکەی کراوەیە وەک ڕێگەیەک بۆ سازکردنی زەوینە بۆ بەکاربردنی ئەو زاراوانەی کە دەکرێ ئەو ڕووداوە گەورانەی پێ باس بکرێ، واتە خوێندنەوەی ڕووداوەکان وەک ڕۆمانێک بێ نەک داستانێک. هیچ پاڵەوانێکی نیشتمانی وەک جەواهیر نەهرۆ، جەمال عەبدولناسر یان محەمەد موسەدەق لەو شۆڕشانە دەرناکەوێ، ئەمە کارێکی خۆشبەختانەیە، چونکە لەژێر سایەی ئەو پاڵەوانانە بوو ستەمکارانی وەک موعەممەر قەزافی، حافز ئەسەد و ئایەتوڵڵا خومەینی گەشەیان کرد. بۆ بینینی ڕووداوەکان بە ڕاپەڕینی کۆتا-کراوە، پێویستە زمانی شۆڕشگێڕی نوێ شی بکەینەوە، بیرۆکە، هزر، ئارەزوو، خەیاڵ، بەم وشانە خەڵک باسی شۆڕشەکانیان دەکەن، تا ڕووداوەکان نەچنە پاڵ لێکدانەوەی بۆچوونە هەڵەکانی ئیسلامیزم، ناشنالیزم یان سۆشیالیزم، یان تەنانەت وەری بگێڕن بۆ سەر کێشە شەکەت و کۆنەکەی ئۆریەنتالیزم، وەک ئەوەی ئێمە تا ئێستە لەو چەمکانە گەیشتووین. ئەرکی ئێمە درککردنە بەساتی کرانەوەی ئەو ڕاپەڕینە شۆڕشئاسایانە و بتوانین بە زمانێک بیانخوێنینەوە کەوا ڕوونیان

بکەینەوە نەوەک بخنکێین لەناو ئەو وشانەی بۆمان ماوەتەوە. تەنانەت بیرۆکەی پیرۆزی "دیموکراسی" دەبێ ئێستە بێتەوە دارشتن، ئەگەر پێویستیشی کرد، دەبێ دابهێنرێتەوە. هیچ پاساوێک داواکراو نییە بۆ ئەم بۆچوونانە. جیهان گەلێ وڵاتی دیموکراتی هەیە، بەڵام لە ناوەوە و دەرەوەی ئەو وڵاتانە ئازار کەڵەکەی کردووە، هەروەها ئەو ئاشتی و خۆشگوزەرانییە ناسکەی هەندێ کەس تامی لێ دەکەن لەو دیموکراتییانە زیاتر دەکەوێتە سەر ئەو مەرجەی کە دەبێ ئەمانە لەسەر حسێبی ناخۆشیی ئەوانی تر بژین. بۆیە، وا دانێ ئەوەی لە تونس و میسر روو دەدا ئەو دیموکراسییەیە ئێمە دەیزانین لە ئەمەریکای باکور یان ئەورووپای رۆئاوا هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا لەو وڵاتانەدا هەژاری لە لووتکەیە، باشە ئەم دیموکراسییە سوودی چییە بۆ ملیۆنان خەڵکی هەژار؟ هیندستان بە نموونە وەرگرە: وشەی "دیموکراسی چ مانایەکی هەیە لە وڵاتێک تێیدا ٨٠٠ ملیۆن کەس کەمتر بە سێ سەنت بۆ یەک رۆژ دەژین؟ وەک زاراوەیەک، یان وەک بیرۆکە، دیموکراتی نابێ خەیاڵاوی بکرێ. ناوەندێکی سیاسییە بۆ بەرژەوەندی و باشیی گشتی، کە ناتوانێ، بەپێی پێناسەکەی، دادوەری ئابووری وەلا نێ. تەنانەت ئادە سمیش، باپیرەی سەرمایەداری، لە کتێبەکەی بەناوی "سامانی نەتەوەکان، ١٧٧٦"، دەپرسێ:

ئاخۆ ئەمە باشتربوونە لە بارودۆخی خەڵکی پلە نزم کە بە سوود یان نەشیاو سەیر بکرێن لەناو کۆمەڵگە؟ وەڵامەکە یەکەم جار زۆر سادە و ساکار و ئاسان دێتە پێش چاو. خزمەتکاران، کرێکاران و هێزی کاری جۆرەوجۆر، بەشێکی زۆر گەورەی کۆمەڵگەی سیاسی پێک دێنن. بەڵام ئەوەی بارودۆخی ئەو بەشە گەورەیە باشتر دەکا نابێ هەرگیز بە نەشیاوی هەمووان دابنرێن. هیچ کۆمەڵگەیەک ناتوانێ تەواو سەرکەوتوو و دڵخۆش بێ، ئەگەر بێتو بەشە گەورەکەی هەژار و نەگبەت بێ. ئەوە تەنیا

یەکسانییە، لە پاڵ ئەمانەدا، دەتوانێ جەستەی خەڵک دەرخوارد بدا، داپۆشێ و بژینێ، دەبێ ئەو چینە گەورەیە وەک خودی خۆیان تێر بکەن، داپۆشن و بەخێو بکەن.

دیموکراسی تەنیا ئەو کاتە مانادار دەبێ لە شۆڕشی کۆتا-کراوە ئەگەر بێتو سیاسەت بێتە بەکارهێنان وەک ناوەندێک بۆ باشیی خەڵک، ئەمەش واتە دەبێ حاڵی خەڵک لە رووی ئابوورییەوە باش بکرێ. ئەمە پێویستی بە گەڕان و دۆزینەوەی زمانێکی نوێ هەیە، زمانێک کە پێشتر لە گۆڕەپانی تەحریر هاتە گۆکردن بۆ بەهاری عەرەبی، زمانێک نیگەرانیی بۆماوەییمان بڕەوێنێتەوە، ترس و بیممان دەربڕێ. لە فێربوونی ئەوەی چۆن ئەو زمان ببیستین و قسەی پێ بکەین، پێویستمان بە گۆڕینی پێناوەکەش هەیە. پێگەی کۆتا-کراوەی ئەو شۆڕشانە پێویستی بەئاقارێکی گشتی هەیە بە زمانێک بێتە ئاخاوتن کەوا دەربڕی پێناوەکان بێ و دەست لە پێناوە مردووەکان هەڵگرێ.

## ئۆریەنتالیزمی نوێ؟

"بە ئۆریەنتالیکردنی راپەڕینی میسری" (٢٠١١)، وتارێکە بۆ گۆواری ئۆنلاینی "جەدەلیە" (کە کۆمەڵێک رۆشنبیر و ئەکادیمی عەرەب بۆی دەنووسن) نووسراوە، رەباب مەهدی، زانایەکی سیاسییە لە زانکۆی ئەمەریکی لە قاهیرە، رەخنەیەکی باشی گرتووە لەو رێیەی شۆڕشی میسری پێ هاتە وەسفکرن لە میدیا، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و لۆکالدا. مەبەستی مەهدی ئەوەیە کەوا پێگەی ئۆریەنتالی کۆنی "بێوێنەییی عەرەب" (واتە عەرەبی ناتوانن دیموکراتی بن)، شوێنی گیرایەوە بەپێگەی ئۆریەنتالی "رابوونی عەرەبی". ئەم زمانە، رەباب پێشنیاز دەکا، باسی "ئەوان"ی تر دەکا، چونکە "ئەوان" (عەرەب و موسڵمان) جیاوازە لە "ئێمە" (رۆژئاوایی، بەتایبەتی ئەورووپی) کە ستاندادرن، دووەمیش بە رۆمانسیکردن و

ژەهراویکردنی "ئەوان"ی ئۆریەنتال نادیار و ئەفسانەییە. رەباب رۆشنبیر و سەرکردەکانی عەرەب لە رەخنە بێبەش ناکا: "هەروەک ئێدوارد سەعید چەندان ساڵ پێش ئێستە گوتی، ئۆریەنتالیزم هەر تەنیا وەسفی "رۆئاوایی" نییە بۆ رۆهەڵاتی ناوەڕاست... بگرە لۆکالیکردن و زڕاندنە بەهۆی بژاردەی لۆکال. رەخنەکەی مەهدی، کە کاردانەوەیەکی زۆری لێ کەوتەوە لەوانەی بۆ جەدەلیە دەنووسن، لە بنەڕەتدا هێرشی کرایە لەو خاڵەی گوایە فاکتەرێکە بۆ خوێندنەوەی راپەڕینی میسری:

> لە کەیسی میسر، ئەم راپەڕینەی بەم دواییە بە شۆڕشێکی گەنج و ناتوندوتیژ دادەنرێ، تێیدا میدیای کۆمەڵایەتی (بەتایبەتی و فەیسبووک و تویتەر) پاڵەوانن. پەیام لێرە ئەوەیە ئەو گەنجە چین مامناوەندە رۆشنبیرانە تیرۆریست نین، هەمان بەهای "ئێمە" (واتە رۆئاوای دیموکرات)یان تێدایە، دواجار وەک ئەوان هەمان ئامێر بەکار دێنن (فەیسبووک و تویتەر) کەوا "ئێمە دامان هێنا و لە ژیانی رۆژانەماندا بەکاری دێنین. ئەوان رێک وەک "ئێمە"ن و بۆیە شایەنی ئەوەن ئاهەنگیان بۆ بگێڕین.

ئەم هەڵسەنگاندنە تژییە لە خەوش، مەهدی پێی وایە، چونکە:

> لە کاتێکدا گەلێ لەو تاکانە بەشدار بوون لە راپەڕینەکە، بە توانای جیاجیا، کەسایەتییان لە "شۆڕش"، زۆرینەی دانیشتوانی میسری و ئەوانەی بەشدارییان کرد لە راپەڕینەکە هەم بێزارکەرن و هەمیش کۆمەڵێک شت دەدرکێنن. ئەم زۆرینەی دانیشتوانە هەرگیز دوکتۆر شارپ یان فریدەم هاوسیان نەبیستووە، قەت لە AUC نەیانخوێندووە، یان کاریان بۆ گووگڵ نەکردووە. زۆر بەقووڵی، دژی کاریگەری و بوونی رۆئاوان لە میسر. بۆیە ئەو چینەی بڵاو بووبووەوە تەنیا یەک وشە بەسە

بۆیان، تاکە وشەیەکی خەیاڵی: "گەنج".

ئا لەم سۆنگەوەیە کەوا لایەنی ناتوندوتیژیی راپەڕینەکە و بەکارهێنانی میدیای کۆمەڵایەتی جەختیان لەسەر دەکرێتەوە. بەڵام رەباب ئاماژە بەوە دەکا:

گومانی تێدا نییە خۆپیشاندان لە دژی رژێم ناتوندوتیژ بوون بە بەراورد لەگەڵ هێزەیلی تەناهیی دەوڵەت کە چەکیان بەکار هێنا. لەگەڵ ئەوەشدا، لە ٢٨ی جانیوەری هەموو بارەگاکانی پارتی نیشتمانیی دیموکرات و زۆربەی بنکەیلی پۆلیس هاتنە سووتاندن. ئەمە بەرتەسکێکی روون بوو بۆ توندوتیژی سیستماتیکی دەوڵەت لە دژی چینەکان، ئەوانەی کە رۆژانە بەر زەبری ئەشکەنج و سووکایەتیی دەوڵەت دەکەوتن لەبەر پێگەیان لەناو چینی نیولیبرال لە میسر. بەپێچەوانەی چینی مامناوەندیی گەنجانی فەیسبووک، بەرگەی توندوتیژیی دەوڵەتیان نەگرت لە دەرەوەی جیهانی چالاکیی سیاسی. لادانی ئەم بەشەی چیرۆکەکە زیاتر سوود بەگێڕانەوەی ئەم راپەڕینە دەکا وەک شۆڕشی فەیسبووکی چینی مامناوەند.

حوکمدانەکەی مەهدی مەرجدار نییە:

بریکارە چالاکەکانی ئەم گێڕانەوەیە هەر تەنیا میدیا و سیاسەتوانان نین، بگرە کۆمەڵگەیێنی ئەکادیمی و نێودەوڵەتین.... بەداخەوە، ئەو پارتە جیاوازانە دەسەڵاتی دارایی، ئەخلاقی و سیاسییان هەیە بۆ سەرخستنی ئەو گێڕانەوەیە. جارێکی تر ئیمپراتۆریەت دەبینین لە بۆیاخکردنی وێنەی "تووڕەیی" و لە ناوەوەش چینی یاخییان، واتە تووڕەیی تووڕەکان، ئەمانە وەلا نراون.

وتارەکەی مەهدی و وەڵامە توورەکانی دژی، لەنێو شتەکانی تردا، ئاماژەن بە پرسی زمان و نوێنەرایەتیکردن لە خوێندنەوەمان بۆ بەهاری عەرەبیی تونس، میسر و پێگەکانی تر. ئاخۆ بەڕاستی ئێمە لەژێر بەزەیی ئۆریەنتالیست و پێگەی ئۆریەنتالین کەوا چەواشەی واقیعی ئەم ئەزموونە زیندووەمان دەکا؟ ئێمەی عەرەب، ئێرانی، تورک، ئاسیای باشووری، ئەفریقی و ئەمەریکای لاتین قۆپاوینەتەوە، ئێمە وەک پێشتر ئۆریەنتالین؟ ئاخۆ ئێمە ناتوانین قسە بکەین، بنووسین، کار بکەین، شانۆ بکەین، سەما و گۆرانی بڵێین و یاخی بین، ئاخۆ ناتوانین نوێنەرایەتیی خۆمان بکەین، ئەم کارانە ناکەین؟ لە کوێ و کەی ئەو دەسەڵاتەی رۆژئاوا دێ و واقیعمان چەواشە دەکا و ناشیرین نوێنەرایەتیمان دەکا؟ زمانی ئۆریەنتالی لەوانەیە جەخت بکاتە سەر ئەو پۆلێنانەی کەوا ئاماژەن بە بەهاری عەرەبی یان رابوونی عەرەبی، بێگومان رەباب مەهدی خاڵێکی رەوای هەیە بیڵێ لەبارەی خراپ نوێنەرایەتیکردنەوە، یان هەر نەکردنی ئەوەی پێی دەڵێن "چینی خوارەوە" بەو شێوەیەی راپەڕینی میسری نوێنەرایەتی دەکرێ لە جیهان.
بەڵام، لە هەمان کاتدا، کاردانەوەی گشتی بۆ ئۆریەنتالیزم، بەتایبەتی رەخنەکەی ئێدوارد سەعید لەبارەیەوە، ئێستە بووە کلێشەیەک. ئەگەر ئێمە بمانەوێ ئارەزووەکانی شۆڕشی نوێ شی بکەینەوە کەوا باسی رێگەی گەلان (میسر و ئەوانی تر) و راپەڕینیان دەکا، دەبێ واز لە بیرکردنەوە و نووسین بێنین بەو زاراوانەی کەوا کاردانەوەین بۆ کلێشەی ئۆریەنتالیزم، بەو شێوەی ئێمە لە ماوەی نیو سەدەی رابردوو و زیاتریش تێیان گەیشتووین.
لەگەڵ رۆژئاوا، وەک بیرۆکەیەک، پێکهاتەیەکی کۆلۆنیالی هاوڕایە لەگەڵ "ئۆریەنت"، ئێستە تەقیوەتەوە، هیچ شتێکی رۆژئاوایی نەماوە تا ئەوانی تری پێ رۆژهەڵاتی بکا، هیچ رۆژئاوایەک نەماوە بۆ دروستکردنی رۆژهەڵات، هەرچەندە وا پێ دەچێ رۆژئاوا سوور بێ لە خەیاڵی رەخنەییان، چونکە هەر لە دەستێوەردانی داگیرکارێکی تر نیگەرانن، جا بە هەر شێوەیەکی بێ.

دۆخی ئێستەی سەرمایەی کاریگەر و باڵادەستیی ئیمپریالیزم بەسەریەوە، چیی تر لەگەڵ مەعریفەی ئۆریەنتالی یەک ناگرێتەوە، یان چیی تر رەوتەکانی سەدەی نۆزدە، تەنانەت هی سەدەی بیستەم بەرهەم ناهێننەوە. شتێک نییە بە ناوی رۆئاوا (پێشتریش خۆ هەر نەبووە) بۆ بەئاسیاییکردنی هەر شتێک؛ کەسێک، ئەو دەسەڵاتە، چەوت بوو و بە بیرۆکەی خۆی تێ کەوت، خۆی شەکەت کرد، تارماییە ترسێنەرەکەی ناتوانێ بەردەوام بێ لە چەواشەکردن و لادانی خوێندنەوەی رووداوی جیهانمان بە هاوکاریی ئەو تارماییانەی کە بوونیان نییە.

کێ گرینگی بەوە دەدا میدیا چی دەڵێ، زاراوەکان ئەمرۆکە مانایان چییە؟ میدیای جیهانگیری دەبێ ئێستە رکابەریی بلۆگەرانی میسری بکا، رکابەری تویتەرانی سووری و فەیسبووکانی تونسی بکا، یەمەنییەکان لەسەر یوتیوب، بەحرێنییەکان کە وتار و را و بۆچوون بۆ جەزیرە دەنووسن. ئێستەش ئەکادیمی و چالاکوانانی عەرەبی پێکەوە هاتوون "جەدەلیە"یان دروست کردووە، کە تا ئێستە پێشکەوتووترین وارگەیە بۆ زانیاری و شرۆڤەکردنی جیهانی عەرەبی و موسڵمانان. میدیای گشتی دەسەڵات و هێزی نییە نوێنەرایەتیی شتێک بە خراپی بکا. ئاخۆ بێرنارد لویس یان تۆمار فریدمان دەسەڵاتیان زیاترە بۆ خراپ پێشاندانی واقیعی میسری لە چاو ئەو ملیۆنان میسرییە و عەرەبەکانی تر لە شەقام و گۆرەپانەکانیان، هەروەها لە چاو هەزاران رۆشنبیر، زمانزان و رەوانبێژ، رۆژنامەنووس و ئەکادیمییەکانی عەرەب کەوا بە ئاسانی دەستیان بە میدیای جیهانی دەگا. بیرۆکەی "میدیای رۆئاوا" تەنیا خەڵەتێنەرە. ئاخۆ جەزیرە و جەدەلیە میدیا نین، ئەی ئەوانیش بەراستی میدیای رۆئاوا نین کاتێ لە رۆئاوا دێنە خوێندنەوە؟ نوێنەرایەتیی رۆئاوا چیی تر ئەو دەسەڵاتەی نەما ئەوانی خراپ پێشان بدا.

ئێمەمانان کەوا بەرەنگاریی دەسەڵات و ستەمکاران دەبینەوە، بەهۆی باشیی میدیای نوێ و ئەندامانمان، زیاتر دەتوانین خۆمان پێشان بدەین لە

باتی ئەوەی رۆئاوا یان دەسەلآت پێشانمان بدا. ئەگەر ترسەکانی تارمایی میدیای بەهێزی رۆئاوا نەخرێنە پەراوێزەوە، ئەوا ئەم ترسانە خۆیان دوژمنێک دروست دەکەن کە بوونی نییە. لە باتیی خەیاڵکردنی ئەو هێزە بیانییانە لە کارکردن کە چەواشەی رووداوگەلی عەرەبی و میسری دەکەن، ئێمە دەبێ ئەو جۆرە رووداوانە بخەینە ناو فەزایەکی گشتی کەوا بەشێک لە دیمەنی خەیاڵی و ئەخلاقیمان پێک دێنێ، فەزایەک کە لە راستیدا بەرەوپێش دەچێ، هەروەها هەر ئەوەشی چاوەڕێ لێ دەکرێ، ئەو فەزایەش بەهاری عەرەبییە. باسکردنی بەهاری عەرەبی بەزاراوەی کۆتا-کراوە پێویستی بەوازهێنانە لە نیگەرانی و پابەندبوونە بە زمانێکی نوێ کە خەڵک گۆرانیی پێ دەڵێن لە گۆرەپانی تەحریر و تەواوی جیهانی عەرەبی و موسڵمانان، بۆیە ئەگەر باش گوێ بگرین، ئەوا خێرا واز لەو زاراوەیە دێنین.

## بەرەو فەزایەکی ئاینیی گشتی

لە کوێ و کەی دەست پێ دەکا؟ بێگومان پێش شۆڕشی ٢٥ی جانیوەری، هەروەها لە گۆڕەپانی تەحریر.

مردنی کتوپڕی ناسر حەمید ئەبوزەید لە ٥ی جولای ٢٠١٠ (من دەمێکە پێی سەرسامم) نەک هەر تەنیا یەک بگرە دوو نموونە و پایەی گەورەی میسری بیر خستمەوە، لەژێر سایەی ئەمانەوە بەشێکی جیهان کەوتە خۆشی و مانادارتر بوو. لە ماوەی دوو ساڵدا، فیلمساز یوسف شاهینمان لە دەست دا (٢٧ی جولای ٢٠٠٨) و هەروەها کەسایەتی و ئاینی و پسپۆڕ لە بواری واتاسازی ناسر حەمید ئەبوزەید (لە ٥ی جولای ٢٠١٠)، وەک بڵێی سەیری دوو تاوەرە جمکانەکە دەکەین دەڕووخێ کەوا دیمەنێکی ئەخلاقی و خەیاڵێکی ئیستاتیکی بوو بۆ ماوەی زیاتر لە نیو سەدە، مردنی ئەمانە پێش تەقینەوەی بەهاری عەرەبی بوو.

لە جیهانی عەرەبی و موسڵمانان‌دا، هەروەها لە جیهانیشدا، ئەوانەی

یوسف شاهینیان ناسی بێ بەدەگمەن ناسر حەمید ئەبوزەیدیان دەناسی، هەروەها ئەوانەی سەرسام بوون بە دەسکەوتە بەهادارەکانی ئەبوزەید و خوێندبێتیانەوە، ئەوا بەدەگمەن دەیانتوانی ناوی دوو فیلمی شاهین بزانن، یان لە ژیانی خۆیاندا و لە سەردەمی رواڵیدا فیلمی (باب الحدید)یان نەبینیوە کە لە ١٩٥٨دا دەرچووو.

ئێمە پێویستە هەر یەکێکیان بەهاوێنەی ئەوی تر تەماشا بکەین و بخوێنینەوە. ئەو کۆمەڵگەیەی ناسر حەمید ئەبوزەید و یوسف شاهینی بەرهەم هێنا لە سەنتەرێکی هاوسەنگی هۆشیاریی دادوەریی خۆیدا دەبوایە ئاگەدار بێ بەبەهای ئەو هاوسەنگییە، لەوێوە خەیاڵی ئەخلاقیمان تێکەڵی زەوی و ئەوانی تر دەبێ. هاوسەنگییەکی میسری هەیە بۆ هیوا و بێهیوایی، بەڵێن و ئیفلیجبوون، کە وێ دەچێ هەموومان پێناسە بکا، ئەوانەی لە سەردەمی محەمەد موسەدەق، جەمال عەبدولناسر و جەواهیر نەهرۆ لەدایک و گەورە بوونە، ئەمانە پاڵەوانی دژە کۆلۆنیال بوون کە ئێمەیان کردە پۆستکۆلۆنیال. جیهانگیریی ئەو دیدەی ئەوانی دروست کرد، هەر هەمان دەمار و رێ بوو یوسف شاهین و ناسر حەمید ئەبوزەیدیان دروست کرد، ئەمانە هەردەم لەژێر بەزەییی دەمارگیری و دڕندایەتیدا بوون کەوا هاودژانە سەریان هەڵدا لەو سەرچاوەیەی کەوا هیوا و ئارەزووەکانی لێ دێتە دەرەوە. سەید قوتب و ئایەتوڵلا خومەینی خەون و هزرەکانی ئێمەیان بە هەڵە تەفسیر کرد و وەک مۆتەکە باسیان کرد. زۆر شت لەبارەی بیری گەنجانەی بەهاری عەرەبییەوە گوتراون، راستیشن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ژیرییەی لە چاو و بیری شاهین و ئەبوزەیدان داوای خوێندنەوەی تازە دەکەن بۆ داهاتوو.

بۆ یەکەم جار چاوم بە ناسر حەمید ئەبوزەید کەوت لە خوانێک بوو کەوا ئێدوارد و مەریەم سەعید بۆیان چێ کردبوو لە نیویۆرک. زۆر لەوە زووتر من شتەکانیم دەخوێندەوە، لەو کاتانەی قوتابیی ماستەر بووم لە زانکۆی پێن،

تازە ئاشنا کرابووم بە کارە بنچینەییەکەی لەبارەی لایەنە ئاینییەکانی قورئانەوە، ئەمە لە ناوەڕاستی هەشتاکان لەلایەن جۆرج مەکدیسی مامۆستامەوە بوو (١٩٢٠-٢٠٠٢). ئەو کاتە کەم کەس دەیانزانی "اتجاه العقلي في التفسير: دراسة في قاديةت المجاز في القران و معتزيلة (١٩٨٢)" چییە، یان کتێبەکەی بەناوی "فلسفة التئويل: دراسة في التئويل القران و محي الدين بن عەرەبی (١٩٨٣)". چەند ساڵێک دواتر، کاتێ کارم لەسەر کتێبەکەم "عين قودات" دەکرد، ئاشنا بووم بە "مفهوم الناس: دراسة فی علوم القرآن (١٩٩١)" و "نقد الخطاب الديني (١٩٩٨)". هاوپۆلی خوا لێخۆشبووم ماجدە نوێعی پاشان منی ئاشنا کرد بەم دوو کتێبەی ئەبوزەید: "المرعة في الخطاب الئزمة" (١٩٩٥) و "دوار الخوف: قرائە الخطاب المرعە (١٩٩٩). شتێکی بەڵگەنەویست بوو کەوا لەو هەموو دەقانەدا، داوای ناسر حەمید ئەوە بوو لایەنی پیرۆزی ئاینی بە زمانێکی سەردەمیانی مرۆ باس بکرێ. هەرگیز ون نەدەبوو لە پێوەندییە شاراوەکانیان. بەڵام جوانترین کاری ناسر بەلای منەوە "التفكير في زمان التكفير، ١٩٩٨" بوو، ڕەنگدانەوەی دوورخستنەوەی بوو لە وڵات، هەروەها لە کاتی ئەو ڕووداوە ناسراوە نووسرابوو کاتێ دادگەیەکی شەرعیی میسری ئەوی بە ناپاکێکی ئیسلام لە قەڵەم دا و قەدەغەیان کرد لە زەواج، خۆی و خێزانەکەیان ("ئیبتیهال یونس" مامۆستای ئەدەبی فەرەنسی لە زانکۆی قاهیرە) ناچار کرد وڵات بەجێ بێڵن و بچنە هۆڵەندا، لەوێ گرووپێکی توندڕۆی ئیسلامی فەرمانی مردنی بەسەردا دەدەن. ئەمە لە کاتی یەکێ لە بەشە هەرە تاریکەکانی مێژووی میسری ڕووی دا، کاتێ فەرەج فۆدا لە ١٩٩٠دا کوژرا و هەوڵی کوشتنی هەڵگری خەڵاتی نوبڵ نەجیب مەحفوزیان لە ١٩٩٤، ئەمانە بارێکی ئێجگار گرژیان لە میسر دروست کردبوو. وێڕای ترس و نیگەرانیی سەپاندنی حوکمی مردن بەسەر ناسر حەمید، هەردەم قسەخۆش و ڕەنگدانەوە سەرنج ڕاکێشەکانی لەسەر ڕووداوی قێزەون بەردەوام بوو.

حەزی دەکرد چیرۆک بگێڕێتەوە لەبارەی ئەو کارتۆنانەی لە کۆوارە میسرییەکانەوە دەردەکەوتن، تێیاندا مێردەکان وەک مێتافۆر ئەویان بەکار دەهێنا، دەیانپرسی ئاخۆ چۆن بتوانن زەواجی قەدەغەکراویان ڕێک بخەنەوە! کاتێ گۆشەنووسێکی میسری گاڵتەی بە ژن و مێردێک کرد "لەبەر بەردەوامییان وەک ڕۆمیۆ و جولێت" لەبەرئەوەی لە دیمانەیەکیان لە سی ئێن ئێن دەستیان لەناو دەستی یەکتر بوو، ناسر حەمید وەگۆ هاتبوو و گوتبووی "جا چ عەیبێک لە ڕۆمیۆ و جولێتدا هەیە؟" هێندەی ئەمە گرینگ ئەوەیە ناسر حەمید هەرگیز ڕێی بەوە نەدا ئەو حوکمی مردنەی بەسەریدا سەپێنرابوو لەلایەن هاوەڵە میسرییەکانی لەلایەن میدیای ئەوروپی و ئەمەریکی وەک چەکێک بێتە بەکارهێنان تا باسی ئیسلامۆفۆبیای پێ بکەن، یان بۆ مەرامی خۆیان بەکاری بێنن، وەک ئەوانی تر، وەک سەلمان روشدی و ئەیان هیرسی عەلی، بۆ ناساندنی پیشەکەیان. بەرگەی ئاستەنگییەکانی دوورەوڵاتی گرت و ژیان لەژێر هەڕەشەی مردندا گرت بەوپەڕی شکۆمەندی و سادەییەوە، تا ڕۆژی مردنیشی هەر موسڵمانێکی بە بنەما و شکۆمەند بوو.

هەرچەندە ئاشنابوونم بە ناسر حەمید ئەبوزەید ئەکادیمی بوو، بەڵام کاتێکی ویست تا شارەزای ئەو پیاوە گەرموگوڕ و قسەخۆش و بیرۆکە جوانەکانی بووم. ئاشنابوونم بە یوسف شاهین خۆش و سەیر و سەرنج ڕاکێش بوو، هەروەها لە کاتی وانەگوتنەوەم لە کۆڵۆمبیا هەردەم باسی کارە سینەماییەکانی ئەم بۆ قوتابییەکانم دەکرد، بۆ ئەو کلاسانە مایسترۆ مەزنەکەم داوەت کرد، کاتێ هاتە نیویۆرک، تا قسە بۆ قوتابییەکانم بکا. هەردەم بە گاڵتەوە دەیگوت کەوا سەرسامیسی من بۆ فیلمەکانی پێوەندیی هەیە بە سەرەڕۆیی سەردەمی رواڵیی ئەو لەگەڵ هیند ڕۆستەم (سۆفیا لۆرینی سینەمای عەرەبی)، ئافرەتە پاڵەوانی فیلمی (باب الحدید). لە سەرەتای رواڵیمدا فیلمی "باب الحدید"ی شاهینم بینی کە لە ١٩٥٨دا دەرچووبوو، لە کاتێکدا ڕۆڵی وەک عەبدوڕەحمان شەرقاوی (١٩٦٩) کارێکی

نایاب و نموونەیی بوو لە پەروەردەی سیاسیی من و چەندان نەوەی تر. دوای چەند فیلمێک، شاهین لەسەر ئاستی جیهان بە ئۆتۆبایۆگرافیی نیشتمانەکەی ناسرا. لە فیلمی "النصر صلاح الدین، ١٩٦٣" تا "المصیر، ١٩٩٧"، شاهین بەردەوام ئاوێنەی گەلەکەی بووە، لە ترۆمای شەڕەکانی عەرەب-ئیسرائیلەوە تا مەترسییەکانی دەمارگیریی ئاینی لە نیشتمانەکەی، هەمان دەمارگیری بوو کە وای لە ئەبوزەید کرد وڵات بەجێ بێڵێ، شاهین بەردەوام شتی پێ بوو.

یوسف شاهین و ناسر حەمید ئەبوزەید دوو پێکهاتەی تەواوکەری یەکترن لە کۆزمۆپۆلۆیتانی هونەری و رۆشنبیریی سەدەی بیستی میسر. ئەگەر بتەوێ یەکێکیان بەتەواوی بناسی، دەبێ ئەوی تریش بناسی. لە رێی ئەوانەوە یەکێ لەوە تێ دەگا چەندە داهێنەر و کاریگەر بوونە بۆ کۆمەڵگاکەیان. کارە ئاینییەکانی ئەبوزەید لەوپەڕی نایابیدان سەبارەت بە زمانی ئەدەبی و واتای قورئان وەک کاری واتاسازی و گێڕانەوەی لۆجیکی وان کە دەبێ لە رێی رەوانبێژیی باوەڕی خوێنەری موسڵمانەوە بێتە لێکدانەوە. ئەو باسی باوەڕی دەکرد، ئەمەش یەکێکە لەو ئاماژانەی کەوا ئەو بلیمەتێکی گەورە بوو، خوێندنەوەی واتای دەقە پیرۆزەکە کارێکی بێوێنەی ئەوە. لێرەدا تەواو باسی گرینگیی وەحی دەکا، هەر دەقێکی پیرۆز بۆ لێکدانەوە پێویستی بەوەستایەکی ئەدەبی هەیە، لێی نەدزێ، بگرە لە شێوازە میتافیزیکییەکەی وەرگرێ. ئەو لێکدانەوە واتاسازییە بنەهاتووە، لە بەرامبەردا، دەبێتە دەقێک بۆ هونەرێکی مەزنی جوانی، کە شاهین لەلایەن خۆیەوە، دواتر ئەو هونەرە لە ریالیزمی نوێی ئیتاڵی وەری دەگرێ، هەروەها لە فیلمی بەتایبەتی تا دروستبوونی پیشە سینەماییەکەی بەردەوام لە گەڕاندا بووە. ئەبوزەید بە خۆشی باسی مانا گومانهەڵنەگرەکانی قورئان دەکا، کە یەک دەگرنەوە لەگەڵ شانۆیەکی ئازادیی ئاینی کەوا شاهین باسی پێوەندانگەکانی واقیع دەکا بە شێوازی ریالیزمی نوێی خۆی.

له ئاکامدا، گرینگیی لێکدانەوە ئاینییەکانی ناسر حەمید ئەبوزەید ئەوەیە قورئان بە شانۆیەکی بێ بنی خود پیرۆزی دادەنێ کەوا ئاماژەیە بەوەی هاوسەنگییەک دروست دەکا لە ناوەوە و دەرەوەی خوێنەر، باوەڕ و لێکدانەوەی خوێنەر کە باوەڕەکەی ئازادانە و یەقین بێ، کە لە هەمان کاتدا باوەڕێکی بەجێ و وەحیئامێز بێ. بەواتایەکی تر، لە ڕێگەی تێگەیشتن لە دەقە پیرۆزەکە وەک سیستەمێکی ئاماژەکان، ئەبوزەید تێگەیشتن و لێکدانەوەکانی بە ویستی نووسەر ناکا، بگرە بەهیوای خوێنەر دەکا (کە هەردەم مێژوویی و جیهانی بووە). تا بتوانی ئەو کارە بکەی و هەر باوەڕداریش بمێنییەوە، وەک ئەوەی ئەبوزەید کردی، تاکە ئاماژەیە کە ئەو بلیمەتێکە لە بواری لێکدانەوەی ئاینی. ئەبوزەید قورئان بەشێوەیەک دەخوێنێتەوە کەوا هاوتەریبە لەگەڵ ئەزموونی تەماشاکردنی فیلمێکی یوسف شاهین: دەقەکە وەک ئاوێنەیەکە تژییە لە ئاماژەی پیرۆز و چاوەڕێی ئەوەن خۆیان ئاشکرا بکەن، نەک هەر تەنیا نەبینراو لە ڕێگەی بینراو، بگرە بینەر لە ڕێگەی ئاماژەکانەوە تێ دەگا. لە ڕێگەی لێکدانەوە ئاینییەکانییەوە، ئەو ساتی وەحیی ئیلاهی چالاک دەکاتەوە، لە پێغەمبەر محەمەدەوە تا موسڵمانێکی ئاسایی. ناسر حەمید ئەبوزەید کامێرایەکی یوسف شاهینی لەناو بیری هەر موسڵمانێک دانا کە قورئان دەخوێننەوە یان دەبینن. موسڵمانە بیر مردوو و گیان مردووەکان بەپێی بۆچوونی خۆیان ئەو لێکدانەوەیان لەبارەی قورئانەوە بە مەترسییەکی گەورە دەزانی و دەترسان لە ژیریی خۆیان، بۆیە هەردەم دژی مەزنترین لێکۆڵەری ئاینی سەردەمی ئێمە دەوەستانەوە و حوکمی مردنیان بەسەردا سەپاند.

نیگەرانییەکانی ناسر حەمید بەردەوام لەبارەی لێکدانەوە ئاینییەکانەوە بوو. ئەو زۆر بایەخی بە ناپیرۆزکردنی یان دووبارە پیرۆزکردنەوەی قورئان نەدەدا. بەڕای ئەو قورئان دەقێکی پیرۆز بوو، پێی وابوو خوێنەر کوێرانە باوەڕی بە لایەنی ئاینی و ئیدیۆم و ماناکانی ئەو دەقە هەبوو، ئەو دەیویست

پیرۆزییەکان ئاشکرا بکا و خەڵکی ئاسان تێی بگەن. بلیمەتیی ئەو لەوەدا بوو دەیویست مامەڵە لەگەڵ ئەو فاکتە بکا کەوا بیرکردنەوە زمانێکی ئاینزایە، نەک لەناو بازنەی باوەڕدا بەندی بکەی. لە ئاکامدا، بەردەوام بیری لای ئەوە بوو چۆن مانا لەناو ئەو بازنە ئاینزایەدا بەرهەم دێ، باسی دەکرد لە ڕێی باوەڕ لە دەقێکی وەحیئامێزدا.

یوسف شاهین و ناسر حەمید ئەبوزەید هەردوو دیوی میسرن وەک ئاماژە و سیمبولی ڕۆشنبیری و داهێنان، ئەمڕۆش وەک نموونەیەک لە ڕاپەڕینی شۆڕشئاسای کۆتا-کراوە، جیهانبینیبوونەکەی، وەک ئێدوارد سەعید دەڵێ، زاڵە بەسەر خەیاڵی ئەخلاقیمان. هاوێنە فراوانەکانی شاهین پێویستن بۆ بینین و تێگەیشتن لە خەیاڵە ئاینییە بوێرەکانی ئەبوزەید، بۆ سەیرکردنی قورئان و وەک سیستمێکی تژی لە ئاماژە وەری گری کە لە دەقێکدا کۆ بوونەتەوە و چاوەڕێی ئاشکرابوونی ئەودیو دێرەکان دەکەن، لە لێکدانەوەی ماناکانی لە دیدی جیهانبینیبوونەکەیدا. پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە: قسە و لێکدانەوە ئاینییەکانی ئەبوزەید (هەرچەندە کاری لەسەر دەقی پیرۆز دەکرد بەڵام قسەکانی زۆر خۆش بوون) وامان لێ دەکەن لێڵییەکانی ئەودیو خۆشییەکانی دیمەنەکانی "ڕۆڵی ئەسکەندەریە"ی شاهین ببینین.

کارە ئاینییەکانی ئەبوزەید هەمان ڕەوت و شێوازی هەستیار و ئیستاتیکی سینەمای شاهینیان تێدایە. دەرککردن بە ژیانی ئاماژە روونەکان کە سووکایەتی بە دەسەڵات و باڵادەستیی مانا وەرگیراو و چەوسێنراوەکان دەکا کەوا پسپۆڕەکان لە یاسای ئیسلامیدا ناویان لێ ناوە "ئاین." ئەگەر دڵە سووک و واتابەخشەکەی شاهین ڕەوتێکی ڕێککەوت بێ بۆ دەربڕینی واتاکان، شێوازێکی کوێرانە بێ لە دیدەکانیدا، وەک ئەوەی لە "المصیر"دا هەیە، ئەبوزەید باسی هەمان ڕەوتی کوێرانە و فێڵبازانەی ئێرانە، ئەمەش وا دەکا کارە ئازادە ئاینییەکانی بەند بکا تەنێ لە باسکردنی ئەو "ئیسلام"ەی کە ئێران دەیەوێ دوای کارەساتە خوێناوییەکە لە کۆمارێکی

ئیسلامیدا مانای بۆ پەیدا بکا. لە باشترین کاریدا "رۆڵی ئەسکەندەریە" بەتایبەتیش "ئەسکەندەرییە... بۆچی"، شاهین، وەک ئەبوزەید لە کتێبەکەی "مفهود النص، ۱۹۹۱"دا، دەگاتە لێکدانەوەیەکی ئاینیی ئەدەبی پاکی قورئان و هەناسەیەکی نوێ دەدا، ئەمەش کرانەوەیەکە بۆ ئەوانەی لەناو خەیاڵی خوێندنەوەی دەقەکە خۆیان بەند کردووە، بەهۆیەوە لە ژیانی خۆیان دەترسێن. لە کارە ئاینییەکانیدا، ئەبوزەید تەواو واتاسازێکە کە دید و مانا شاراوە گەورەکانی ئەو دەقە پیرۆزە ئاشکرا دەکا کە شاراوە و گرێ دراون لەلایەن هاوشانە میسرییەکانی، واتە لەلایەن پسپۆڕانی ئاینی لە میسر، هەر ئەوانەش قورئانیان تەنیا بە یەک ئاراستەی چەواشەدا بردووە و هیچی تر.

وێکچوونێکی واتاسازی هەیە لە نێوان قسە ئەدەبییەکانی ناو کارە ئاینییەکانی ناسر حەمید ئەبوزەید و سینەمای هەژێنەری یوسف شاهین، لە کاتێکدا ئەمە بوونی نییە لە ماوەی نێوان لەدایکبوونێکی توند و خوێناوی "رۆشنبیرە ئاینییەکان" لەبارەی دیمەنی ئێران و سینەمای خۆگۆشەگیریی عەباس کیارۆستەمی یان سینەمای خۆتێکشکێنەری موحسین مەخمەلباڤەوە. ئەو رۆشنبیرە ئاینییانە باشترین بەرهەمی خۆشیی سیستەمی ئاینی بکوژ بوون لە ئێران، فەلسەفەکانیان نابەجێ، بکوژی جیدی، تەواو کوێرانە و بێزارکەرن. بۆیە، تەنیا لەبەر ئەو هۆکارە، هەروەها وێڕای ئەو راستییەی کەوا ئەبوزەید وەلانرا بوو و حوکمی مردنی لەسەر بوو، توانی بگەڕێتەوە وڵاتەکەی و بە سەربەرزی بمرێ، بەمەش هاوەڵە میسرییەکانی خۆشیان ویست و پێی سەرسام بوون. لە کاتێکدا هاوەڵە ئێرانییەکانی ئێستە زۆربەیان لە مەنفادا دەژین، ئەگەر بێتو بوێرن بگەڕێنەوە ئێران، ئەوا یان بە زۆر دەهێنرێنە سەر تەلەڤزیۆن و دان بەوەدا بنێن کەوا ئەوەی بیریان لێ کردووەتەوە و نووسیویانە هەڵە بووە، هەروەها داوای لێخۆشبوون بکەن لە ڕابەری باڵا، یانیش ئازار دەچێژن لە

شکۆمەندیی زیندانییەکی ئەبەدی یان خراتر، هەموو ئەمانە سەرچاوەیان لەوە گرتووە کەوا سەردانی ئەوانەیان کردووە کە چۆن ئازاریان چەشتووە لەبەرئەوەی بەپێچەوانەی ئەوان بیریان کردووەتەوە.

رووباری نیل نیشتمانێکی لێ بووە کەوا دەتوانی یوسف شاهین و ناسر حەمید ئەبوزەید و ئەوانی تر بەرهەم بێنێ، خەیاڵ و بوێریان وەک هی رووباری نیلە کەوا کەناری رۆئاوای گۆڕەپانی تەحریری هەڵگرتووە. شاهین و ئەبوزەید چیی تر لەگەڵماندا نین کازیوەی ئەو سەرەتایە لە ئێران، میسر و تەواوی جیهانی عەرەبی و موسڵمانان ببینن، تێیاندا یەکێ بەهیوای ئەوەیە رەنگدانەوەی بلیمەتیی ئەوانە لە گەڕانەوەی هۆشیاریی کۆزمۆپۆلیتانی خەڵک ببینێ. بەڵام لە مردنیشدا، وەک کاتی زیندووبوونیان، یوسف شاهین و ناسر حەمید ئەبوزەید بەردەوام جیهانێکمان پێ پیشان دەدەن کەوا وەک گەردەکانی خۆڵی رووناکی لە بەرچاومان سەما دەکەن (میتافۆرەکەی رومی)، ئاماژەن بەبنەهاتنی ئەگەرەکان بۆ گۆڕینی میتافیزیکەکانی بێهیوایی کەوا بوونەتە هەوێنی روحێکی توندوتیژ. فیلمسازانی وەک شاهین و بیرمەندانی وەک ئەبوزەید دەمێکە لە رووی خەیاڵی و بینینەوە فراوان بوون، تەشەنەیان کردووە لە دەربڕینی زاراوەی ئاینزا و ئیستاتیکی، فەزایەکی گێڕانەوە دروست دەکەن تێیدا ئێمە دەتوانین گوێمان لەو شۆڕشانە بێ کەوا باسی ئەگەرە کۆتا-کراوەکانیان دەکەن.

## جیهان لە خودی خۆیدا

دەستەبەرکردنی ناوەندی یەکسان بۆ دەسکردن بە بەرهەمهێنانی دەستەی مەعریفی بە زمانێک شایەنی ئەو پاڵەوانانە بێ کە ئێستە لە تەحریر و گۆڕەپانەکانی تر هاوار دەکەن. کاتێ خەڵک لە گۆڕەپانی تەحریر و دواتریش لە سەرانسەری هەرێمەکەدا، هاواریان دەکرد "گەل داوای رووخاندنی رژێم دەکا"، هەر تەنیا مەبەستیان رژێمی سیاسی نەبوو، بگرە مەبەستیان

ڕێژیمی حوکمڕان بوو. هەروەها مەبەستیان ڕێژیمی مەعریفەش بوو، هەروەها ئەو زمانەی بۆ ئێمە ماوەتەوە و بەهۆیەوە لە شتەکان دەگەین و ڕەخنەیان لێ دەگرین. ئێمە دەبێ ڕێ بەو ڕاستی و واقیعە ناوەخۆییەکانی ئەو یاخییانە بدەین قسە لەبارەی کۆمەڵێک مانای تازەوە بکەن، نەک چواندنیان بەو شتانەی ئێمە دەیزانین، هەروەها ئەوەی لێی دەترسین، هەروەها کات بەفیڕۆ بدەین لە شەڕکردن لەگەڵ ئەو تارماییانەی بەسەرچوون، نەک چواندنیان بە ئۆریەنتالیزم. ئێمە دەبێ زاڵ بین بەسەر نیگەرانیی ئۆریەنتالیزم و هاوێنە تیۆرییەکانمان بگۆڕین بۆ مێژووی خۆمان و بوەستین لە شیکردنەوەی شتەکان بۆ ئەو مرۆیە سپییانەی لە بیری ئێدوارد سەعیددان تا ماون. ئەو مرۆیە سپییە خەیاڵییە مرد، هەرگیز زیندووش نەبوو. ئەو تارمایی بوو، دروستکراوی سەردەمی پۆستکۆلۆنیال بوو کەوا پەرەی بە ژیان و وەهمی ڕۆژئاوا دا و ئەوانی تری پشتگوێ خست.

لە باتیی دووبارەکردنەوەی قسەی ئێدوارد سەعید کە نزیکەی سی چل ساڵ بەر لە ئێستا گوتوویەتی، بۆ بزانین ئێستە چی ڕوو دەدا، ئێمە دەبێ لە باتیی ئەو دەست بەبیرکردنەوە بکەین: ئەگەر ئەو تا ئێستە لەگەڵ ئێمە بژیبا چی دەگوت و چۆن بیری دەکردەوە. لەبەر یەک شت، لە باتیی هەوڵی شیکردنەوەی گرینگیی ئەوەی ڕوو دەدا لە گۆڕەپانی تەحریر بۆ هەندێ دەسەڵاتی باڵای ڕۆژئاوا، دەبێ ئاسۆییانە بیر بکەینەوە. با سەیرێکی کارە بەراوردکارییەکانی لەمەڕ ئاسیا، ئەفریقیا، ئەمەریکای لاتین، هێڵی نێوان ئێران و عەرەب، هی نێوان سونە و شیعە، نێوان مەسیحی و موسڵمان و هێڵی نێوان ڕەوتی ئاینی و عەلمانی بکەین. لەبەرئەوەی ئەمانە شرۆڤە و تێگەیشتنی گرینگن و پڕ بایەخن کە ئێمە پێویستمان پێیانە، زۆر نزیکترن لە واقیعی زیندوو لە چاو ئەو کارانەی کە شەکەت بوون بەبیرۆکەی سەقەت و مردوو.

ناسر حەمید ئەبوزەید و یوسف شاهین پێکەوە هاتن، دوو لەنێو گەلێکی

تردا، تا گەردوونێکی سەلماندنی خودی ئیستاتیکی و ئاینی دروست بکەن، کە واقیعەکانی جیهانی عەرەبی لەخۆ گرت و پێناسەی کردن، پیرۆز و ناپیرۆز تێکەڵ بکەن، تووڕە و ناتووڕە. چی شتێکی هاوردە کۆتاییی بە ئۆریەنتالیستەکان و گۆشەنووسەکان هێنا، چونکە بەس شتی بێ مانایان باس دەکرد، تەنیا بۆ دڵخۆشکردنی ئەوانی تر بوو؟ چیی تر ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز سەرچاوەی تۆمارەکان نییە، چیی تر سی ئێن ئێنیش ناتوانێ میدیای ڕۆژئاوا بکاتە دەنگی دەسەڵات. ئەوە ماوەیەکی درێژە سەنتەری خەیاڵ و وەهمی ڕۆژئاوا نەتوانراوە بێتە وەستاندن. چی دەبێ ئەگەر بەملیۆنان کەس نەتوانن عەرەبی، تورکی، یان ئوردو بخوێننەوە، قەتیش گوێیان لە کارە ئاینییەکانی ئێمە نەبێ، قەت نەگەن بە واتاسازی، فەیلەسووفان، ڕۆماننووسان، شاعیر و سۆفی یان زانایانی ئێمە و تێیان نەگەن؟ ئێمە ئەوان دەناسین، هەروەها ئەو زمانەی پێویستمانە دەیزانین قسەی پێ بکەین، بنووسین و گۆرانیی پێ بڵێین، پێی بگرین و مشتومڕ بکەین، خۆپێشاندان بکەین و قەناعەت بەوانی تر بێنین.

نزیکەی شەست ساڵ زایۆنییەکان ئەورووپایان هێڕ کرد بەیادی هۆلۆکۆست تا فەڵەستین بدزن، هەروەها دەستیان کرد بە یەک پروپاگەندە کە تاکی نەبوو لە مێژوودا، تەواوی ئیمپراتۆر لە خزمەتیان دابوو. پاشان چی؟ یەک ڕۆمان لەلایەن غەسان کەنەفانی، شیعرێک لەلایەن مەحموود دەرویش، کورتە فیلمێک لەلایەن عالیە سلێمان، دۆکیومێنتەرێک لەلایەن مەحموود مەی میسری، وتارێک لەلایەن ئێدوارد سەعید، کتێبێک لەلایەن جۆزیف مەساد، هەروەها چەندان نەوە دەستیان کرد بە پرچەککردنی خۆیان بە زانیاری، ئەقڵ، بەڵگەنامەکان، سەلماندن، وێڕای ئەمانەش، باشترین کەشتیی ئازادیی جیهانی بۆ غەزە، ئەمانە ژیانی شایستەی خۆیان خستە مەترسییەوە بۆ پێشاندانی دڕندایەتی و تاوانی دەوڵەتی کۆمەڵایەتیی ئیسرائیل. دەبێ ئەم بازرگانییە ماندووکەرە بوەستێنین کە

شـەڕ دەكەين لەگەڵ خـەياڵی خـۆمـان. ئەكاديمـی مـوسـڵـمـان و عـەرەب لە ئەمـەريكای بـاكـور و ئەوروپـای رۆژئاوا مـەشـقـيـان پێ دەكـرێ، ئەمـانـە بە مەبەستە و دەيانەوێ يادگەيان تێک بدەن. لايەنی كۆمەڵايەتيی رووخۆشيمان شـتێكی جيـهانييـە (جوو، مـەسيحی، مولحيد، گەنج، پير، پياو، ئافرەت، نێـربازی، دەوڵەمـەند و هـەژار)، گـەلێ دوژمـن هەن لە رۆژهـەڵات. ئاخـۆ بن عەلی، موبارەک و خومەينی خـەڵكی رۆژئاوان يان رۆژهـەڵات؟ رۆژهەڵات چيی تر رۆژهەڵات نيـيـە، رۆژئاواش چيی تر رۆژئاوا نيـيـە. بەيەک گـەيشـتن. رۆژهـەڵات رۆژئاوايە، رۆژئاواش رۆژهـەڵاتە. هـەروەها دەبـێ ئەو پرسـيـارە گـەمـژانـەيە چی نەكەينەوە: "ئەرێ چينەكانی خواروو دەتوانن قسە بكەن؟ بێگومان دەتوانن و كردووشيـانە. چينی خـواروو پێويستيـان بە نوێنەر نييە، پێويستيـان بە بەتيـرۆركـردن و تۆقـاندن نيـيـە لەلايـەن هـەر بەشـێكی ئەدەبی بەراوردی ئينگليـزی. ئەمـە وانەی بەرگـەگری ئێـدوارد سـەعـيدە، كـە وای كرد زمـانـە ئازاديخـوازەكەی لە بەشی ئينگليزی نەبێ، هەروەها تا مـردنی هـەر رەخنەی لەسـەر بوو لەلايەن هـاوەڵەكان، ئـەوانەی كـە خـەباتی خـەڵكيـان لێڵ دەكـرد لە رێگەی پەخشان و ئەو سـياسـەتەی تەنانەت هـاوەڵانيشـيان تێی نەدەگەيشـتن، بـا ئـەو گـەلانە خـۆيان ژيانـی خـۆيان بخـەنە مـەترسی بۆ ئازادی، دادوەری كۆمەڵايەتی و شكۆمـەندی. تەمـاشايەكی شەقـامەكـان، كوچە و كۆڵانەكان و گـۆڕەپانەكـان بكە لە جـيـهـانی عـەرەبی، لەوسـەری تـا ئەوسـەری لە ٢٠١١ بەولاوە، چينی هـەژار قسـە دەكا، عـەرەبەكان قسـە دەكـەن. لە راسـتيدا توند هـاوار دەكـەن: گەل داوای رووخاندنی رژێم دەكا. تا ئەوپەڕی شكۆمەندييە و سادەيە، با چيی تر ئەمانە نەشێوێنين.

### مەعريفەی ئەو شتانەی دەكرێنەوە

هـاودژيـيـەكی دەنگـەكـان هـەيە لە نێـوان ئـەو رووداوانەی پێش دێن و ئەو زمانەی ئێمە وەسـفيـان پێ دەكەين. ئەو هـاودژييـە لە روويەكی ئاينييەوە بەم

شـێـوەیە بەرهەمـدارە: بیـرکـردنەوە و نووسین لەبارەی پرسـە کـاتی و گرینگەکان بۆ تێنووێتیی خۆیان پێویستی بە هاوسەنگییەکی وردبینی و تێـڕوانینەوە هەیە. هاوسەنگییەکە دەبێ قـووڵ بێ و تەمـاشـای خـاڵی وەرچەرخانی شتەکان بکا، ئەو شتانەی کە نابینرێن. ئەمە کارێکی وەها ئاسان نییە. سروشتی فرە لایەنی ئەمە و هەواڵەکان بە جۆرێکە کەوا بەدەرە لە هەر پێوەرێکی مانادار. چوار مانگی یەکەمی ٢٠١١ بێنە بەرچاوت، کە بە راپەڕینی یەک لە دوای یەکی خێرا لە تونس و میسر دەستی پێ کرد و پاشان وەک ئاگرە کێوی بڵاو بووەوە و گەیشتە مەغریب، سووریا، بەحرێن و یەمەن. ئەو کرانەوە مێژووییە کتوپڕ هاتە وەستاندن بەهۆی زەماوەندی شاهانەی بەریتانی لە کـۆتاییی ئەپریلی ٢٠١١ (هەرچەندە هێـزەیلی ئۆپۆزیسیۆن لە لیبیا، سووریا و بەحرێن بەردەوام بوون لە شەڕ). بۆ ماوەی چەندان رۆژ، بەتایبەتی وارگەی ئەلیکترۆنیی بی بی سی، وازیان لە بەهاری عەرەبی هێنا و هەموو گرینگییان بە زەماوەندی شاهانە دا. هێشتا ئەو بۆنە رەنگاوڕەنگە تەواو نەبووبوو، بۆنەی شکۆمەندیی پاپا جۆن پاولی دووەم لاپەرەی یەکەمی میدیای داگیر کرد، هەموو چاوی میدیا چووە سەر ڤاتیکان. بایەخێکی زۆر کەم درا بە مردنی ئوسامە بن لادن، کە ساتێکی ئێجگار مەزن بوو، لە دوا سەعاتەکانی یەکی ئایاری ٢٠١١ لە هەواڵەکان پێشان درا. لەم کاتەدا، رووداوە شۆڕشئاساکان لە جیهانی عەرەبی پشتگوێ خرا بوون.

ئەم داپۆشینە ساردە پرسیارێکی گەورە دروست دەکا لەوەی چۆن قسە لەسەر پەلەییی رووداوە گەورەکان دەکرێ، بە چ رستەسازییەکی شرۆڤەئاسا، بە چ مۆرفۆلۆجییەکی تیۆری. شایەنبوونی رووداوەکان بۆ بەرەی پێشەوە بەشێوەیەکی سەیر هەموان بڵاوی دەکەنەوە بەهۆی بێهێزکردنی چوارچێوەی شرۆڤەیی کەوا خەڵک بایەخ بە خوێندنەوەیان دەدا. ئەگەر بمانەوێ باکگراوندێکی مێژوویی بەپێی پسپۆڕی بوارەکە

بدەین، وەک چۆن گەلێ پسپۆڕی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست خێرا هاتن ئەم کارە بکەن بۆ میدیای جیهانی، بێگومان گێڕانەوەی ئەو چیرۆکانە تێکەڵ بەو شتانە دەکەن پێشتر زانیویانە. یاسای پسپۆڕان، هەروەک تیمۆسی میشێل دەڵێ، ئەوەیە ئەو شتە باس دەکەن کە ئێمە لە پشتەوەڕا دەیبینین، بەشێوەیەک باسی دەکەن کە ئاشنایە بەوەی ئێمە دەیزانین. لێرەدا پرسەکە هەر تەنیا ئەوە نییە ئەم جۆرە دیاردانەی وەک مەلاریا، شەکراو، شەڕ، یان ناشنالیزم پێکەوە پێش دێن، هەروەک میشێل پێشانی دەدا، بۆ بەرهەمهێنانی سیاسەتی دەوڵەتی مۆدێرن، بەڵام، ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەوانە بابەتی زانراو پێک دێنن کەوا دێتە بەردەمی هەموومان. پسپۆڕان شت وەبەر دەهێنن لەو شتانەی لایان ئاشنایە، لەسەر حسێبی تێکدانی شتی تر، باس لە هەندێ شت دەکەن کە شارەزاییان لێی نییە، سەیری ڕووداوەکان چۆن باس دەکەن، دەڵێم سەیر، چونکە تا ئێستە سەیریان پێ دێ و وەستاون و چاوەڕێ دەکەن.

لەبەرئەوەی ئێمە شتە نوێیەکان لەگەڵ ئەو شتانە تێکەڵ دەکەین کە پێشتر دەیانزانین و پێمان ئاشنان، ڕووداوە مەزنەکان دەبن بەئاماژکە بێ ئەوەی خەڵک گرینگییەکەی بزانن، هەندێ هەن هێندە پێی نیگەرانن، وا هەست دەکەن هەڕەشەن بۆ سەر خۆشگوزەرانیی ئەوان، بۆیە ئەو بیرکردنەوە ڕاستە کە ئێمە دەیکەین بۆ تێگەیشتن یان شیکردنەوەی ئەو ڕووداوانەی کەوا لە ڕاستیدا دژی بیرکردنەوەن. ئەمەش ئەو شتانە دەشارێتەوە کە ئێمە دەمانەوێ ئاشکرایان بکەین. هاودژی لێرەدایە ئێمە دەبینە خزمەتکاری پشتگوێخستنی خۆمان لە ڕێگەی هەوڵدان بۆ بەرهەمهێنانی مەعریفەیەکی هەڵە. ئەمە تەواو لایەنێکی ئاینیی هاودژ نییە، لە ڕاستیدا، تەوسە چونکە نووسین بەپێچەوانەوە وامان لێ دەکا بابەتێکی هەڵەی خۆمان بەرهەم بێنینەوە، ئەو بابەتانەی کە ئێستە تێیداین و ئەوانەشی کە پێشتر هەمان بوو (سەردەمی کۆلۆنیالی) جیاوازن.

بۆیە لەوانەیە بگەڕێینەوە سەر قسەکەی مارکس کەوا ئێمە پێویستمان بەگۆڕینی جیهانە، نەک هەر تەنیا لێکدانەوەی. بەلاّم لەم کەیسەدا بەلای من وێ دەچێ گۆڕینی جیهان کە ئێستە وا دەکرێتەوە لە بەرچاومان تەواو پشت دەبەستێ بە لێکدانەوە دژەکان، لێکدانەوەیەک لە دژی بابەتی مەعریفیی خۆمان. من دەڵێم "دژە لێکدانەوە" لەبەرئەوەی پێم وایە تەواوی بیرۆکەی لێکدانەوە ئێستە پێویستی بە رەچاوکردنێکی نوێیە، لە دیدێکی ئاینزاوە نا، بگرە لە دیدێکی کۆلۆنیالیتی کە تێیدا ئێمە بابەتین بۆ لێکدانەوە، ئەوە خۆمان بووین بووبووین بە بابەت بۆ لێکدانەوە.

بەبێ کشاندنەوەی دەسبەجێی ئەو چەشەیەی (ستیمەنگی هایدگەر) روونکردنەوەی دۆخی کۆلۆنیالیتی و ئەودیو پۆستکۆلۆنیالیتی، ئێمە هەرگیز ناگەین بە بیرکردنەوەیەکی پێویست بۆ ئەو پڕۆژەیەی ئەمڕۆ دەیخوێنینەوە و رزگارکەری سپێدەیە. هەروەها ئەمە پشت دەبەستێ، بۆ نموونە، بەوەی کەوا سوپای ئەمەریکی و قەلاّی سەربازیی ئەمەریکا بۆ ئیسرائیل خۆیان نوێ کردەوە دوای (ئەوەی پێی دەڵێن) قاعیدە، بۆ ئەوەی لە بەرچاوی خەڵکی کۆن نەبن، بۆ ئەوەی خەڵک بزانێ ئەوان ئاساییین، چەکدار نین، ئازان، گەلی کەللەڕەقن، تا بڵێین ئەوانە هەڵدەستن بێ ئەوەی پەنا بەرنە بەر چەک، بەپێکەنینەوە، خۆشی و سەماکردن و گاڵتەجاڕی نەک هەر تەنێ ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی بگرە تەواوی سیاسەتی بێهیوایی کە ئەو خەڵکەی چەواشە کردووە. هاودژییەک هەیە لە نێوان خوێندنەوەی واقیع و بەڵگەی راستەقینەی ئەو واقیعە، ئەمە دەوەستێتە سەر کەللەڕەقییەک کەوا ئەم راپەڕینە شۆڕشگێڕانەیە بەزۆر شت گرێ دەدا، ئەو زمانەی کە قسان دەکا و شتەکان ئاشکرا دەکا، تا هەموو کارێکی خوێندنەوە ببێتە هەوێنی ئازادی و دەربازبوون لە چنگی مێژوو و بابەتی پۆستکۆلۆنیالی.

## ئۆریەنتاله یاخیبووەکان

"گەل داوای رووخـانـدنـی رژێم دەکا." سـەدای ئـەم دروشـمـە، بە یەک ئیـقـاع ملیۆنان کەس دەیلێنەوە، جیـهـانـی عـەرەبی و مـوسـڵـمـان دەلـەرێنێتـەوە، بە شێوەیەک کەوا لەوانەیە رژێمی مـەعریفە هەڵوەشێنێ کە ئەمـڕۆ بەو ناوە (واتە ئۆریەنتالی یاخیبوو) بانگیان دەکا. ئەمـە زمانـی یاخیبوونە لە جیـهانـی عـەرەبیـدا. لە سـازدانـی ئـەو یاخیـبـوونە، زمـان هـەمـوو شـتێکە، لەبەرئەوەی جیهان لەو شوێنەیە زمان تێیدا دێتە گۆ: ئەو زمانەی ئێمە پێی دەژین، چەند زمانێکیش هەن دەمێکە چاوەڕێ دەکەن بێنە گۆ. زمـان دەوەسـتێتـە سـەر ئـەو راسـتییەی کە ئێمـە جیـهانێکمـان هەیە، نەک هـەر جیـهانێک بێ تەواو، بگرە جیهانێک ئێمە هـەوڵی بۆ دەدەین بیگۆڕین. بەڵام زمانـی جیـهانەکە، هـەروەها ئەو جیـهانانـەی بالادەسـتن بەهـۆی چەند زمـانێکی وەک ئینگلیزی، فـرەنسـی، ئیتالی، عـەرەبی، چینی یان فـارسـی، هـەروەهـا ئەو جیـهانانـەی ئێمە پێکیـان دێنـین و لەناویاندایـن، تاکــە جـیـــهــان نین لـە دنیــا بوونـیــان هـەبێ. تـەنیــا جیـهانێکە بە ویسـتـی هـەبوونی دەسـەڵات و ویسـتـی بالادەسـتـبوون. ویسـتـی بەرگەگرتنی ئەو دەسـەڵاتە چەندان زمانـی تری هـەیە، هێشتا نەدۆزراونەتەوە، بۆیە گەلێ جیـهـانـی تر بەڕێوەیە ئاشکرا بن. لـەم سـاتـەی ئێمـە قسـەی تێدا دەکەین، زمـانمـان دەگـۆڕێ، دەگـۆڕێ دژی هـەمـوو شـتـە نـابەجێکان. لەوانەیە ئەمـڕۆ بەهـۆی زەمــاوەندێکی شــاهـانە بـەلارێدا بچـێ، بـەیانـی بەهـۆی بۆنەی شکۆمـەندیی پاپا، دووبەیانـی بەهـۆی کوشتنی یەکێکی تیرۆریسـتـی خـەیاڵی، بەڵام زمــانـی شــۆڕش هـەمــوو دنیــا دەلەرێنێــتــەوە و دەڵێ: گــەل داوای رووخاندنی رژێم دەکا. ئەو رژێمە هـەر هـی بن عەلی، موبارەک، قەزافی یان بەشـار ئـەسـەد نییە. هـەروەهـا ئـەمـە ئەو زمانـەیە کەوا ئەوانەی بە ئێمە ئاشنا کرد.

ئەو زمـانـەی ئێمـە دەیبیـسـتـین لەو شـۆڕشـانـەدا نە ئیـسـلامـییـە و نـە غـەیرە

ئیسلامی، نه رۆهەڵاتی و نه رۆئاوایی، نه ئاینی و نه عەلمانی، ئەمە زمانێکی جیهانییه، له قووڵایی ئەزموونی مێژوویی گەلێک له جیهاندا دێ، دێ بەرەو جیهانێک، زمانێکه هیچ کلێشەیەکی بەسەردا نەسەپێنراوه. خۆی دەرباز کردووه له هەموو کلێشەیەک، ئەم زمانه دەقێکی جیهانی دەنووسێتەوه، جیهانی ئەوانی تر، هەردەم بۆنی چەندان جیهانی تری لێ دێ بیاندۆزێتەوه، هێشتا ماویەتی، ئێسته ئەم جیهانه وا بەرێوەیه که ئێمە شەڕی بۆ دەکەین. بەڵام ئەو جیهانەی تر لەودیو مردن یان باوەڕەوه نییه، ئا لێرەیه، ئێستەیه، جیهانەکه وا له بەرچاومان دەست پێ دەکا، بەڵام رێیەکەی دووره، کەچی هەر باشه و بەردەوام بەرەوپێش دەچێ.

چۆن ئەو فـەزایه روونـه؟ له وتارێکی زۆر باش بۆ جـەدەلیـە، "بەهاری عەرەبی و پایزی ئەدۆنیس"، شاعیر، رۆماننووس، فیلمساز و وتارنووسی عێراقی سینان ئەنتون لەسەرەخۆ رەخنه له سیاسەتی هاودژی مەزنترین شاعیری زیندووی عەرەب دەگرێ، شاعیری پیری سووری ئەدۆنیس (١٩٣٠-...)، که نەیتوانی پاڵپشتی راپەڕینی شۆڕشگێڕی جیهانی عەرەبی بکا.

لەو سۆنگەوه رەنگه باش بێ رەچاوی ئەو گۆشەیه بکەین که ئەدۆنیس بیست ساڵ زیاتره لەمەوبەر بۆ ئەلحەیاتی سعوودی رۆژانەی نووسیوه. هەرگیز وشەیەکی نەگوتووه دژی کار و سیاسەتی رژێمی سعوودی، بەڵام زۆرجاران هەمان بیرۆکەی ئۆریەنتالی "بیری عەرەبی" دەجوێتەوه و ئاستەنگه ئاڵۆزەکانی بەردەم جیهانی عەرەبی کەم دەکاتەوه له رێی دووباره لێکدانەوەی ئاین. ئەو سووره لەسەر ئەوەی عەرەبەکان ئێستە زیندانی رابردوون و بیرۆکەی تاک بوونی نییه له کولتووری ئیسلامی-عەرەبی، بۆیه عەرەبەکان دەبێ یەکەم جار یاخی بن له دژی باڵادەستیی عەشیرەتەکانیان.

کاره دووسەرانەکەی ئەنتون دان بەوەدا دەنێ ئەدۆنیس کاتی خۆی

شـــاعـيـرێكی مـــەزن بوو لـەنێـو شـــاعـیـرانـی گـەنجی ئەو سـەدەیە، وێڕای بەرەنگاربوونـەوەی نـووسین و رەخنـەكـــانـی. كـــاتێ رەشــــەبای شـــۆڕش دیكتاتۆرەكانی لە تونس و میسر رامالّی، ئەنتونی تژی لە ئازار گوتی:

بیرمەندی شۆڕشگێڕ قایل نەبوو بەوەی خەڵكی كردبوویان. ئەو گوتی، ئەوەی لەو شوێنـانە رووی دابوو یاخیـبوونی گەنجان بوو. هێندەی پێ نەچوو، هـاوەلاّنـی لـە ســــووریا لـە دژی رێژیمی دیكتـاتۆری بێ بەزەیی هەسـتـان كـەوا چەندان سـاڵە خـەڵكی خنكاندووە. رەنگە هەر ئەوە لە شـاعـیـرێك پێشـبـینی بكەی كـە سـلاّو بكا لە بوێریی هـاوولاّتیـیـانی بۆ چەك كـە لـە بەرامـبـەر گـوللەی رێژیمێكی دڕندە وەسـتـاون، جگە لـە دەنگ و ویژدانیـان چیی تریان پێ نییـە. بەلاّم ئەدۆنیس هیچ شـتـێكی لەو جـۆرەی نەكرد.

بەڕای ئەنتـون، ئەدۆنیس گـیـرۆدەی دەسـتی زمـانێكی كـۆن و مـاندووە، ئەمەش خراپترین شتە تووشی شاعیرێك بێ. ئەنجامی نووسینەكەی ئەنتون هـاودژە بەلاّم شتی تێدایە:

سـەردەمـێك ئەدۆنیس، ئەو رۆشـنـبـیـرە، پێشـەنگی كولتـوورێكی شـۆڕشگێڕی و رەگ و ڕیشـەیی بوو، بەلاّم دەمـێكە ئەو سـەردەم باوی نەمـاوە. ئەدۆنیسی شـاعیر، بەتایبـەتی ئەدۆنیسی جـاران، هەردەم لە دژی شـیـعـری مـۆدێرنـی عـەرەبیـدا دەبێ. بەجـۆش و سـەرسامییەوە شیعرەكانی دێنە خـوێندنەوە، بەلاّم رەنگە كاتی ئەوە هـاتبێ ئـەدۆنیس بێتە لەبیركرن، ئەو رۆشـنـبیـرە رادیكال و رەخـنـەگـــرەی كـــولتـــوورییـــە. بەهاری عـــەرەبیی ئـەدۆنیس، شۆڕشگێڕی راستەقینە، تۆمەتبار دەكا بەوەی خۆی بەدوور گرت لێی.

هۆکاری سەرەکی لێرەدا کاتە. بەڕاستی کاتی خۆی، لە قووڵایی سیاسەتی بێهیواییدا، ئەدۆنیس ڕەوانبێژ بوو. بەڵام چیی تر ئەوە نییە لەم سیاسەتی تژی لە هیوایە. دوایەمین تێبینی لە نووسینەکەی ئەنتون زۆر وردە: "ئا ئەمەیە جوانی و شیعری شۆڕش." وەک ئەوەی ئەنتونی شاعیر دەزانێ، شۆڕش شیعری خۆی هەیە. بۆ بیستنی زمانی ئەو شیعرە، بۆ ئەوەی فێری بی و قسەی پێ بکەی، دەبێ ئەو زمانە لە بیر خۆمان بەرینەوە کە پێشتر قسەمان پێ دەکرد و شیعرمان پێ دەنووسی. ئەو زمانەی کە ساڵانێکە ئێمەی عەرەب، موسڵمان، ئۆریەنتال، لاتینۆکان و ئەفریقییەکان پێی ناسراون و لێکدانەوەمان لەسەر دەکرێ. چۆنیەتیی بیرکردنەوە و نووسین لەبارەی ئەو ڕووداوانەی کە وا خەریکە جیهان دەگۆڕن کارێکی زەحمەتە. پێویستیی بیرکردنەوەی نەک هەر تەنیا ڕەوتەکە بگرە مگێڕی بەرهەمهێنانی مەعریفە لەم جیهانەی ناسراوە بە "جیهانی عەرەبی و موسڵمان" بەپەلەترین ئەرکە لە بەردەم هەر یەکێک کە خەم لە داهاتووی خەڵک دەخوا، ئەو خەڵکەی وا بێ چەک لە دژی دەسەڵاتی دڕندەی نێو ئیمپریال قیت بووەتەوە.

## لقەکانی بابەتی سەرەکیی ئۆریەنتالیست

پۆلێنی کۆلۆنیالی "جیهانی عەرەبی و موسڵمان" زیاتر دەشارێتەوە لەوەی ئاشکرای دەکا. چینەکانی بەرهەمی مەعریفە لەبارەی ئەو ناوچانەوە گرێ دراون بە وشەی "ئۆریەنتالیزم"، لە ئۆریەنتالیزمی ترس و دژایەتیی یۆنانییەکان لە دژی فارسەکان، بۆ ئۆریەنتالیزمی ڕکابەریی ئیمپراتۆری هەنگارییەکان و عوسمانییەکان، بۆ ئۆریەنتالیزمی باڵادەستیی فەرەنسا و بەریتانیا لە دژی عەرەب و هیندییەکان. ئەگەر بێینە سەر زاراوەکانی لەمەڕ ڕاپەڕینە شۆڕشگێڕییەکانی ئەمڕۆکە، ئێمە دەبێ مێژووی ئۆریەنتالیزم پاک بکەینەوە و بەمێژووی بکەینەوە، نەک درێژی بکەینەوە. لەنێو ئەم مێژووەیە

ئێــمــەی "ئۆریەنتــالیــست" بـووینـەتە بـابەتگەلی مــردووی گـێــڕانەوەی ڕۆهەڵاتناسـەکان. ئەمە ئەرکی نـەوەی "ئۆریەنتال"ەکانە زاراوەی ئازادیخـواز دەربڕن، ئەمـە دەمێکە لە شـەقام و کـوچە و کـۆڵانی نیشـتمـانـەکانمان ڕوو دەدا، نەک درێژکـردنـەوەی ئەو نابـەجـێـیـەی لـە گـێـڕانەوەی شت و کـار و ڕووداوەکان دەکرا.

ئۆریەنتـالیـزم ڕەوتێکی تایبـەتی بەرهـەمی مـەعریـفی بوو کەوا زۆر دەمـێک پێش کۆلۆنیالیزمی ئەورووپی بەچەندان فۆرم دەستی پێ کـرد: لە سـەردەمی یۆنانییەکانـەوە تا سـەردەمی ڕۆمەکـان، لە چاخی ناوەڕاسـتەوە، پاشـان بـە نێو گەشەی تایبـەتی ڕێنیسانسی ئۆریەنتالی ئەورووپی کەوا چارلس شـواب باس و سـتـایشی دەکا و پـاشـان بۆچوونی مـۆدێرنـتـری ڕۆئاوایی هـاتنە گـۆڕێ کەوا ئێدوارد سـەعید دیراسـەی کـردن و ڕەخنەیانی لێ گـرت. بەڵام ئەو ڕەوتانەی بەرهـەمی مـەعریفیی ئەورووپی باویان نەمـا لەگەڵ کۆتاییهاتنی کـۆلۆنیالیـزمی کـلاسیـکی، ئەو کـاتە بابەتـی لێکۆڵینەوە بوو لـە کـاتی جـەنگی سـارد، بۆیە من پێی دەڵێم "مـەعریفـەی فڕێدراو" و پەیدابوونی "سـیسـتـمی نوێی جیـهـانی". ویستی ئۆریەنتالیست بۆ مەعریفە مـانیفێستۆی ویستی کۆلۆنیـالی ئەورووپی بوو بۆ دەسـەڵات. ویستی بەرگـەگرتنـی ئەو دەسەڵاتە دەبێتە هـۆی ویسـتی دژە مەعریفە، کە من باس کرد، پێویستی بەیەکێکە بیگێڕێتەوە. موسڵمـان، عەرەب و ئێرانییـەکان لێدوانی وایان داوە کە هـیـچی نەهێشـتـووەتەوە بـۆ بابەتگەلی کۆلۆنیالی، بەهـۆی پێوەندیی تایبەتی ئەو دەسەڵاتەی کە ئەوانی کرد بە بابەت.

لەم لێکۆڵینـەوە کـلاسـیکەی بنـەمـاکـانی بەبابـەتکردنی ئـەورووپی، مـایکل فۆکەڵت باسی بنەمای مەعریفیی زمانەوانی، ئابووری و بایۆلۆجی دەکا وەک ناوەندی کـاریگەر بەهۆیانەوە "مرۆڤ" وەک بابـەتێکی زانراو کـرا بەشـتـێکی ئاسایی. هـەر بەهـەمان هـەناسە، ئەو کارەکتەری کە کۆدی "ئۆریەنتال"ی خرا پاڵ، هـەروەک شـاکـارەکـەی ئێـدوارد سـەعـیـد پێـشـانـی دەدا، وەک شـتـێکی ئۆریەنتـالیزم، وەک ڕەوتێکی بەرهـەمی مـەعریفی لەبارەی ئۆریـەنتالەوە، ئەمـە

کارێکی خود-ڕەپێشکارانەیە.

بەڵام ئۆریەنتالیزم تاکە ڕەوتی بەرهەمی مەعریفی نەبوو کە تێیدا ئۆریانتال دروست کرا. لە شوێنەوارناسیدا، ڕۆهەڵاتی نزیک و ڕۆهەڵاتی دوور هاتنە پشکنین لە گەڕان بەدوای قۆناخە سەرەتاییەکانی پێشکەوتنی مرۆڤ بە بەشداریی کۆمەڵێک پسپۆڕی ئەوروپی. لە مێژوودا، لەسەر بنەمای ڕێچکەی هیگڵی، جیهانی کۆن، واتە هیندستان، میسر، فارسەکان بە تایبەتی، هاتنە تاقیکردنەوە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر کرا بە بەشداریی پسپۆڕی ئەوروپی کە گەیشتنە ئەوپەڕی شوێنی مەبەست. لە زمانەوانی، ئەنسرۆپۆلۆجی، ئیتنۆگرافی و زانستی سیاسی، کۆمەڵگە غەیرە ئەوروپییەکان بە چاوێکی سووک تەماشا کران و لە دید و تێڕوانینی بەرۆئاواییەکان قسەیان لەسەر کرا. لە بیردۆزگەلی بەمۆدێرنکردن، ئۆریەنتالەکان پێیان دەگوترا نەریتی و گوایە پێویستیان بەمۆدێرنکردن هەیە، واتە دەبێ بەرۆئاوایی بکرێن. لە ئابووریدا، ئێستە خراونەتە جیهانی سێیەم، چونکە بەردەوام لەژێر کاریگەری ئابووریدان و بوونەتە کەرەستەی خاو لێیانەوە شت دروست دەکرێ بۆ جیهانی یەکەم.

لە کاتێکدا فۆکەڵت تەنیا تەماشای کامپەکانی ئەوروپای کرد بۆ دانانی بنچینەی قسەکانی لەبارەی ئەقڵی ئەوروپا و پەنابەرانەوە، بۆیە ئەوروپای کردە بابەتێکی سەرەکی و ئۆریەنتالەکانیشی کردە بابەتێکی لاوەکیی خزمەتکار، کە ئەقڵیان لە چۆکیاندایە. ئەقڵی ئەوروپا لەسەر بنچینەی ئاقڵ و نائاقڵ، هەروەها تاوانبارانی پابەند بە یاسا وەسف کرا، بابەتی ئۆریەنتال بە ژەهراوی، شێتی تاوانبار، لادەری سێکسی وەسف کران. سەبارەت بە پرسی سێکس، ئۆریەنتال بوو بەبابەتی سەرپێچیکەری سێکسی، بۆیە فەزای ئۆریەنتال بووە فەزایەکی پێشێلکاریی سێکسی، هاوکات وێنەی ئەوروپییەکان (مەسیحییەکان زیاتر) وەها پێشان درا کەوا کۆنترۆڵی ئەو پێشێلکارییەک دەکەن، ئەمە وێنەیەکی پۆزەتیڤی ئەگەرەکانی "شارستانیەتی

رۆژئاوا"ی پێشان دا.

بۆیە، هەر لە هەمان سۆنگەوە، بە چپە و خشپەی کۆلۆنیالی، ئێمە بووین بە بابەتی موسڵمانی بەهۆی پیادەکردنی هێڵی نێوان: شێت و گەمژە، نەخۆش و تەندروست، تاوانبار و پابەند بە یاسا، هۆمۆسێکسوال و هێترۆسێکسوال. ئەم پیادەی هێڵە جیاوازانە دێتە جێبەجێکردن بەهۆی ئەقڵی دەسەڵاتی کۆلۆنیالی و جەربەزەییی بەرهەمی مەعریفیی دەسەڵاتەکە: دەسەڵاتی بە کۆلۆنیکراو دەبێتە شتێکی شارستانی بەهۆی بەربەریکردنی ئۆریەنتال. ئەمەش واتە: پێشکەوتوو بەرامبەر بەدواکەوتوو، تەندروست بەرامبەر بەنەخۆش، ئەقڵانی بەرامبەر بەسۆزیار، دادوەرانە و ڕەوا لە بەکارهێنانی توندوتیژی بەرامبەر تاوانی شێتانە و تیرۆریستی. جۆرج دەبلیو بوش بێنە بەرچاوت، لەژێر ناوی ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لە کارەسات، گوایە ناچارە توندوتیژی بەکار بێنێ لە دژی ئەفغانستان و عێراق. بوش بەراورد بکە لەگەڵ ئوسامە بن لادن، مەلا عومەر و سەدام حوسێن (ئێستە بێگومان شتێکی تر پەیدا بووە بەناوی مەلا شێتەکان)، ئەمانە هەمووی بە تاوانباری شێت وەسف دەکرێن و گوایە دەیانەوێ جیهان تێک بدەن. هەروەها لە کاتێکدا، تەواو ڕەوایە بۆ ئیسرائیل چەکی ئەتۆمیی هەبێ چونکە شارستانییە، سپییە و ئەقڵانییە، ئێرانییەکان ناتوانن ئەو چەکەیان هەبێ چونکە بەربەرین، شێتن و تیرۆریستن.

ئەم جیاکردنەوانە هەر تەنیا لە دەرەوە نەهاتوونەتە سەپاندن، بگرە لە ناوەخۆش جەختیان لەسەر دەکرێتەوە و پاڵپشتی دەکرێ، بەتایبەتی ئەو دەمانەی دەبن بە بابەتی ڕەخنەگرتن. دروستکردنی ئایدیۆلۆجییەکی چالاک و شەڕانگێزی ئیسلامی (ئیسلام وەک ڕێکخراوێکی چەکدار پابەندە بە کۆتاپێهێنانی کۆلۆنیالیزمی ئەوروپی) زیاتر لەلایەن بیرمەند و چالاکوانانی موسڵمان هاتە ڕێکخستن، نەک لەلایەن ئۆریەنتالیستەکان. کەواتە ئۆریەنتالیزم و تەلارسازانی ئایدیۆلۆجیی ئیسلامی (لە جەمالەدین ئەفغانی

بۆ سەید قوتب و لەویشەوە بۆ عەلی شەریعەتی) دوو دیوی هەمان دراو بوون، یارمەتیی مانەوە و گەوجکردنی ئەو جیاوازییانەیان دا کە دواجار "ئیسلام و رۆژئاوا"ی لێ کەوتەوە. هەموو کارەکان لە دروستکردنی نەتەوەیەکی دژە-کۆلۆنیال، کە ئەنجامەکەی قەزافی، موبارەک، بن عەلی و عەلی خامەنەیی و دەستوپێوەندیان بوو، لەگەڵ دروستکردنی شەڕانگێزانەی عەرەبچییەتی، ئێرانچییەتی و تورکچییەتی، ئەمانە هەمووی بەرهەمی ئەو جیاوازییانەن، لە کاتێکدا موسڵمانەکان گەڕان بەدوای سەلماندنی ئەوەی ئەوان باشترن لە "رۆژئاوا".

"رۆژئاوا" پێوەرێکی گرینگی پیادەکردنی ئەو جیاوازییانەیە. ئاساییبوونی تۆماتیکی "رۆژئاوا"، رەگی داکوتاوە لە ویستی ئیمپریالیانەی دەسەڵاتەکەی، سەنتەر و هەوێن بووە تەنانەت بۆ دەرخستنی مرۆی رۆژئاوا بە مرۆیەکی ئاسایی و نۆرماڵ. هەروەک جۆزیف مەساد لە کتێبەکەی بەناوی "عەرەبە ئارەزوومەندەکان" (٢٠٠٧) روونی کردووەتەوە، بەنێودەوڵەتیکردنی بیرۆکەیلی کۆلۆنیالی سێکسی مرۆ هەردەم هەوێن بووە بۆ تێکوپێکشاندنی مۆدێرنیتەی عەرەب لەسەر حسێبی بەراوردکردنی لایەنی سێکسیی ئەوان و کۆمەڵگە داگیرکراوەکان. لە رێگەی چەقبەستوویی بەردی بناخەی رۆژئاوا، چیی تر حوکمرانی پێوەندییەک نییە لە نێوان دەوڵەت و تاک، بگرە لە راستیدا پێوەندییەکە لە نێوان مەرجی کۆلۆنیالیتی و ئەگەری بە مشتومڕی پۆستکۆلۆنیالیتی. "رۆژئاوا" هەوێنی کۆلۆنیالیتییە، کە لە یەک کاتدا هەم خۆی لە شتان هەڵدەقورتێنێ، هەمیش خۆی بەدوور دەگرێ. هەروەک خەڵک لەسەر شەقامەکان هاوار دەکەن "گەل دەیەوێ رژێم برووخێ"، تووڕەیی نەبڕاوە لە دژی ئۆریەنتالیزم دەیەوێ ئۆریەنتالیزم بەرهەم بێنێتەوە، ئەمەش واتە کەڕکردنی گوێیەکان بەرامبەر بەو هەورەتریشقەی ئەو دروشمانەی سەر شەقام. ئازاد لە تووڕەیی، شۆڕە کۆتا-کراوەکان زمانێکی رزگاریخوازیان ئازاد کرد.

## جوینەوەی کارەکتەری شۆڕشگێڕی

مێژووی دروستکردنی بابەتی موسڵمانی مۆدێرن یەکێکە لە جوینەوەکان، کە مـــایکرۆســۆمـی دروســـتکردنی بابـەتێکـی مـــۆدێرنی کـــۆلۆنیـــاڵە، بەبێ هەڵوەشـاندنەوەی سـەربازیی ئەو پرسـە، ئێمـە وەک گەل هـەرگیـز ئازاد نابین. زاراوەی "مـۆدێرن" لێـرەدا گـرینگە، لـەبەرئەوەی ئەم وشـەیە تەواو بـەرهـەمـی مـۆدێرنیـتـەی ئـەورووپای کـۆلۆنیـاڵە، ئەمــەش رووداوێکە لەژێر سـێـبـەری مـۆدێرنیـتـە (سـەرمـایـەداری)ی رۆشنگەریی ئەورووپی رووی دا، یان باشـتـر بڵێم، لە گۆڕینی بێ چرپەی مەسیحییەتی بەکۆلۆنیکراو بۆ عەلمانیەت.

ئەو پرۆسـەی مـێـژوویـیـەی ئێـمـەی کـردە بابەتی خـراپ بۆ تاوتوێکردن (بابەتگەلی وەک ئێرانی، عەرەب، موسڵمـان، ئۆریەنتال و تا دوایـی) هـاوکات بابەتە باشەکان لەژێر ئەو کۆدە کۆ بوونەتەوە کە ناو لە خۆی دەنێ "رۆئاوا"، پرۆسـەیەکی وردە ئێستە خەریکە ئاوەژوو دەبێتەوە لەنێو قۆناخی گواستنەوە و راپەڕین کە بەسـەر هیچ نەتەوەیەک باز نادا. رەوتـی وێرانکاریی دەرەکی و ناوەکی بابەتی خـراپ هـەمـووی لەو جیـهـانە رووی دا کە پێی دەڵێن "رۆئاوا"، ئەو جیهانەی رۆئاوا وەسفی دەکا، جیـهـانێکە لەلایەن رۆئاوا بەجیـهـان کرا و پڕ کرایەوە. ئەمـە ئەو جیـهـانەیە کە پێویستە و دەبێ بێتە گۆڕین. ئەم فـۆرمە جیـاوازانەی بە بابەتکـردن کـاری پێوەنـدییـەکـانی دەسـەڵات بوونە لە نـێـوان داگیرکـار و داگیرکەر، بۆیە حـوکمڕانی شـتێک نییە پێشنیـاز بکرێ لە نێوان دەوڵەتێک و هـاووڵاتییـانـی، بگرە لە نێوان دەسـەڵاتی داگیرکـەر وەک شـتـێکی شـارسـتـانی و بابەتی داگیـرکـراو وەک بەربەری. هـەر رەوتێکی ئازادیخـوازی لەو پێوەندییەی دەسـەڵات تێ بگا، ئەوا دەیەوێ لەنێـو ئـەو جیـهـانەدا بیگۆڕێ کە تێـیـدا سنووردار کـراوە و تژی کـراوە لە خـەوش. تاکە رێگە بـۆ زاڵبـوون بەسـەر ئەو خـۆڕەپێـشکـردن و زاڵکردنـەی رۆئاوا و نزمکردنەوەی ئـەوانی تر لەلایەن رۆئاوا برێتـییـە لە داننان بەجیـهـانەکانی تر، ئا بـەم شێوەیە دەکرێ

زاڵ بین بەسەر رۆئاوادا.

جوینەوەی شۆڕشگێڕانی ئەو دەمە روو دەدا کە شتە ئاساییەکان بە نائاسایی دێنە وەسفکرن، ئەمە لە رەگ و ڕیشە و خودی مێژووەکەیدایە. لە ربی سدیقین لە زانکۆی ئێکزیتەر، بە وردی و بە کەللەڕەقی باسی بەهاری عەرەبی دەکا، هەرچەندە پێی وایە جیهانێکە سنووردار:

منداڵانی شۆڕش، لە قاهیرەوە بۆ تونس، لە مەنامەوە بۆ دەرە، خوای خۆیان و ئەڤەتارەکانی ئازادی و شکۆمەندییان رازی کرد. سەیر بکەن چۆن تووڕەیی، سووکایەتی و چەوساندنەوەیان لەسەر ئاستی بێدەنگیی سیاسی، بەدەربوون لە کایەی کۆمەڵایەتی و نەبوونی لەتە نانێک بۆ بژێویی ژیانیان تەقاندەوە. وەک بڵێی لە رێی تەقینەوەیەکی جەماوەری، خۆپێشاندانەکانیان لە دژی دەوڵەت بە شێوازێکی هێمنانە و ئاشتییانە ساز دا، سروودی نیشتمانییان گوتەوە، کۆرسی سروودەکە هێندە فراوان و گەورە بوو وەک بڵێی دەریایەک بێ لە رۆحی مرۆڤەکان، دروشمەکانی کەللەڕەقییان دەگوتەوە (ئەبولقاسم ئەلشابی) ئاڵای نیشتمانی لە باوەش گرت، لەگەڵ موزیک سەمایان کرد، هەستە سەرکوتکراوەکانیان بەرامبەر بە نادادوەری و دیکتاتۆری دەربڕی. ئێستە پاڵەوانەکانی سیستمی ئۆتۆکراتی عەرەب دەترسن لە هاوار و گۆرانییەکانی کۆرس. ئیبراهیم قەشوشی نەمر، کە گۆرانیی "ارحل یا بشار"ی گوت، هەفتەی رابردوو پاڵی بە خۆپێشاندەرانی حەمەوە نا. گەرووی دڕا لە ٤ی جولای. دەنگ، موزیک، دەبکە (سەمایەکی فۆلکلۆرییە)، تەکنەلۆجیای کولتوور تا ئەوپەڕی جوانی رێک خرا و ئەنجام درا، ئەمانە هەڕەشە لە رێژیمەکان دەکەن و زۆرجاریش کاردانەوە و سەرکوتکردنی توندیان لێ دەکەوێتەوە.

داڕشتنەوەی شۆڕشگێڕی بابەتی ئازادیخواز دەمێکە رووی داوە، تەنانەت لەسەر جەستەی کۆمەڵایەتیش، خەڵکی بێدەنگ و کپ، ئێستە دەنگدارە و دەنگ هەڵدەبڕێ. لە دەنگی ئازادیخوازانەی ئیبراهیم قەشوشەوە دەنگی ئەو باڵندانە دێ کە لە بەرەبەیانەوە دەجریوێنن، لە گەرووی دڕاوی هاشەی ئەو لافاوە دێ کە هەرگیز لە یاد ناچێتەوە لە بیری نەوەکانی داهاتوو.

## چوارەم

## دۆزینەوەی جیهانێکی نوێ

بەهاری عەرەبی لە کوێیە؟ ئەرێ بەڕاست، بەهاری عەرەبی مانای چییە؟ جیهانی عەرەبی ئاماژەیە بەو وڵاتانەی لە زەریای ئەتڵەسییەوە درێژ دەبنەوە تا دەریای عەرەبی، لەوێشەوە بۆ دەریای ناوەڕاست بۆ هۆرنی ئەفریقیا و زەریای هیندی. جیهانی عەرەبی لە ٢١ وڵاتی عەرەبی پێک دێ، نزیکەی ٣٦٠ ملیۆن کەس دەبن. بە رادەی جیاواز و بەواتای جیاواز جۆرە هاوڕایییەکی گشتی هەیە وا دەکات پێی بگوترێ عەرەبی فرە نەتەوە، کە رەگ و ریشەیان دەگەڕێتەوە سالآنی لەناوچوونی ئیمپراتۆری عوسمانی و نوێبوونەوەی سەردەمی کۆلۆنیالیزمی ئەوروپی. هەر بۆ دڵنیابوون، هەرچی لە جیهانی عەرەبی بژی مانای ئەوە نییە خۆشحاڵ بێ بەو زاراوەیە، نموونەش ئەمانەن: کورد، ئەرمەنی و بەربەری. بێگومان لە رووی مێژووییەوە، عەرەب تەنێ لە نیوچە دوورگەی عەرەبی دیار بوون، تا دوای داگیرکارییەکانی موسڵمانان لە سەدەی حەوتەم، سوپاکەلی عەرەبی موسڵمان لە ئەتڵەسییەوە تا ترانسۆخیانا بڵاو نەبوونەوە. هەرچەندە کۆمەڵەی عەرەب لە ١٩٤٥ دامەزرا بۆ نوێنەرایەتیکردنی عەرەبەکان، پڕۆژەی عەرەبچییەتی زیاتر بەهۆی ئەزموونێکی باوی مێژوویی دروست بوو تا نوێنەرایەتیکردنی بیرۆکراتییانە. تا پەیدابوونی بەهاری عەرەبی، هیچ وڵاتێکی عەرەبی دیموکراتییانە حوکمڕانی نەکراوە. تا ئەمڕۆش، وڵاتان لە سعوودیە و بەحرێنەوە بگرە تا دەگاتە ئوردن، سووریا و لیبیا و مەغریب، حوکمڕانی کراون لەلایەن کەسایەتی و مامناوەند و مۆدێرن، بەلآم هیچ

دامەزراوەیەکی دیموکراتییان نەبووە.

بەهاری عەرەبی حاڵەتێکی ئەقڵانییە، پێگەیەکی رکابەرییە، خەونێکە، بەڵێنێکی دواکەوتووە، خۆشییەکی لەدایک نەبووە، دیدێکە، دیمەنێکی دوورە، نیگارێکە بۆ رزگاربوون. ئەمڕۆ، لە هەر شتێکی تر زیاتر، بەهاری عەرەبی بەری یادگەیەکی گشتییە بۆ شەڕکردن لە دژی کۆلۆنیالیزمی ئەورووپی و ئیمپریالیزمی ئەمەریکی، ئێستە تەواو ئاشکرایە لە برینی قووڵی فەڵەستینییەکان بەهۆی داگیرکەریی کۆلۆنیالی ئیسرائیل. بیرەوەرییە دوورەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئێستە تا رادەیەکی زۆر نەماوە، هەروەها دووسەت ساڵی کۆلۆنیالیزمی بەریتانی و فەرەنسی وا لەناو ئیمپریالیزمی ئەمەریکی دەتوێنەوە، ئەمەش گەورەترین هۆکارە لە پشت هەڵگیرسانی بەهاری عەرەبی. نوێبوونەوەی کۆلۆنیالیزمی ئەورووپی لە کاتی دوا دەیەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی بووە هۆی کێشانی نەخشەیەکی مۆدێرنی جیهانی عەرەبی لەسەر ئەفریقیای باکور و ئاسیای رۆژهەڵات.

فەڵەستینییەکان تاکە گەلی عەرەبین رای دەگەیەنن کەوا نیشتمانەکەیان لێ داگیر و زەوت کراوە لەلایەن پرۆژەیەکی زایۆنی کەوا نیشتمانێکی جووانی دامەزراندووە لەسەر حسێبی شکاندنی پشتی گەلانی تر. لەسەر بنچینەی کەلەپووری پێش سەردەمی ئیسلامی، دروستکردنی شارستانیەتی ئیسلامی و ئیمپراتۆرەکانی پێشوو، هەروەها مێژوویەکی درێژی خەباتی دژە کۆلۆنیال، ناشنالیزمی عەرەبی هاوکات بوو لەگەڵ عەرەبچییەتی ناوچەیی کە هەردەم خەونیان بە نیشتمانێکەوە دەبینی لە ئەتڵەسییەوە بەنێو ئەفریقیای باکور بۆ کەناری رۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست. ئەو خەونە قەت نەهاتە دی. بەهاری عەرەبی دەسپێکێکی باشە. هەرگیز وا رێک نەکەوتووە، بەڵام خەونەکە هەردەم لەوێیە، نووسراوە.

## سەنتەر ناتوانێ بوەستێ

لە سەروبەندی لەتبوونی سودان بۆ دەوڵەت و دانپیانانی یو ئێن بەباشووری سودان وەک ١٩٣یەمین وڵاتی ئەندامی خۆی لە ١٤ی جولای ٢٠١١، لامیس ئەندۆنی، شرۆڤەکارێکی پێشەنگی سیاسی و وتارنووس لەبارەی کاروباری عەرەبییەوە، وتارێکی گورزوەشێنی بۆ جەزیرە نووسی و ناوی لە رووداوەکە نا "شتێکی مەترسیدار"، پێشنیازی ئەوەی کرد کەوا بەهاری عەرەبی دەبێ وانە لە پرسی سودان وەرگرێ بۆ ئەوەی وڵاتانی تری عەرەب لەت لەت نەبن بەسەر گرووپی ئیتنی و مەزهەبی.

نوشدارییەکەی لامیس ئەندۆنی، کە سەرچاوەی گرتووە لە نیگەرانییەکی قووڵ و رەوا، گونجاو و لە کاتی خۆیدا بوو. بەم شێوەیە تێبینیی شتەکان بەڕاستی دەکا:

> لەدایکبوونی باشووری سودان یەکەم و گرینگترین ئاماژەیە بە نوشستی پێگەی فەرمیی عەرەب، عەرەبچییەتی، بەتایبەتیش پرۆژەگەلی سیاسیی ئیسلامی بۆ دابینکردنی مافەیلی یەکسان و مەدەنی بۆ کەمینە ئیتنی و ئاینییەکان لە جیهانی عەرەبیدا. ئەو خۆشییەی لەبەر سەربەخۆیی لە سودانی باکوری موسڵمانی عەرەبی باڵی بەسەر گەلی باشووری سوداندا داپۆشی بەڵگەیە بۆ هەستگەلێک کەوا ماوەیەکی ئێجگارە زۆر سەرکوت دەکرێ و دەچەوسێنرێتەوە لەلایەن گەلێک کە زۆرینەیان لە سەردەمی دوای سەربەخۆیی جیهانی عەرەبی بوون لەدایک.

ئەوەی ئەندۆنی باسی دەکا شکستی جیهانی عەرەبییە، جیهانێک کە دەبوایە بتوانێ تەواوی پێکهاتە و توخمەکانی لەخۆ بگرێ.

مێژووی سودانی مۆدێرن بەیاخیبوونی مەهدیست دەست پێ دەکا لە دژی عوسمانییەکان (١٨٨٥-٩٩) و بەردەوام دەبێ تا سەردەمی کۆلۆنیال و

بالادهستیی بەریتانییەکان (١٨٩٩-١٩٥٦)، تا سەربەخۆیی و سەروەریی نیشتمانی (١٩٥٦-٨٩)، ئەمەش بووە هۆی کودەتای ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٨٩ لەلایەن عەقید عومەر بەشیر (١٩٨٩-). شەڕێکی ناوەخۆی دژوار لە ١٩٩٥ەوە تا ٢٠١١ دواجار بووە هۆی جیابوونەوەی باشووری سودان لە ٢٠١١. باشووری سودان، کە لە سودان زوێر بوو لەبەر پرسی رەگەزی و مەزهەبی، نموونەیە بۆ لەت لەتبوونی جیهانی عەرەبی.

لەبەر رۆشنایی ئەو مێژووەدا، ئەندۆنی دان بە رۆڵی بەریتانییەکاندا دەنێ لە سوودوەرگرتن و خۆشکردنی ئاگری ئەو پرسە ئیتنی، مەزهەبی و رەگەزییانە. مێژوویەکە لە ئیمپریالیزمی بەریتانی درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە دەسوەردانەکانی ئیسرائیل بۆ پاراستنی دەوڵەتی جوولەکان، دەوڵەتێک قوڕ و لیتاوییە بۆ ئەوان. ئەندۆنی (کە ئافرەتە) قسەی ئاڤی دیچەر، وەزیری تەناهیی پێشووی ئیسرائیل، دێنێتەوە بیرمان: "ئێمە دەبێ سودان بێهێز بکەین و بێبەشی بکەین لە دەسپێشخەری بنیاتنانی ولاتێکی یەکگرتوو. ئەمە پێویستە بۆ پاراستن و بەهێزکردنی تەناهیی نیشتمانی ئیسرائیل. ئێمە تەنگژەی دارفورمان بەرهەم هێنا و ئاگرەکەیمان داگیرساند بۆ ئەوەی سودان نەتوانێ تواناکانی بەرەوپێش ببا." لەگەڵ ئەوەشدا ئەندۆنی هێشتا سوورە لەسەر ئەوەی کەوا جیهانی عەرەبی ناتوانێ وەها ئاسان جیابوونەوەکە تێ بگا و هەرس بکا وەک بەرهەمێکی پیلانی ئیسرائیلی/رۆئاوایی. هەر شتێک بێ، رێژیمێکی چەوسێنەرە لە سودان، تێکەڵە بە سیستمێکی فەرمیی عەرەبیی گەندەڵ و لاواز، ئەمە باشووری سودانی ناچار کرد بچنە ژێر باڵی رۆئاوا و ئیسرائیل و بەدوای سەربەخۆییدا وێڵ بن لە جیهانێکی شکستخواردووی عەرەبی. خەمی ئەندۆنی تەواوی ولاتانی تری جیهانی عەرەبییە، ترسی ئەوەی هەیە کە ولاتانی تری عەرەبی لەژێر هەڕەشەی جوداخوازی هاوشێوەی سودانن. ئەمە ئاشکرایە لەو بارگرژییانەی ئێستە لە ئارادان، کە دەکرێ ببنە هەوێنی

سـوود و قـازانجی هێـزەیلی دژە شـۆڕش کـە ئێسـتـە وەک هەڵۆی برسـی تەماشای بەهاری عەرەبی دەکەن.

عـەرەبەکـان دەبێ ئاوڕێک لە هەڵەی کوشندە و شکسـتـی ئەخـلاقی خـۆیان بدەنەوە لە ڕێـی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ڕاسـتـیـیـەی کەوا خـەڵکی باشـووری سـودان گەلێکی چەوسـاوەن و خـەم و پەژارە و ئازاریان لە دژی حـوکـمڕانـی عـەرەب بوو نەک دژی باڵادەسـتـیـی ڕۆئاوا. ئەوە ڕاسـتـە گـەلی باشـووری سودان لەوانەیە هێشتا خۆیان بە نێچیرێک بزانن بۆ حکوومەتە چڵێسەکانی ڕۆئاوا کـە چاویان بڕیوەتە سـەرچاوەیلی دەوڵەمـەندی سـروشـتـیـی سـودان، بەڵام ئەمـە ئەو واقیـعە نـاگۆڕێ کەوا گەلی وڵاتە نوێیـەکە ئاهەنگیان سـاز دا لەبەرئەوەی لە چنگی نوخبەی عەرەب و موسڵمانی چەوسێنەر هـاتنە دەرەوە.

لامـیـس ئەندۆنی خـاڵەکـانی خـۆی تەسـک دەکـاتەوە بۆ پرسـی گـرینگ و هەستیاری ناشنالیزمی عەرەب و عەرەبچییەتی. بەم شێوەیە دەنووسێ:

هەرچەندە سـەرەتا عـەرەبچییـەتی بزووتنەوەیەکی دژە داگیـرکەر بوو، هەندێ لـە لقەکـانی (بـەتایبـەتی حـزبی بەعسی عـەرەبی کە حوکمڕانی سووریا و عێراقیـان کرد) کۆمـەڵێک کار و سیاسەتی شـۆڤـێـنی و وێرانکەریان گـرتە بەر لـە دژی گـرووپە ئیـتـنی و نەتەوەکـانی تر. کـەیسـی کـورد لە سـووریا و عێـراق بەڵگەیە بۆ ڕادەی جیاوازی سیاسەتی باڵادەستی و ڕەگەزپەرستی لەلایەن هەردوو حزبی سیاسیی بەعس.

هەر تەنیـا لـە سـووریا و عـێـراقدا نـەبوو کـە شـۆڤـێنیـزمی عـەرەبی (کـە هاوشـێـوەیە لە دڕندایەتیی شـۆڤـێنیـزمی ئێـرانی و تورکی) ئەگـەرەکـانی جیـهانێکی فرەی وشک کرد، ئەمـەش ڕەگەزپەرسـتیی ئیتنیی لێ کەوتەوە. ئەنـدۆنی ڕاست دەڵێ کـاتێ ڕەخـنە دەگـرێ لە کـاریگەریی ناشـنالیـزمی عـەرەبچییـەتی لەسـەر کولتووری سیـاسـی، کە، بـەڕای ئەو، هەردەم ئەرێنی

نەبووە. لە باتیان، ڕەوتی ڕەگەزپەرستی و شۆڤێنیی هێندە بەهێز کرد کەوا سەرکۆنە و ڕەخنەی توندی لێ کەوتەوە لەو ڕێگەیەی حکوومەتی نیشتمانیی سودان لە باکور مامەڵەی لەگەڵ گەلی باشوور کرد. لە ڕاستیدا، ئەوەی ئەندۆنی لێرەدا دەیکا شرۆڤەی لەتبوونی ڕەگەزپەرستی و مەزهەبییە کەوا وڵات-نەتەوەی پۆستکۆلۆنیالی دروست کردووە و ئێستەش لەژێر چەپۆکی ڕێژیمی داپڵۆسێنەرن کەوا لەژێر ئاڵای ناشنالیستی و عەرەبچییەتی پاڵیان داوەتەوە.

ئەندۆنی پرۆسەی ئیسلامیشی لە بیر نەکردووە:

بەهەمان شێوە، سودان هەوێنی شکستێکی ترە بۆ بزووتنەوەی ئیسلامی لە جیهانی عەرەبیدا، چونکە تاکە ڕێژیمە تێیدا بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی بالادەست بووە. ڕاستە بزووتنەوەی ئیسلامی لە جیهانی عەرەبی هێندە قەبە نییە و جیاوازە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر، گەلێ بزووتنەوەی ئیسلامی هەن، مەبەست هەر تەنیا یەک بزووتنەوە نییە. بەڵام، شکست لە سودان دەبێ وەڕووی بیرمەندان و سەرانی ئیسلامیدا بدرێتەوە تا چاو بخشێننەوە بە ئەزموونی شکستخواردووی بزووتنەوەیەکی ئیسلامی کەوا دەسەڵاتی لە دەستدا بوو لە وڵاتێکی گەورە و پێشەنگی ئیسلامی.

لێرەدا خاڵی مەبەست لە ناشنالیزمی عەرەبییەوە دەچێتە سەر ئیسلامیزمی چەکدار، هەردووکیان ڕۆڵێکی هاوبەشیان هەیە لە بەلاوەنانی وڵاتە-نەتەوەی پۆستکۆلۆنیال، بۆ ئەوەی هەریەکە بە ڕێی خۆیدا بڕوا. خەمە ڕەوایەکەی ئەندۆنی فرەییە:

ڕەوایە بۆ گەلی وڵاتی نوێی باشووری سودان ئاهەنگی سەربەخۆیی بگێڕن، بەڵام خاڵێکی گرینگیشە بۆ

هەڵوەستەکردن، لە کاتێکدا ڕاپەڕینەکانی عەرەب داوای ئازادی و دادوەری دەکەن، بۆ ئەوەی بیر خەڵکی بهێننەوە کەوا ئێمە ناتوانین سیستمی باشتری عەرەبی دامەزرێنین بەبێ فرەیی، لە باتیی بیرتەسکیی ناشنالیستی یان ئایدیۆلۆجیی ئاینی کەوا تەنیا ناوەندێکن بۆ خزمەتی بەرژەوەندیی دیکتاتۆرەکان.

شرۆڤەکانی ئەندۆنی ئامـاژەن بە شتێکی گرینگتر لەبارەی دیالێکتی شەکەتیی نێوان ئەزموونەکانی سەردەمی داگیرکاری و دوای داگیرکارییەوە. سەردەمی داگیرکاری کۆمەڵێک وڵاتی دوای خۆی دروست کرد، هەروەها لەبەر ڕۆشنایی خراپییەکانی سیستمی داگیرکاری کەوا ئەو وڵاتانەی لێ بوو، کۆمەڵێک کاری خراپتر هاتنە کایەوە. ئەوەی لە خەمەکانی ئەندۆنی ئاشکرایە ئەو ڕاستییەیە کەوا وڵاتەکانی سەردەمی دوای داگیرکاری و مەرجەکانی داگیرکردن تیشکدانەوە و ڕەنگدانەوەی یەکترن. عەرەبچییەتی هەرتەنیا خولێک و کاردانەوەیەک نییە بۆ داگیرکاریی ئەورووپا، بگرە کۆپی پەیست و بەرهەمهێنانەوەیەتی. ئەمەیە گرژی و هاودژیی ناو ناخی عەرەبچییەتی. عەرەبچییەتی بەرهەمی داگیرکاریی ئەورووپایە. ئەو جوگرافیا خەیاڵییەی ئێمە پێی دەڵێین "جیهانی عەرەبی" یان ئەوەتا جیهانیبوونی خۆی بەشێوەیەکی ئازادیخوازانە نوێ دەکاتەوە یانیش بەسەر هاودژییە پۆستکۆلۆنیالیەکانی خۆیدا دەڕووخێ. بەرگریی ناوچەیی بۆ ئیمپریالیزمی زەبەلاح هەر بەردەوام دەبێ بۆ پێناسەکردنی مێژوومان بۆ نەوەکانی داهاتوو، بەڵام تەنیا ئەو بەرگرییانەی کەوا لەسەر بنچینەی دانپیانان و خۆشیی فرەیین کەوا دروستیان دەکەن. وەستانەوە لە دژی ئەو بەرگرییە هیچ نییە جگە لە بەرژەوەندیی دارایی و سەربازی. ئیسرائیل، پاکستان و سعوودیە، بۆ نموونە، وەک یەکن لە دابینکردنی خزمەتگوزارییەکانیان بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان، کە ئایدیۆلۆجی نین، بگرە تەواو ئابوورین. بە ڕووی ئەو ڕاستییە دڕندانەیە، باشووری سودان لە جیهانی عەرەبی

دەبێتـەوە و سنووورە بێـهێـزەکـانی دەخـاتە سـەر گـازی پشت؛ سنووورە خەیاڵییەکان ناتوانن بێنەوە یەک. ئەوەی لەژێر ترسدایە جیاوازییە لە نێوان کولتوورێکی کۆزمۆپۆلیتان کە دەبینێ، ئاهەنگ دەگێڕێ و لەسەر فرەیی دەژیتەوە و، سیاسەتی لەت لەتبوون کەوا رێ بەخوێندنەوەی رەگەزپەرستیی عەرەبچییەتی دەدا غەیرە عەرەب و موسڵمان بخاتە پەراوێزەوە لە رووی ئابووری و دەنگدان و ناتوانێ پێکیان بکا لە ناشنالیزمی بۆرژوازییان.

## گۆڕەپانی تەحریر

هەرکـە بەهاری عـەرەبی دەکـرایەوە، ئەزمی بـەشـارە، کـە کـاریگەرترین رۆشنبیریی هاوچەرخی عەرەبییە، بووە دەنگێکی گرینگی رێنوێنی، ناوەڕۆک و ئاگـەدارکـردنەوە بۆ ملیـۆنان کـەس کـە بەشـدار بوون و بەدوای تێگەیشـتنێکدا دەگـەڕان بۆ راپەڕینە شـۆڕشگێـڕانەکـەیان. بەردەوام دەینووسی و لەسـەر کـەناڵە عـەرەبییـەکـانیش بەدەر دەکـەوت، ئەندامی پێشووی پەرلەمانی ئیسرائیل (فەڵەستینییە و لە ئیسرائیل دەژی)، بەشارە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر تێگەیشتنی خەڵک بۆ شۆڕشەکانی عـەرەب. وتارێکی دا لە زانکۆی قـاهیـرە، کۆلێـجی زانسـتی سـیـاسی لە ناوەڕاستی حوزەیرانی ٢٠١١، دوای ئەوەی بۆ یەکەم جار گەڕایەوە میسر. لە وتارەکەیدا بەئامادەبووانی گوت: "ئەم گەڕانەوەیە بۆ من زۆر گرینگ بوو."

ئەمـیـرە حـەویدی، دوای دەرکـەوتنی بـەشـارە، نووسی "بەشـارە وەک ناوەندێکی گرینگ پەیدا بوو بۆ شۆڕش... بەلایەنی کەم بۆ گەلی میسر کە لە بەشارەوە (٥٤ ساڵ) گەلێ مانایان دۆزییەوە بۆ راپەڕین." ئامادەبوونی بەشارە لە زانکۆی قاهیرە، دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر قەدەغە کرا بووبێتە پایەتەختی رۆشنبیریی جیهانی عەرەبی، تێکەڵ بوو بە راپۆرتەکەی حەویدی بۆ ئەهرام کە باسیـان لە بیرۆکەی رۆشنبیریی فەڵەستینی کرد لەسەر بەهاری عـەرەبی، پێکەوە بناخەیەکی گرینگیـان دانا بۆ دروستکردنی رای

گشتی، ئەمەش شۆڕشی دروست کرد. ژیریی شۆڕشی فرەنسی و ئەمەریکی بەلای هەنا ئارندت ئەوە بوو کە پێش هەموو شتێ دەسەڵاتی گەلیان بە سەرچاوەی شەرعیەت دانا، شۆڕشی ئەمەریکی ئەو دەسەڵاتەی لە پێکهێنانی کۆمەڵەی ئارەزوومەندانەدا بینی. ئەگەر بێتو خڕبوونەوەکەی گۆڕەپانی تەحریر یەکەم مانیفێستۆی شۆڕشی فرەنسی بێ، ئەوا کۆبوونەوەکە لە زانکۆی قاهیرە تێیدا ئەزمی بەشارە ئازادانە قسەی کرد بۆ ئەکادیمی و رۆژنامەنووسان نموونەیەکە بۆ شۆڕشی ئەمەریکی. یەکەمیان توانای بەخشی بە دووەمیان.

سەرسامیی ئەزمی بەشارە بە شۆڕشی میسرییەکان جەخت دەکاتە سەر ئەو ساتەی کاتێ دەستیان گرت بەسەر گۆڕەپانی تەحریر و چۆڵیان نەکرد. بە جەماوەرەکەی گوت لە قاهیرە: "زۆر کەم شۆڕش هەیە لە مێژوو وەک شۆڕشی میسر رێکخراو و رێکوپێک بێ."

زانایی شۆڕشی میسری ئەوە بوو خەڵک توانی لە ٢٥ی جانیوەریدا بڕژێ، بەڵام بەردەوام بوون و درکیان بەوە کرد کە ئەمە گەورەترە لە "رۆژێکی تووڕەیی"... زانییان شتێک لە دەستیاندایە و نابێ بەری بدەن. چارەنووسی خۆیان لە دەستیاندا گرت و گوێیان لە باڵەکانی مێژوو بوو وێک دەکەوتن. زانییان گەڕانەوە بۆ دواوە نییە.

بەواتایەکی تر، لۆجیکی ئاپۆڕەکە لە تەحریر زاڵ بوو بەسەر مێژوو و بەریان نەدا. بەشارە ستایشی بەشداریی جەماوەری کرد لە شۆڕشەکە. "بەشداریی گەلی میسر لە شۆڕشەکە... بەسەر هەر شۆڕشێکی تردا دەکەوێ لە مێژوودا. لە شۆڕشەکانی تردا رێژەی بەشداربوون هەردەم سەتا یەک بووە، بێ لە شۆڕشی ١٩٧٩ی ئێرانی کە رێژەی بەشداربوونی گەل لەسەر شەقام سەتا حەفت بوو." پێوەری ئاپۆڕەکە و ئەو راستییەی کە

گۆڕەپانی تەحریری داگیر کرد توخمی سەرکەوتنیان بوو. ئەم بەشدارییە جەماوەرییە ئاماژەیە بەدەنگی جەماوەر، بێ ئەوە، هیچ کۆمەڵێکی ئارەزوومەندانەی سیاسی ناتوانێ شەرعیەتی خۆی رابگەیەنێ. بەواتایەکی تر، ئێمە لە ساتی سەرەتادایـن، ئەو دەمەی رای گشتیی دەسەڵاتی سیاسیی خۆی دووپات دەکاتەوە و کولتووری سیاسی بەدوایدا دێ. دڵخۆشیی بەشارە، وەک عەرەب و فەڵەستینییەک، راست و سروشتییانە ئاماژە بوو بەو ساتە سەرەتایە.

سروشتیی ئەو شۆڕشانە، وەک ئەوەی بەشارە تێی گەیشتووە، کۆتا-کراوەن، لەبەرئەوەی "شۆڕشەکان دەسەڵاتیان لانەدا، لە دەرگەی دەسەڵاتیان دا، بەڵام بۆی نەچوون." ئەمە ئاکامی گەورەی دەبێ لەسەر مێژووی میسر لە داهاتوو و لەسەر رژێمەکانی وڵاتانی تری عەرەب. ئەمە مانای ئەوە نییە ئاستەنگە گەورەکان کە لە بەردەممانـدایە بێنە لەبیرکردن: "بەڵام ئەگەر شۆڕشی میسری دەسبەجێ بێ... لە دروستکردنی دیموکراسی، ئەوا ناکرێ بە نیوەچڵی بێتە بەجێهێشتن. شۆڕشگێران خەڵکی ئاسایین و متمانەیان بە شۆڕشە. بیانەوێ و نەیانەوێ، دەبێ ببن بەشتەکانی شۆڕش. لێرەدا، بیرێکی دووسەرە هەیە: لە دەرگەدانی دەسەڵات نەک راماڵینی، بۆ دەسەڵات نەچی، بەڵام دەبێ هۆشیار بی بۆ داهاتوو. بێگومان نوشدارییەکەی بەشارە بە گرینگترین ئاستەنگ دەمێنێتەوە کەوا شۆڕشگێڕە میسرییەکان و ئەوانی تر تووشی دەبن بۆ پێشخستنی ویستی خەڵک و وەرگێڕانی دەسەڵات بۆ نێو فۆرمەیلی سیاسی.

هەنا ئارندت دەڵێ: "لە رووی تیۆرییەوە، شکۆمەندیی خەڵک لە شۆڕشی فرەنسی ئاکامێکی گرینگی هەوڵێک بوو بۆ لێک کردنەوەی یاسا و دەسەڵات لە یەک سەرچاوە." ئەزمی بەشارە و بیرمەندانی تری عەرەب هەموو هۆیەکیان هەیە تا شاگەشکە بن بەو ساتە سەرەتایەی رزگاربوون. بەڵام، هەروەک بەشارە خۆی نوشداری دەدا، "لە دەرگەدانی دەسەڵات" بەس نییە،

دامەزراوە سیاسییەکان دەبێ بێنە سەر خەت. سیستم و ئیدیۆمی ئەو وەرگێڕانە گرینگە بۆ سەرکەوتنی ئەو شۆڕشە، لە بناخەی گۆڕەپانی تەحریر و داهاتووی بەهاری عەرەبی.

زەحمەتە میتافۆرێکی باشتر بێنێتە بەرچاو بۆ کرانەوەی شۆڕشەکان لە جیهانی عەرەبی، باشترە لە لەدەرگەدانی دەسەڵات نەک راماڵینی دەروازەی ستەمکاران. چەند رۆژێک پێش ئەوەی موبارەک بێتە خوارەوە، کامێراکانی جەزیرە زوومیان خستە سەر گۆڕەپانی تەحریر و ئەو دەنگۆیانەیان بڵاو کردەوە کەوا خەڵک بەتەمان بەرەو کۆشکی سەرۆکایەتی بکەونە رێ. ئەمە قەت رووی نەدا . هەر لە شوێنی خۆیان مانەوە. ڕایان گەیاند تەحریر شوێنی ئازادییە، کۆمارێکی ئازادە، هەر لەوێش مانەوە. لەوانەیە ئەمە جیاوازییەکی گرینگ بێ لە نێوان راماڵینی باستیل وەک ئاماژەیەکی گەورەی یاخیبوونی سەرەتای شۆڕشی فرەنسی و ئەو ئاپۆڕەی لە تەحریر کۆ بوومەتەوە و داوای لێخستنی موبارەک دەکەن، تەنیا بە یەک وشە ئەو داوایە دەکەن: "ارحل، بڕۆ" کە دەدرەوشێتەوە لەسەر ئاڵاکانیان.

ڕانەماڵینی کۆشکی سەرۆکایەتی و مانەوە لە گۆڕەپانی تەحریر و داوای رۆیشتنی ستەمکار دەنگی خەڵک دووبارە پێناسە دەکاتەوە بە بزوێنەرێکی مێژوو، بزوێنەرێک، وەک ئەوەی ئەزمی بەشارە راست دەکا و دەڵێ، وا لە گەلی عەرەب دەکا ببن بە میتافۆرێکی کۆتا-کراوەی شتێکی تەواو نوێ.

لە وتارێکی رۆژنامەوانی دیاری بەریتانی رۆبەرت فیسک لە کاتی قەباحەتەکەی روپەرت مەردۆخ لە هاوینی ٢٠١١، یەکسەر بزنسمانە ئوسترالییەکە بە خەلیفەیەک بەراورد دەکا: " بەڕای من ئەو خەلیفەیەکە لەنێو ئەو هەموو خەلیفانەی رۆهەڵاتی ناوەڕاست." ئەم قسەی رۆبەرت فیسک ئاماژەیە بەوەی کە باسەکە هەر تەنیا مەردۆخ نییە، بگرە تەواوی رۆهەڵاتی ناوەڕاستە، لەوانەشە لەم کەیسەدا باسکردنی خەلیفە هیچ

پێوەندیی نەبێ بەبابەتە سەرەکییەکە. ئەوەی ئێمە دەیبینین لە جیهانی موسڵمان و عەرەبان، کلێشەی شەکەتی گەل وەک ئەوەی رۆبەرت فیسک دەرەقەتی نایەت، ئەمە هەر تەنیا یاخیبوونێکی چالاکی گەل نییە لە دژی ستەمکاران کە دەمێکە جڵەویان لە دەستە، بەڵکو کارگەلێکن کەوا رەوتی تەواوی مێژوو دەگۆڕن، ئەمەش دەبێتە رەوتێکی کۆتا-کراوە بۆ خۆیان، بۆ میتافۆرە کۆتا-کراوەکانیان و بۆ تەواوی جیهان. شۆڕشەکان خۆیان دادەهێننەوە، لەسەر بنچینەی ئەوە نا لە دژی کێیە، "باری مرۆیە سپییەکان"، بگرە لەسەر بنچینەی ئەوەی ئەو خەڵکە دەیانەوێ کێ بن و ببن بە چی، دەیانەوێ چییان چنگ کەوێ لەوەی هاتوونەتە گۆڕەپانی تەحریر و هاوار دەکەن.

وا بەهاری عەرەبی دەکرێتەوە، ئێمە لە ساتی سەرەتادایین و داهاتوو پێشبینیکراوە. "جیهانی عەرەبی" چیی تر ئەو جیهانەی جاران نەما، بووەتە ئاماژکەیەکی گەورە. شوێنگەلی وەک باشووری سودان لەوانەیە لێی ببێتەوە. بەڵام رووداوەکانی گۆڕەپانی تەحریر ئامازەی گەورەن بۆ چەمکێکی نوێی "عەرەب"بوون، لەوێشەوە جیهانی عەرەبی لەودیو میتافۆرە کۆلۆنیالییەکانی رۆهەڵاتی ناوەڕاست و خەلیفەکان دەبێ. گۆڕەپانی تەحریر ئێستە بووەتە چەقی جوگرافیایەکی نوێی رزگاریخوازی، جیهانێکی نوێ، کە هێشتا ماوە ناوی لێ بنرێ. لەودیو کلێشە رەگەزپەرستییەکان کەوا خەیاڵی کۆلۆنیالی بەردەوام دەبێ بۆ بەکارهێنانی میتافۆری دڕندایەتی و ستەمکاری، جیهانێکی نوێ وا خەریکە دروست دەبێ کە داوای میتافۆری نوێ دەکا و بەرهەمیشی دێنێ. دەسپێکی ئەو جیهانە نوێیە ئەو رایە گشتییەیە کەوا لە گۆڕەپانی تەحریر خڕ بووەتەوە، پێک دێ لە ملیۆنان گەنج، میسرییە پیرەکان، عەرەب، پیاو و ئافرەت، توانای تەواویان هەیە بۆ نوێنەرایەتیکردنی خودی خۆیان.

ئەیمەن محیەدین، رۆژنامەوانێکی ناوداری جەزیرە، پرسیاری لەو شۆڕشگێڕە گەنجە میسرییانە کرد کە لە کافترییایەکی ناو بازاڕی قاهیرە

دانیشتبوون، به چ ڕێگەیەک زانییان شۆڕشەکەیان سەرکەوت یان ژیانیانی گۆڕی. وەڵامەکانیان، کە جۆرەوجۆر بوو، مەرامی لە پشتەوە بوو، ڕەخنەیی، گوماناوی و نادیار بوون، تەواو لە دەوری ئەو ڕاستییە بوون کەوا کۆبوونەوەیان لە کافتریایەکی ناوجەرگەی بازاڕی قاهیرە بۆ جەماوەری جیهانیی جەزیرە ئاماژەیەکی گەلێ گەورەیە بۆ سەرکەوتنی شۆڕشەکەیان. گۆڕەپانی تەحریریان لە بەردەمیاندا بوو، دواتر بوو بەگۆڕەپانێکی جیهانی. پێویستیی زاڵبوون بەسەر جوگرافیای کۆنی "ڕۆژئاوا و ئەوانی تر"، یان "باکور و باشوور" بۆ ئەو پرسە، بۆ ئەوەی باشتر کرانەوەی ڕووداوەکان بگرنە خۆ، پێشتر رووی دابوو، لەو فەزایە فەرمییەی نێوان محیەدین و ئەو شۆڕشگێڕانەی قسەیان بۆ کرد. ئاکامەیلی جیهانیی ئەو پێشکەوتنە ناوچەییانە لە ڕێیانەدان کەوا جوگرافیای سیاسیی جێگرەوە ئاشکرا دەکەن کەوا جیهان بەگشتی پشتگوێیانی خستووە.

مەحاڵە زێدەڕۆیی بکەی لە ئاکامەیلی ئەو گۆڕانە تازانە. بۆ نموونە، گۆڕانەکان بۆ پرسی رزگاریی نیشتمانیی فەلەستینی، کە بەرچاوترین ترۆمای مێژووی مۆدێرنی عەرەبە، لە کاتێکدایە کە ئیسرائیل تووشی ئاستەنگی رژد دەبێ چونکە هەر لەژێر باری کۆلۆنیالیزمی ئەوروپیدایە لە ناوچەیەک کە یاخیبوونە لە دژی پاشماوەکانی جیهانی ئەودیو داگیرکاری. ئیسرائیل تا رادەیەکی زۆر بەردەوامیی خۆی خستووەتە مەترسییەوە وەک دەوڵەتی جوولەکە، یان ئەوەتا تێ دەچێ، یانیش بەشێوەیەکی توند خۆی دەکوژێ، ئەمەیە ئاکامی ئەوەی ئیسرائیل نایەوێ دانوستاندن و مامەڵە بکا لەگەڵ عەرەبێکی رەوا و سەرانی موسڵمان، جا چ هاوڕێیەکەی بێ (میسر) یان دوژمنی (کۆماری ئیسلامی)، بە شێوەیەک ئیسرائیل ناتوانێ شوێنێک بەخۆی شک با لەنێو ئەو ڕاپەڕینە دیموکراتییە ناتوندوتیژیانەی کە چواردەوریان داوە. ئەوەی ئیسرائیل دەیەوێ مامەڵەی لەگەڵدا بکا گۆڕەپانی تەحریرە، هێزێکی ڕاستەقینە و بێ ژماری ویستی دیموکراتییانەی گەلێک

کەوا خەریکە ئەو جوگرافیا خەیاڵییە دەگۆڕێ کە دەوڵەتی جوولەکانی پێوە بەندە.

وەک فەزایەکی جەستەیی، میتافۆرێکی شارستانی و خوازەیەکی شۆڕشگێڕی، گۆڕەپانی تەحریر سەنتەری راپەڕینی میسری و جیهانی عەرەبییە. کاریگەر و چەق بوو لە رووخاندنی حوسنی موبارەک و بەردەوامیش دەبێ، هەر سەنتەری تووڕەیی شۆڕشگێڕەکان دەبێ. جارجار خۆپێشاندەران دەگەڕێنەوە بۆی ئەو دەمەی، بۆ نموونە، داوا دەکەن هێزەکانی تەناهی بدرێنە دادگە لەبەرئەوەی بەرپرسن لە تاوانەکان، یان لە دژی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی بوەستنەوە یان بیانەوێ قسەیان هەبێ لەسەر نووسینەوەی دەستوورێکی نوێ، یان داوای پەراوێزخستنی سەربازی بکەن لە حوکمی شارستانی، هەر کاتێک گەلی میسر بیەوێ، دەتوانێ بچێتەوە گۆڕەپانی تەحریر.

کەناڵی جەزیرە کاریگەرانە بووەتە درێژەپێدەری گۆڕەپانی تەحریر، بووە فەزایەکی رای گشتی تێیدا میسرییەکان و عەرەبەکانی تر گفتوگۆی داهاتوویەکی گشتی دەکەن. ئەگەر ئەفسەرانی پۆلیس دەستیان هەبووبێ لە کوشتنی خۆپێشاندەران و ئازاد کرابن بێ دادگەییکردن، یان ئەگەر هیچ کەسوکارێکی موبارەک نەچێتە دادگە، یان ئەگەر میسرییەکان گومانیان لەوە بێ شۆڕشەکەیان لە مەترسیدایە، ئەوا دێنە سەر شاشەی جەزیرە (گۆڕەپانی تەحریریش باکگراوندی شاشەکە دەبێ)، بە وردی گفتوگۆی پرسەکان دەکەن، کە بە ملیۆنان عەرەب لە سەرانسەری جیهان تەماشای دەکەن. شۆڕشی میسری لە فەزایەکی نێوان ئەیمەن محیەدین و شۆڕشگێڕە میسرییەکان سەرکەوت کاتێ شۆڕشگێڕەکان سوور بوون، بەهیوا و بیرکراوە بوون. ئەمە فۆرم و چوارچێوەی بەخشی بەگۆڕەپانی تەحریر لە بیری ئەواندا.

دەرهاوێشتەکانی ئەم فەزا گشتییە و ئەوەی لەوێ تاقی دەکرێتەوە لە دەستەیەکی سیاسییەوە دێتە دەرەوە و دەبێتە فەزایەکی سەربەخۆ. وەک لیزا هەجچار، لە زانکۆی کالیفۆرنیا لە سانتا باربارا و پێشەنگ لە دەرخستنی ئازار و ئەشکەنجەی جیهانی، بوێرانە دەپرسێ: ئاخۆ شۆڕشەکان جیهانی عەرەبی رادەماڵێ، بەرپەرچیان دەدرێتەوە بە هێزەیلی توندوتیژی دژە شۆڕش، وەک بەشێک لە شەڕ لەسەر بەکارهێنانی ئەشکەنجە؟ وەڵامەکەی هەجچار بۆ ئەم پرسیارە نموونەییە:

کوشتنی دڕندانەی خالید سەعید لەلایەن پۆلیسی میسری لە ٦ی حوزەیرانی ٢٠١٠، ڕووداوێکی دەسپێکەر و سیمبولی بوو بۆ شۆڕشی میسری. پەیجی فەیسبووک بەناوی "ئێمە هەمووەمان خالید"ین چەق بوو بۆ بلۆگەرە مردووەکە، هەروەها زۆر گرینگیش بوو بۆ ئەو ڕووداوانەی کەوا نیو ساڵ دواتر روو دەدەن. هەفتەی رابردوو، لە یەکەم ساڵوەگەڕی کوشتنی خالید، چالاکوانانی شۆڕشگێڕی دژە ئەشکەنجە وێنەی خالیدیان لە هەموو قاهیرەدا بڵاو کردەوە. شۆڕشگێڕی میسری و بلۆگەر حوسام حەمەلاوی وارگەیەکی ئەلیکترۆنیی دروست کرد بەناوی پیگیپیدیا بۆ دۆکیومێنتکردنی لیستێک لە جەلادانی مویارەک و وێنەی هەمووشیانی بڵاو کردەوە. ئەگەر مەعریفە دەسەڵات بێ، حەمەلاوی دەڵێ، ئەوا پێشاندانی وێنەی ئەو پیاوانە وا لە شۆڕشگێڕان دەکا بیانکەن بە نیشانەی خۆیان، داوا بکەن و سوور بن کەوا ئەوانە دەبێ بچنە بەردەمی دادگە. پیگیپیدیا هەوڵێکە بۆ بەخشینی ددان بە ئارەزووی سیاسەتی "هیچ شوێنت نییە بۆی رابکەی و خۆتی لێ بشارییەوە." یان، وەک ئەوەی هەندێ خەڵکی ئەفریقیای باشوور جارێک گوتیان، قەت لە بیر مەکە و قەتیش خۆش مەبە.

تا ئەشکەنجەدەر زیندوو بێ، نیشانەیەکی رەوایە بۆ دادگەییکردن، ئەگەر بێتو هەلومەرجەکان راست بن. (گوێتان لێیە، هێنری کیسنجەر و جیک چینی هێشتا زیندوون؟)

بۆیە، بەڵای هەججار، لاشەی ئەشکەنجەدراو و کوژراوی خالید سەعید پەیکەرێکە بۆ ئەو هاووڵاتییانەی کە نازانن بۆ مردنی ئەو لە گۆڕەپانی تەحریرن و بوونەتە میتافۆرێک بۆ کرانەوەی فەزای گشتی و گەیشتن بە جیهانی عەرەبی، هەتا بۆ پەنجە درێژکردن بۆ هێنری کیسنجەر و دیک چینیش.

## دەرخستنی دووڕووییەکان، چەپ و راست

لەبەرئەوەی بەهاری عەرەبی پێتەوە، راستە و درەوشاوەیە، لە قووڵاییی هیوا و خەونەکانی گەلێ نەتەوە هەڵێنجراوە، دەمێکە هێزەیلی مێژوویی و مادی چاوەڕێی وەها رووداوێک بوون. بۆیە دەبێتە پێومرێک بۆ ئاشکراکردنی دووڕوویییە شاراوەکانی هێزەیلی کۆن: چەپ یا راست، لەگەڵ یان دژە ئەمەریکی. دروستکردنەوەی جیهانی عەرەبی لە واقیعدا و دەرکەوتنی وەک میتافۆرێکی بنیاتنان لە گۆڕەپانی تەحریری پێگەی گشتی هیچ بەردێکی هاوێژراو ناگەڕێنێتە دواوە. ئەمەش ئەرکێکی هێندە ئاسان نابێ، دەستەبەریش ناکرێ بە هەڵواسینی دیکتاتۆرێک یان رووخاندنی پەیکەرێک، وەک ئەوەی ئەمەریکاییەکان وایان زانی دوای رووخاندنی سەدام حوسێن لە عێراق. هێزەیلی دژە شۆڕش ئەمانەن: لە ولاتە یەککرتووەکانەوە تا کۆماری ئیسلامی، لە ئیسرائیلەوە تا حزبوڵڵا. دوژمنە راستەقینەکان ئێستە بەدیار کەوتن، دیارە یەککرتووشن لە پێگەی دژایەتییان بەرامبەر بە لۆجیکی ناخی بەهاری عەرەبی، ئەوان هەر دوور دەبن لە راستی و گرینگییەکانی گۆڕەپانی تەحریر، کە نیشانەیەکی چالاکیی جیهانی عەرەبییە بۆ نێو جیهانێکی نوێ، داڕشتنی نەخشەی ئەخلاقیکی نوێ و جوگرافیایەکی نوێیە.

چەند هەفتەیەکی مابوو راپەڕینی شۆڕشگێڕی بگاتە سووریا لە کۆتاییی بەهار/سەرەتای هاوینی ٢٠١١ کەوا هێزێکی سەرەکی لە جیۆپۆلەتیکی

ناوچەکە، حزبوڵڵای لبنانی، بە سەرۆکایەتیی سەید حەسەن نەسروڵڵا، ئامارکەی گەورەی پێشان دا کە بەو راپەرینە تووشی کێشەیەکی گەورە دەبێ. بەڵام ئەمجارە نیگەرانییەکانی سکرتێری گشتی بەهۆی ئیسرائیلەوە نەبوو، یان لە سیاسەتی مەزهەبی لبنان، کێشەکانی سەید حەسەن ئەمجارە لەوەدا بوو کە خۆی شەرکەرێکی کۆنە و هیچی لەباردا نەماوە. کێشەکانی لە هەموو لایەکەوە روویان تێ دەکرد: بەهاری عەرەبی، بەرەبەیانی جوگرافیایەکی ئازادیخوازی نوێ شەپۆلانە گەریلاکەی لە پشتەوە بەجێ هێشتبوو. بەهاری عەرەبی ئەم جۆرە شەرەوانەی بە زیادە دانا و هیچ حسێبی بۆ نەکرد، زەمانە رەوان و خێراکەی ئێستە کەوتووەتە تەتەپەتە و بۆ وشە دەگەرێ. دوو ساڵ بەر لە بەهاری عەرەبی، پێی وابوو رزگاری بوو لە رەتکردنەوەی راپەرینی دیموکراتی لە ئێران (لەوێ رێژیمی درندە تاکە سەرچاوەیەتی)، پێی وابوو ئەوە پیلانێک بوو لەلایەن ئەمەریکا، ئیسرائیل و سعوودیە. بەراستیش وابوو، دەربازی بوو، بە هاوکاری و ستایشی رۆشنبیری بێ ئاگا و چەلاوخۆری عەرەبی کە وایان دەزانی مەحموود ئەحمەدی نەژاد و سیستمی ئاینی ئیسلامی پاڵەوانن و لە پێشەوەی بەرەی "بەرگری"دان بەرامبەر ئیمپریالیزمی ئەمەریکا/ئیسرائیل لە ناوچەکە و بۆیە نابێ رەخنەیان لێ بگیرێ. پاشان تونس، میسر، لیبیا، بەحرێن، یەمەن راپەرین، ئەمە بۆ حەسەن نەسروڵڵا و عەلی خامەنەیی مۆتەکە بوو، پاش هەموو ئەمانە سووریا هاتە پێش. ئەمە دیمەنێکی خەمناک بوو: وەختێک شەروانێک بوو بە هێزی مێژوو دادەنرا، ئەوەی لە تواناشیدا بوو تەنیا وەنەوز و گەوزدان بوو لە ختوخۆرایی.

کاتێ حەسەن نەسروڵڵا هات بەرگریی لە رێژیمی بەشار ئەسەد کرد لە سووریا، کە خۆپێشاندانە ئاشتییانەکەی رادەماڵی، نیشانەی لەروالاوازی بەسەر هەموو جەستەی شەروانە کۆنەکەدا دیار بوو. داوای لە سوورییاییەکان کرد ئارام بگرن. دانی پیانا کەوا هەڵە کراوە لەلایەن

سووریاییەکان لە لبنان. بەڵێنی دا کەوا ئەسەد چاکسازی دەکا. بۆ کات دەپارێتەوە. بۆ بیرخستنەوە: بۆ بزووتنەوەیەکی وەها نائاسایی، سەرکردەی حزبوڵڵا بە شای ئێران دەچوو، هەوا و دەنگی وەک ئەو بوو لە چەند رۆژێک پێش لەناوچوونی لە سەرەتای ١٩٧٩: بێئومێد، شێواو و هەڵچوو بەهۆی دراما کراوەکە، نیگەران و ترسی هەبوو لەو هەموو ئەو شتانەی لە چواردەوری روویان دەدا، دەترسا لەوەی دەستی لێ بدەن.

جەزیرە لە راپۆرتێکیدا لە ٢٥ی ئایاری ٢٠١١دا گوتی : "حەسەن نەسروڵڵا داوای لە سووریاییەکان کردبوو پشتگیریی بەشار ئەسەد بکەن و دیالۆگ لەگەڵ حکوومەت بکەن بۆ بەکۆتاهێنانی ئەو نارەزاییە چەند هەفتەییە لە سووریا." بەڵام ئەم دۆخە هاوارێکی لە دوورەوەی راپەرینی دیموکراتییانەی ئێرانە کە لە حوزەیرانی ٢٠٠٩ دەستی پێ کرد، کە نەسروڵڵا دەسبەجێ بەپیلانی ئەمەریکای ناو برد. عەرەب هەبوون لە دژی سەرکردەی درندە و گەندەڵیی خۆیان هەستان، نەک "فارسەکان" کە پارەیان باش بوو بەڵام خەباتی مێژووییان بۆ ئازادییە مەدەنییەکان لەژێر پرسیار بوو. "بەشار رژدە لە سازدانی چاکسازی، نەسروڵڵا ئێستە لە جەماوەرەکەی دەپارێتەوە، "بەڵام دەبێ پێدا پێدا و بە رێیەکی بەرپرسیارانە بیانکا." ئەو دەمەی ئەو قسانەی کرد، زیاتر لە ١٠٠٠ سووریایی لەلایەن سوپا و هێزەیلی تەناهیی بەشار ئەسەد هاتبوونە کوشتن. تاوانی درندانەی تر بەدوای ئەمەدا هاتن، سووریاییەکانیان ناچار کرد نیشتمانیان بەجێ بێڵن و بچنە تورکیا. ئەشکەنجەی درندانە و پیس و کوشتنی هەمزە خەتیب هێشتا لە بیردا دەزرنگایەوە، کاتێ بە دەستی هێزەیلی تەناهیی سەرۆک بەشار ئەسەد، وەک راپۆرتەکەی جەزیرە دەڵێ، شکۆمەندیی کورێکی ١٣ ساڵان هێند نزم کرایەوە تا گەیشتە ئەوەی پارچە گۆشتێک بێ و تەنیا تێیان هەڵدا، سووتاندیان، ئەشکەنجەیان دا و ئەتکیان کرد، بەردەوام بوون تا دوا قیژەی منداڵەکە وەستا. نەسروڵڵا، کە ئاشکرا یاخیبوونی

هاوەڵەکانی وەلا نا، ئێستە بۆ جاری دووەم لای هێزەیلی تەناهیی شێت، تاوانبار، دڕندە و ستەمکار دەگرێ لە دژی ئارەزووە دیموکراتەکانی گەل، یەکەم جار لە ئێران وای کرد لە ۲۰۰۹، ئێستە لە سووریا، ۲۰۱۱. ئەمە چ جۆرە "شەڕوانێکی ئازادیخواز"ە؟ واز لە شا بێنە، نەسروڵڵا ئێستە زیاتر بە سەرۆک فرانکلین د. روزڤێلت دەچێ، کە جارێکیان باسی دیکتاتۆری نیکاراگوا، ئەناستاسیۆ سۆمۆزای کرد (۱۸۹٦-۱۹٥٦) کە "لەوانەی کوڕی سۆزانییەک بێ، بەڵام ئەو کوڕی سۆزانیی ئێمەیە؟ نەسروڵڵا خەمی ئەوەی نەبوو ئەسەد و خامەنەیی خەڵکی خۆیان ئەشکەنجە دەدا و دەکوشت، چونکە پێکەوە بزنسیان هەبوو.

سەتان فیلمسازی سووریایی و هاوەڵانیان لە تەواوی جیهان لە بەیاننامەیەکدا گوتیان: "ئەمڕۆکە هاووڵاتیی ئاشتییانەی سووریا دێنە کوشتن لەبەرئەوەی داوای ماف و ئازادییە سەرەتاییەکانی خۆیان دەکەن. ئەمە هەمان چەوساندنەوە و گەندەڵییە کە زیندانییانی سووریایی هێشتووەتەوە و ئازادیی خۆیان قووت داوە، چەندان ساڵە مۆڵک و ژیانی خۆیانیان لێ تاڵ کراوە، ئەمڕۆش وا جەستە و خەونیان دێنە کوشتن." حەسەن نەسروڵڵا نەیتوانی واش بڵێ، وا پێ دەچوو خەمی نەبێ یان هیچ کار لە سۆزی نەکرابێ کاتێ دەیان گەنجی ئێران هاتنە رفاندن، ئازاردان، بەزۆرگێکردن و کوشتن لە کاتی راپەڕینی مەدەنییانە بۆ مافەکانیان لە ۲۰۰۹. کەرتێکی شەڕانگێزی رۆشنبیری عەرەب و ئەمەریکی (بێ گوێ بوون یان جیاوازییان نەبوو بۆ خەباتی مێژوویی ئێرانییەکان بۆ ئازادییە مەدەنییەکانیان) لای ئەویان گرت لە ناوزەدکردنی بزووتنەوەی سەوز لە ئێران بە پیلانی سعوودیە/سی ئای ئەی. بەڵام، بێ گوێدانە ئەمانە، سووریایی و ئێرانییەکان سەرقاڵ بوون بە داڕشتنەوەی نەخشەیەکی نوێ بۆ چارەنووسی خۆیان. سەید حەسەن نەسروڵڵا و لایەنگرانی بە ئاشکرا هیچیان پێ نەبوو لەم مێژووە.

تاکە زەمان حەسەن نەسروڵڵا تێی گەیشت، هەرکە تەماشای مێژووی کرد وا لە دواوە بەجێی دێڵێت، ئەو زەمانە بوو کە لە دەسەڵات هێشتییەوە، سەرکۆنەی ئەمەریکا، یەکەتیی ئەورووپا و ئیسرائیل و سعوودییەکانی پێ کرد. کاتێ تونس راپەڕی، ئەو گوتی: "ئێمە دەبێ پیرۆزبایی لە گەلی تونس بکەین بۆ ئەو شۆڕشە مێژووییە، خەباتیان و راپەڕینیان." وای زانی ئەمە تەنیا بەسەر هاوپەیمانە ئەوروپییەکاندا دێ، بۆیە پێی باش بوو. هەرکە میسر هەستا، ئەو گوتی: "لە تونس و میسر، ستەمکاران رۆیشتن... ئێمە داوا لە گەلی میسر و تونس دەکەین یەک بگرن، لەبەرئەوەی لەت لەتبوون دەبێتە هەوێنێک بۆ زیندووبوونەوەی حوکمڕانەکانی پێشوو." ئەمەش لەو کاتەدا بوو وای زانی ئەمە تەنیا بەسەر هاوپەیمانانی ئەمەریکیدا دێ. بەڵام بۆچی وتارێکی هاندانی نەنارد بۆ گەلی ئێران لە کاتێکدا رێک ئەو شتەیان کرد کە گەلی میسر و تونس کردبوویان، راپەڕین دژی ستەمکار؟ لە باتیان رێکوپێک هات ئیدانەی راپەڕینی ئێرانی کرد. لای ستەمکارانی وەک بن عەلی و حوسنی موبارەکی گرت. لەسەر شاشەی مەنار گوتی ئێران لە دەستێکی بە توانای هاورێکەی "ئایەتوڵڵا خومەینی"دایە. تەنانەت چاویشی نەترووکاند. بۆ ئەو ئەمە کاتی چاکەدانەوە بوو.

کاتێ لیبیا راپەڕی، حەسەن نەسروڵڵا گوتی:

> گرووپێک گەنج لە پیاو و ئافرەت راپەڕین و ڕووبەڕووی گوللە کرانەوە. شەڕ بەسەر شۆڕشی جەماوەریدا سەپێنرا. ئەوەی لە لیبیا روو دەدا شەڕێکە سەپێنراوە لەلایەن رژێم بەسەر ئەو گەلەی کە ئاشتییانە داوای گۆڕان دەکا. ئەم گەلە ناچار کران بەرگری لە خۆیان بکەین و شەڕ بکەن لە رۆئاوا و رۆهەڵات، باڵەفڕگەی شەڕ، مووشەکهاوێژان و جبەخانە داگیرکردنی ۱۹۸۲ی لبنان و شەڕەکانی ئیسرائیلمان بیر دەخەنەوە. ئەم جۆرە تاوانە خراپانە دەبێ ئیدانە بکرێن و گەلی شۆڕشگێری

لیبیاییش دەبێ یارمەتی بدرێن و بێنە پاراستن.

ئەمە هەمووی ئاسایی و باشە. بەڵام جیاوازیی چی بوو لە نێوان گەلی ئێرانی یان سووریایی لەگەڵ لیبیایی؟ لە لیبیایی و سووریاش "گرووپێک گەنجی پیاو و ئافرەت راپەڕین و رووبەڕووی گولله کرانەوە." ئاخۆ گرتنی هەڕەمەکی، ئەشکەنجە و بەزۆرگاییینیش نەسەپێنرا لەلایەن رێژیم بەسەر ئەو گەلەی کە ئاشتییانە داوای گۆڕان دەکەن"؟ ئاخۆ خوێنی ئێرانی یان سووریایی تەنکتر بوو لەچاو خوێنی لیبیاییەکان بەلای نەسروڵڵا؟ ئەمە چ جۆرە بەرگرییەک بوو، بەرگری بۆ کێ؟ بەرگری بۆ فراوانبوونی ئیسرائیل لەلایەن کۆمەڵێک چەتەی چەکدار کە گەلی خۆیان لە سووریا و ئێران دەکوژن و دەخۆن؟ ئاخۆ ئەمە ئەو ئیختیارە بوو خەڵک هەیبوو؟ کاتی شەڕوانەکە بەسەر چوو. بەڕ لەژێر پێی هەڵتەکێنرا.

هەمان دووڕوویی و چەتەبوون لە کەیسی یەمەن و بەحرێن بەدیار دەکەوێ. لایەنی درەوشاوەی بەهاری عەرەبی لەم ساتە مێژووییەدا ئەوە بوو دووڕوویی هاوشێوەی ئەمەریکای پێشان دا لەسەر بەحرێن، سعوودیە و یەمەن، هەروەها هی حەسەن نەسروڵڵاش لەسەر ئێران و سووریا. نەسروڵڵا گوتی "ئێمەی لبنانی نابێ دەست لەو شتە وەردەین کە لە سووریا روو دەدا، با سووریاییەکان خۆیان کێشەی خۆیان چارەسەر بکەن." بەڵام دوای "تەداخولی" لبنان لە مەغریب، ئێران، بەحرێن و یەمەن، بۆچی لە سووریا نا؟ " ئێمە دەبێ هەر گەمارۆیەک لەلایەن ئەمەریکا و رۆئاوا رەت بکەینەوە کە داوا لە لبنان دەکا کە دژی سووریا بوەستنەوە،" ئەو دووپاتی کردەوە. بەڵام بۆچی بڕیارەکانی یو ئێن لە دژی ئیسرائیل باشن، بەڵام بڕیارەکانی یو ئێن لە دژی سووریا باش نین؟

ئەو حەسەن نەسروڵڵایە تەواو ئاگەدار نەبوو لەوەی لە دەوری رووی دەدا. ئەمە روون بوو کاتێ درەنگ سەرنجی دا ئەمەریکا "بەنیاز بوو شەپۆلی

پاڵپشتانی دیموکراسیی راپەڕینە جەماوەرییەکان بدزێ کە جیهانی عەرەبی رادەماڵی." بێگومان ئەمەریکا دەیویست وا بکا، ئێستە دەیەوێ، بەڵام ئەوەی نەسروڵڵا کردی دوورخستنەوەی شۆڕش بوو، لای بەشار ئەسەد و عەلی خامەنایی گرت؟ ئێستە نەسروڵڵا لە دەرەوەی بازنەیە، کش و مات کرا، مێژووی خستییە ناو زبڵدان، بەهۆی بەهارێکی مەزنی عەرەبی تێیدا هیچ رۆڵی نەبوو، هیچ قسەی نەبوو، هیچ دەسەلاتیشی نەبوو بڕیارێک بدا. لە تاقیکردنەوەی مێژوو کەوت، زانی کەی واز لەو ستەمکارانە بێنێ دڵسۆزن بۆی و هێشتی گەلی خۆیان بچەوسێننەوە. باش سەیری گۆڕەپانی تەحریری نەدەکرد. لای دیوە هەڵەکەی مێژووی گرت.

بەڕێککەوت نەبوو مەحموود ئەحمەدی نەژاد (خێرا دوای ئەویش عەلی خامەنایی) هەمان قەوانی حەسەن نەسروڵڵای لێ دایەوە، بەرگریی کرد لە رژێمی سووریا، چونکە ئەمان هەموویان پارچەی یەک کوتاڵن. بەڕای ئەحمەدی نەژاد، ئەوەی لە سووریا رووی دەدا پیلانێک بووە لەلایەن ژمارەیەک وڵاتی ناوچەکە، "لەبەرئەوەی سووریا بەرەی پێشەوەی بەرگرییە و کۆماری ئیسلامیش شان بەشانی وڵات و نەتەوەی سوورییایی دەوەستێتەوە." بەڵام، وڵاتی سووریا نەتەوەی سووریای دەکوشت. یەکێ نابێ لای هەردووکیان بێ. لای رژێم بی واتە پاڵپشتیکرنی کوشتنی گەل، کە کۆماری ئیسلامی بەڕاستی وای لە گەلی خۆیشی کرد لە بەرچاوی ئەحمەدی نەژاد و بە رەزامەندیی بەپەرۆشانەی نەسروڵڵا.

لەگەڵ ئەوەشدا، هاوکاریی ئەحمەدی نەژاد بۆ رژێمی سووریا نابێ ئەو راستییە بشێوێنێ کەوا کۆماری ئیسلامی هاوکاریی حەماس و حزبوڵڵاشی کردووە. لە بەرگریکردن لە تەرخانکردنی بودجە بۆ ئەو دوو رێکخراوە، ستراتیجیستە سەربازییەکانی کۆماری ئیسلامی هەست و خوستیان نییە لەبارەی ئەوەی بۆچی ئەوان پشتگیریی پرسی فەڵەستینی و لبنانی دەکەن. "فەڵەستینییەکان شەڕ لە پێناوی فەڵەستین ناکەن،" ستراتیجیستێکی باڵای

سەربازیی ئێرانی بەم دواییانە بە جەماوەرێکی بەندکراوی گوت، "ئەوان شەڕ بۆ ئێران دەکەن. لبنانییەکان شەڕ بۆ لبنان ناکەن، شەڕ بۆ ئێران دەکەن. هێندە ئازا بی وا بڵێی و وای پێشان بدەی ئەمە واتە دابینکردنی ئەو چەمکە ستراتیجییەی ئێمە کاری بۆ دەکەین." ئاخۆ حەسەن نەسروڵڵا ئەمە دەزانی، یان سوودی چی لە کۆماری ئیسلامی دەبینی لە بەرامبەر سوودی ئەو بۆ کۆماری ئیسلامی؟.

## چی باشە بۆ قاز

هەروەک بەسەرهاتی دوو ژنەکەی ڤیرۆنا، کە لەبەر رق و کینەی کۆنیان زۆر توند یاخی بوون، چارەنووسی حەسەن نەسروڵڵا بەندە بەپێگەی سەربازی و کۆمەلایەتیی ئیسرائیل. حزبوڵڵا دروست بوو وەک پرۆژەیەکی رەوای سیاسی لە دوای داگیرکردنی لبنان لەلایەن ئیسرائیل لە ١٩٨٢، ئەمە مەرام و هێزی بەخشی بە پرسی ملیۆنان شیعەی لبنانی کە بێبەش کرابوون لە سیاسەتی مەزهەبی لبنان، کە دیارییەکی داگیرکاریی فەرەنسی بوو، ئێستەش کاری خۆی دەکا. بۆ ماوەی نزیکەی سی ساڵ، حزبوڵڵا بەرگریی لە پرسی شیعەی لبنانی و یەکپارچەیی ناوچەیی لبنانی کردووە بەوپەڕی پێداگیری و سووربوونەوە، بێ گوێدانە ستراتیجی فراوانبوونی وڵاتی جوولەکان و هۆکاری رەوایەتی دا بەجەنگ کە تێیدا توانی سوپایەکی بەهێز تێک بشکێنێ وەک یارییەکی خۆی.

بەڵام ئەمرۆ، هەروەک گفتوگۆمان کرد، بەهاری عەرەبی دی ئێن ئەی جیۆپۆلەتیکی ناوچەکەی گۆڕی. بەلای نەسروڵڵا، دوژمنایەتیکردنی ئیسرائیل لە راستیدا زۆر گرینگترە لە پێوەندیی موشتەرییانەی لەگەڵ سووریا و کۆماری ئیسلامی. بەڵام کێشەی ئیسرائیل ئەمرۆ ئەوەیە کەوا شەڕ لەگەڵ حزبوڵڵا زۆر کەم سوود دەگەیەنێ بە پاراستنی وڵاتە ناسکەکەی. دوای ئەوەی سەرۆک ئۆباما باسی "سنوورەکانی ١٩٦٧"ی کرد،

ناتانیاهوی سەرۆک وەزیران هەستی کرد پێویستە پاساو بۆ سیاسەتەکانی بێنێتەوە بۆ هێرشێکی بەرەی پێشەوەی ئەیپاک (AIPAC) و پاشان لە بەردەمی کۆنگرێسی ئەمەریکی خۆی دووپاتی بکاتەوە کە هێشتا تەقەی پێ ماوە. پێی نەماوە. بەهاری عەرەبی پێی ماوە. حەماس، بای خۆیان، زۆر ژیرتر بوون لە نەسروڵڵا لە خوێندنەوەی خێرای بەهاری عەرەبی بە راستی و خێرا بڕیاریان دا لەگەڵ فەتح و دەسەڵاتی فەڵەستینی یەک بگرێتەوە، ئەمەش نەک هەر تەنیا سەرکردایەتیی ئیسرائیلی نیگەران کرد، بگرە کۆماری ئیسلامی و پڕۆژەی موشتەریئاسای حزبوڵڵا.

چەقین و تێکەوتنی حەسەن نەسروڵڵا لە لبنان بەهیچ شێوەیەک نابێتە هۆکار ئیسرائیل ئاهەنگی بۆ بگێڕێ. تەواو بەپێچەوانەوە: "تاکە دیموکراسی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست" هەڕەشەی لەسەرە لەلایەن ژیریی لایەنەکانی دیدی دیموکراسی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئیسرائیل و حزبوڵڵا ئاوێنەی یەکترن: میلیشیایەکی مەزهەبی لەسەر سنوورێکی بەکێشەی وڵاتی جوولەکان پاساوێکی تەواوە بۆ هەردوولا. هەردوو شەڕانگێز دەتوانن تەنیا لە زمانی توندوتیژیی مەزهەبی تێ بگەن، زمانێکە ئێستە زلهێزانی دنیا قسەی پێ دەکەن. ئەمڕۆ چیی تر قسە بەم زمانە ناکرێ (ئەگەر کاتی خۆیشی پێی کرابێ)، ئەم زمانە قسە ناکا بۆ ملیۆنان کەسی ڕاپەڕیو (بە قسەی میسرییەکان) بۆ ئازادی، دادوەریی کۆمەڵایەتی و شکۆمەندیی گەلی میسر. وتارەکانی نەسروڵڵا بۆ بەرگریکردن لە بەشار ئەسەد و ئایەتوڵڵا خامەنایی واتە وڕێنەکردن وەک ئەوەی بێنجامین ناتانیاهو لە بەردەمی کۆنگرێسی ئەمەریکی کرد لە ئایاری ٢٠١١: هەردووکیان شەڕوانی بەسەرچوون، ناتوانن بیر لەودیو پێگەی شڵۆق و بەزیوی دەسەڵاتیان بکەنەوە.

ئەو ئیسرائیلە بە گرفتە دەبینن، هات لەگەڵ ئەمەریکا، پێکەوە ترسا بوون، بەهاری عەرەبییان ڕەت کردەوە. تید کۆیل، رۆژنامەوانێکی دیاری

ئەمـەریکی، لە باتیی ئیسـرائیل لە ئەمـەریکا دەپارێتـەوە بێتـە سعـوودیە و ئامـادە بێ بۆ یـارمـەتی ئەگـەر بێتـو خـەڵک راپەڕێ. هاوپەیمانانـی ئەمـەریکا چیی تر ناتوانن پشت بە ئـەمەریکا ببـەستن، کۆپل دەڵێ، "ئیتر شـتەکانی تر بۆ ئێوە بەجێ دێڵی تا بزانن کە هـاوپەیمـانە عـەرەبەکـان ستـەمکاری گـەندەڵ بوون". کەسایەتییەکی وەک تێد کۆپل ئەو راستییە پێشان دەدا کەوا زۆربەی لیبراڵە ئـەمەریکاییەکان بـێ شـەرمانە لای هـاوشانە پارێزکارەکان دەگرن لە دژایەتیکردنی چالاکانەی هـەر راپـەڕینێکی دیموکـراسی لە ناوچەکـە. کۆپل دەڵێ: "تاکە نێچیر لە کانە خەڵووزەکەی ئەم رووداوانە ئیسرائیلە. هیچ یەکێ لە هـاوپەیمـانانی ئەمـەریکا هێندەی ئیـسرائیل هەسـتیـار نیـیە تـەنانەت بۆ گۆڕان لـە ژینگەی نێـودەوڵەتیش، یان هێـندە هۆشیـار نیـیە بەبچـووکتـرین هاوکـاریی شکستـخواردووی واشنتـۆن." بێگومان ئەو تەواو راستـە: ئـەمە وا بوو و هـەر بەو نرخەش دەمێنێتەوە کەوا نیشتەجێبوونی داگیرکاری دەیدا بۆ ئەوەی خـۆی بەدیار بخـا لـە کـارەسـاتـی تێکەڵی ئیـمپـریالیزمـی جیـهـانی و سـتـەمکاری لۆکـاڵ. ئیـسـرائیل هـەرگـیـز خـەیاڵی بۆ ئەوە نـەچوو، لە کـاتی بنەڕەتیی رەگـەزپەرسـتـیی خـۆی لەناو چەمکی زایۆنیزم، کـەوا عـەرەبەکـان توانـای دیموکـراسـیـیـان هـەیە. ئـەمـە واگـاهـاتنـەوەیەکی بێ شـەرمـانـەیە: ئیسـرائیل و هـاوپەیمـانە ئەمەریکاییەکانی ئێستـە دەبێ مامەڵە بکەن لەگەڵ نادیار و هێزی شـەپۆلێک لە راپەڕینگەلی دیموکراتی. بەڵام باشتـرین بەشی هۆکارەکە لێرەیە: " پێشبینیکردنی نیگەرانییەکانی تـر ئەو ترسەیە کە ئێران هـەیەتـی بۆ دوورینـەوەی سـوودە گـەورەکـانی لـەو شـتـەی پێی دەڵێن بەهـاری عـەرەبی. "تەنانـەت بەبێ چەکی ئەتۆمیش، بەرپرسێکی باڵا پێی گوتم، ئێران پارچەکان هـەڵدەگرێتەوە. بەڵام بە چەکی ئەتۆمی، تەواوی خانووەکە دەگرێ." کۆپل و هـاوڕێ ئیسرائیلییەکانی تا ئێستە ئەسپی تۆپی دەکوتنەوە سەبارەت بە بەرنامـەی ئەتۆمیی ئێران، لەشیـان چێکی تێ دەکـەوێ ئەگەر رووداوەکـان بگێڕنەوە بۆ خراپیی دەسەڵات و پێی بڵێن "بەهاری عەرەبی."

تا هاوڕێی وەک تێد کۆیل و کۆنگرێسی ئەمەریکی، کە گەوز دەدا لەناو ئەیپاک، هەبن، ئیسرائیل دوژمنی تری ناوێ. جیۆپۆلەتیکی ناوچەکە دەگۆڕا، هەروەها کۆیل و هاوەڵانی نەیاندەزانی گۆڕان بە کام ئاراستەیە. کۆماری ئیسلامی هاوپەیمان و هۆکاری مردنی لە دەست دەدا، هەمان شت ڕاست بوو بۆ ئیسرائیل و وڵاتە یەکگرتووەکانیش. ئەم شۆڕشانە ڕوویان دا و سنووریان بڕی: لەو وڵاتانی کە دوژمنی ئەمەریکا و ئیسرائیل و ئەوانەشی کە هاوڕێیان بوون ڕوویان دا. ئەنجام هەر ئەوە نەبوو کە کۆماری ئیسلامی دەسەڵاتی خۆی لە دەست دەدا و هیچی دەس نەدەکەوت، هەروەها وڵاتە یەکگرتووەکانیش ئەو دەسەڵاتەی لە دەست دەدا دەمێک بوو کاری بۆ کردبوو. ئیسرائیل تەواو بەدیار کەوت، بۆیە هیچ چەکێک کە ئەیپاک بتوانێ لە ئەمەریکا وەری گرێ ناتوانێ وڵاتی جووان بپارێزێ لەو شتەی وا ڕوو دەدا.

لەوانەیە هیچ شتێ زایۆنیزم نەبەزێنێ، بەندی زایۆنیستی لەگەڵ ئیمپریالیزمی ئەمەریکا، وای لە وڵاتی گارسۆنی جوولەکان کردووە ببێتە باڵەفڕێکی بارهەڵگر لە دەریای ناوەڕاست، ئیسرائیل گومانی لەوەدا نییە. ئەوەی دەهاتە سەر ڕێی ئیسرائیل هێرشێکی سەربازی نەبوو، یان تیرۆریستی (بۆ بەکارهێنانی زمانە توندوتیژەکە کەوا وڵاتی ناسکی جوولەکە زۆر باش تێی دەگا و بە ڕەوانی قسەی پێ دەکا)، تەنانەت کەشتیی فلۆتیلای زیاتریش نەبوو لەلایەن چالاکوانانی ئازای ئاشتی نەهاتنە بەردەم سوپای دەریایی بۆ کوشتنی سەرنشینەکانی و دواتریش قوربانییەکان ڕاگەیەنێ (ئەمەش هونەرێکی ترە کە ئیسرائیل مەحالانە لێی). لە باتیی ئەمانە، ئەوەی دەهاتە سەر ڕێی شتێکی تەواو جیاواز بوو، شتێک ئیسرائیل هەرگیز خۆی بۆ ئامادە نەکردبوو. بێنە بەرچاوت، بە ملیۆن میسری لە گۆڕەپانی تەحریرەوە بەرەو قودس بکەونە ڕێ، بە چەک و سوپا نا، بگرە بە نان و ئاو، خۆراک و دەمران، بۆ ڕزگارکردنی ئەو چەند ملیۆن فەڵەستینییەی

کە لەناو نیشتمانی خۆیاندا دەچەوسێنرێنەوە و گەمارۆ دراون! باشە ئیسرائیل لەو کاتەدا چی دەکا، بە چەکی ئەتۆمی لێیان دەدا؟

ئەمە هەرگیز هەڕەشەیەکی واقیعی نەبووە، بەڵام شیمانەیەکی نزیکە، ئەگەر میسرییەکانیش ئەوە نەکەن، لەوانەیە فەڵەستینییەکان خۆیان ئەوە بکەن. لە سەرەتای حوزەیران، ڕۆژنامەی هارێتزی ئیسرائیلی بڵاوی کردەوە، هێزەیلی بەرگریی ئیسرائیلی لە فەرماندەی باکور لە ئامادەسازییەکی تەواودایە... بۆ هەر هەوڵ و شیمانەیەکی تەقینەوەی هەزاران ئاوارەی فەڵەستینی لە ناوچەی دیمەشق و وەک ڕەشەبا سنووری بەرزاییەکانی گۆلان ببڕن لە ڕۆژێکی تووڕەییاندا، لە ساڵوەگەڕی شەڕە شەش ڕۆژییەکە.

بەشی هەرە گرینگی چیرۆکەکە ئەوەیە ڕێپێوانەکە بەهۆی دەسوەردانی حزبوڵڵا نەکرا! هارێتز گوتی "پاڵەپەستۆ لە حزبوڵڵاوە، کە نایەوێ ململانە لەگەڵ ئیسرائیل بکا، ڕۆڵی هەبوو لە سازنەدانی ڕێپێوانەکە، بە هەمان شێوە هێزەیلی نەتەوە یەکگرتووەکان پاڵەپەستۆیان خستە سەر سوپای لبنانی و لبنان." هارێتز هەڵە بوو لەوەی حزبوڵڵا ویستوویەتی ململانە لەگەڵ ئیسرائیل نەکا. بۆچی وا دەکا؟ حزبوڵڵا لە خوای دەوێ بۆ دەرفەتێکی ئاوا. حزبوڵڵا تەداخولی کرد لەبەرئەوەی سەرکردایەتییەکەی دژی ئەو دەسپێشخەرییەی فەڵەستینییەکان بوو چونکە خۆی سپۆنسەری نەکردبوو، لەبەرئەوەی لە دەرەوەی دەسەڵاتی ئەودا بوو، لە سەرووی هەمووشیانەوە، لەودیو خەیاڵی سەربازیی ئەودا بوو. سیفەتی ناتوندوتیژیی ئەو جۆرە کارە (ڕێپێوان بۆ ناو ئیسرائیل)، کە وای دەکرد ئیسرائیل هیچ بەرگرییەک نەکا، هیچ کارێکیش بۆ حزبوڵڵا ناهێڵێتەوە، واتە حزبوڵڵا نانبڕاو دەبێ. ئیسرائیل و حزبوڵڵا مێژوویان هەیە بۆ خۆئامادەکرن بۆ هێرشی توند، هەرگیز ئامادە نەبوون و نین بۆ ڕەوتێکی ئازادیخوازانەی ناتوندوتیژی لە سیاسەتی بێهیوایی کە زۆر بە زانایی دروستیان کردووە. ئەمە لۆجیکی گۆڕەپانی

تەحریر بوو، هەرواش دەمێنێتەوە: گۆڕەپانەکە ناتوندوتیژە، ناسەربازییە، پەرۆشانەیە، خۆشە، پێویستیان بە سوپای میسر نییە، پێویستیان بە ئیسرائیلی و ئەمەریکای هاوشانیش نییە، بەتەواوی بێ چەکدارن.

"جیاوازیی نێوان ڕاپەڕینگەلی عەرەبی و سووریا،" حەسەن نەسروڵڵا دەڵێ، "ئەوەیە سەرۆک ئەسەد قەناعەتی بەوەیە چاکسازی پێویستە، بەپێچەوانەی بەحرێن و وڵاتانی تری عەرەبی کە ئەو قەناعەتەیان نییە." بەڵام لەو دۆخەی سووریا چیی تر گرینگ نییە بەشار قەناعەتی بەچی هەیە و بەچیش نییە. داماڵرا لە تەواوی مافە ئەخلاقییەکانی بە سەرۆکبوونی سووریا کاتێ هێزەیلی سەربازی و تەناهی یەکەم فیشەکیان بە سوورییاییە بێ بەرگرییەکان وەنا. تۆزقاڵێ جیاوازی چییە نەبوو لە نێوان ئەوەی گەلی سوورییایی و عەرەبەکانی تر داوایان دەکرد: شکۆمەندیی خود - نوێنەرایەتی لە کۆمارێکی ئازاد و دیموکراتدا. ئەو کێشانەی سەید حەسەن نەسرولڵا و بێنجامین ناتانیاهو تێی کەوتن نیشانەی کارەساتێکی دڵتەزێن بوون کە ئێستە لەناو جیهانی موسڵمان و عەرەبی رەنگ دەداتەوە، نەیانتوانی سەرکۆنەی ڕژێمی دڕندایەتیی ڕژێمی بەشار ئەسەد بکەن، لەسەر بنچینەی ئەوەی، وەک خۆیان گوتیان، ئەو زمانەیان نەدەزانی، پێیان وابوو نەدەبوو ئەو بەرگرییەی گەل نە بەهێز نە لاواز بکەن!

هەرکە کڵێشەکان تێکەڵاو بوون و سیاسەتوانان لەپاش ڕووداوگەل بەجێ مان، موسڵمان و عەرەبەکان لە کونجێکی جیهانیان تا ئەوسەری کونجەکەی تر، هەروەک خشڵێکی بێگەرد درەوشانەوە وەک پێوەرێک بۆ تێکلاویی مەرامی سەرکردە و ڕۆشنبیرەکانیان. حەسەن نەسروڵڵا چیی تر حسێبی سەرکردەیەکی شۆڕشگێری بۆ ناکرێ و چووە ریزی سیاسەتوانە گەندەڵەکانی وەک موبارەک، بن عەلی، قەزافی و ئەوانی تری هاوشێوە کاتێ لای ڕژێمی عەلی خامەنایی گرت، دەمێک پێش ئەوەی بێ پشتگیری لە ڕژێمی ئەسەد بکا. بەڵام دووڕوویی ئەو پشتگیرییە خێرا بەسەر ماڵیدا

شکایەوە، زۆر خراپیش شکایەوە، نەک هەر تەنیا نەسروڵڵای لە رابەرێکی شۆڕشگێڕ لێ خست، بگرە بە دەرفەتقۆزەرەوەی ناوزەد کرد، هەروەها پەڕپووتی ئەو رۆشنبیرانەشی ئاشکرا کرد کە کێماسییان هەبوو لە خەیاڵی ئەخلاقی پڕ پێویست بۆ ئازایەتیی گەلەکەیان. خوێنی هەر سووریاییەکی بێتاوانی کوژراو لەلایەن رژێمی بەشار ئەسەد هەر تەنیا لەسەر دەستی حەسەن نەسروڵڵا نەبوو بگرە لەسەر دەستی هەر رۆشنبیرێکی عەرەب و غەیرە عەرەبە کە فەشەلیان هێنا لە رەتکردنەوەی ئەو سەرکردانە و لای گەلی سووریایان نەگرت لە بەهاری عەرەبیی گوڵزار و ئازادیخواز.

## خەیاڵکردنی جیهانێکی نوێ

حەسەن نەسروڵڵا و بێنجامین ناتانیاهو وەک یەک، شان بەشانی ئەوانەی شکستیان هێنا لە پاڵپشتیکردنی بەهاری عەرەبی، خۆیان لە یەک خاڵدا دەبیننەوە، جا چ هاوکاریی هەندێ وڵات بکەن و چاوپۆشی لە هەندێکی تر بکەن، ئەویش ئەوەیە هەردووکیان بەدەستی یەک نەخۆشیی بنەڕەتی دەناڵێنن: شکستهێنان لە خەیاڵێکی پابەندبوو، یان پابەندبوونێکی خەیاڵی. پاشی چی وای کرد پشتگیریی شۆڕشگەلی تونس و میسری بکەن، بەڵام پشت لە راپەڕینگەلی ئێران و سووریا بکەن، ئەمە حسێبکردن نییە بۆ توخمەکانی عەرەب و "چەپێتی"ی ئێرانی، یان پشتگیریکردنی یاخییان لە ئێران و سووریا بەڵام چاوپۆشین لەوانەی سعوودیە و بەحرێن، وڵاتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیلیش وایان کرد؟ کەواتە وەک سوڕی تەشی، بە شێوازێکی زۆر بازاڕییانە، بەشێک لە وڵاتانی عەرەبی لەگەڵ چەپێتیی ئێرانی یەک دەگرنەوە لە دووڕوویی ئەمەریکا و ئیسرائیلی دوژمنیان، بە هەمان شێوە بەرژەوەندیی نێوان راست و چەپ، لە نێوان کۆماری ئیسلامی و وڵاتە یەکگرتووەکان، نێوان حزبوڵڵا و ئیسرائیل ئەوەیە بەهاری عەرەبی سەر نەگرێ، چونکە یان ئەوەتا لە دەرەوەی دەسەڵاتی خەیاڵیی

سنووردariyan بوو یانیش سـووربوون بەهۆی چلـێـسـیی بێ سنووریان (ئەمـەریکا و ئیسـرائیل). پاشـان مـیـسـر و تونس بە باشـە وەسف کران لەلایەن چەپەکان، بەلام سووریا و ئێران نا. پێچەوانەکەشی بۆ ڕاستڕۆکان ڕاست بوو: هەر کێشـەیەک بێتە سـەر ڕێی سووریا و ئێران باش بوو، بەلام خـوانەخواسـتە نێتە سـەر ڕێی بەحـرێن و سـعـوودیە. بەلام، لاسـتیکەکـە، بەهاری عـەرەبی، لە بزووتنەوەی سـەوز فـێـر بوو، نەگـەڕاوە و پێـداگـیـر، ڕاسـتـەڕێ بوو، لە هەمـوو شـوێنێک بەگوڵ، هەرچەندە جـیـاوازییـان هەبوو، پێشوازیی لێ کرا لەلایەن گەلەوە.

ڕووداوگەل لە ئێران و جیهانی عەرەبی لە هاوینی ٢٠٠٩ەوە بۆ زستـانی ٢٠١١ چەند داواکارییەکی گرینگیـان هەبوو بۆ هەر کـەسێ گرینگییـانی پێ دابا، لە هەموویان گرینگتر ئەوە بوو: بەرزنرخاندنی زمـانەکانـی یاخیبوون، هەروەها چۆنیـەتیی سـازان لەگـەڵ جـوگـرافـیـایەکی ئازادیخـواز، چۆن جـوگرافـیـا پانتـاییی جـیـهـانی نوێ پێـشـان دەدا. باشـە، ئەو هاووڵاتـییـە شۆڕشگێڕانە بە چ زمـانێک قسەیان دەکرد. سەیری ئـەم ڕستانە بکە: ڕاییێ من کوجـاسـت (واتە: کوا دەنگی من)، الشـعب یرید اسـقـاط الـنـضـام (واتە: گەل دەیەوێ ڕژێم بڕووخێنـێ). ئەمـە قسـە و بنێشـتـە خۆشـەی سـەر زاری ناشنالیزمی دژە-داگیـرکار نـیـیە، سۆشـیـالیزمـی جیـهـانی سێـیـەم، یان ئیـسـلامـیـزمی چەکدار نـیـیە، چونکە ئەمـانە تاکـە ناوەند بوون لە ناوچـەکـە خـەڵک خوویانی پێوە گرتبوو بۆ قسـەکردن لەبارەی سـیـاسـەتەوە بەڕەقی. ئەمـە زمـانێکی نوێ و بـالادەسـتـە. ئەوەی ڕاسـتـەوخـۆ پێوەسـتـە بەو زمـانە و ڕێی بەکارهێنانی، ئـەو جوگرافیـایەیە کە خـەیاڵ دەکـا، پێشبینی دەکا و شت دەسەپێنێ.

کاتێ دەڵێین "ئێران و جیهانی عەرەبی" یان "جیهانی موسڵمان و عەرەبی" ئێمە باسـی جوگرافیایەکی خـەیاڵی دەکـەین کە لە ڕاسـتیدا چیی تر بوونی نییە، ڕاستییەکەشی ئەو جوگرافیایە هەر ورد نییـە. ڕووداوگەلی هاوشێوەی

ئەوانەی تونس، میسر و سووریا، بۆ نموونە، لە ئەفریقیاش رووی دەدا، لەودیو جیهانی عەرەبیش، لە ئێران، ئەفغانستان و پاکستان روویان دا. تەنانەت کلێشەکەش "جیهانی موسڵمانان" ئێستە روو لە کزییە، ئێستە زاراوەیەک تەنیا بۆ جیاکردنەوەی غەیرە موسڵمان لە لبنان، فەڵەستین و میسر، کە پێویستە دانیان پێدا بنرێ زیاتر لەوەی کە کەمینەن، بەڵام لەبەر فراوانبوون و پێشکەوتنی ئەفریقیای باکور و دزەکردنی پێشکەوتن بۆ نێو تەواوی ئەفریقیا دەروازەیەکی تەواو جیاواز بۆ جیهانێکی نوێ دەکرایەوە.

ئەگەر بمانەوێ ئەو زمانە بدۆزینەوە کەوا ئەو شۆڕشگێڕانە قسەی پێ دەکەن و نەخشەی نوێی جوگرافیای خەیاڵی لە بەرچاوی خۆمان بخوێنینەوە، ئەوا پێویستە دیراسەسەی پێوەندیی نێوان زمان و ئەو جیهانە بکەین، وەک ئەوەی گادەمار لە کتێبەکەی بەناوی "راستی و میتۆد" باسی دەکا:

زمان هەر تەنێ یەک موڵکی مرۆ نییە لە جیهان، بگرە زمان ئەو راستییەی پێوە بەند کەوا مرۆ جیهانێکی بەگشتی بۆ خۆی هەیە. بۆ مرۆ جیهان واتە ئەو جیهانەی کەسی تر لە جیهان ئەزموونی ناکا. بەڵام ئەم جیهانە لە سروشتدا زمانەوانییە.... زمان ژیانی سەربەخۆی نییە جگە لەو جیهانەی کە لەناو خودی زمانەکە هەیەتی. هەر تەنیا ئەو جیهانە نییە دێتە ناو زمان، بەڵام زمانیش، بوونی راستەقینەی خۆی هەیە تەنیا لەو راستییەی کەوا جیهان خۆی خۆی پێشان دەدا. بۆیە مرۆی بنەڕەتیی زمان لە هەمان کاتدا واتە کوالیتی زمانەوانیی بنەڕەتیبوونی مرۆ لە جیهاندا.

حەز دەکەم ئەو ژێرییە شرۆڤەکارییە درێژ بکەمەوە بۆ نێو ئەو زمانە سیاسییەی خەڵک قسەی پێ دەکا، بەڵام ئەوە دەوەستێتە سەر خەڵک بزانن

له کوێن یان خەیاڵ بکەن و بیانەوێ لە کوێ بن. ئیسلامیزمی چەکداری زمانێکی سیاسی بوو، بە هەمان شێوە سۆشیالیزمی جیهانی سێیەم و ناشنالیزمی دژە - داگیرکار: خەڵک بەم زمانانە قسەی کرد بۆ ئەوەی خۆیان بخەنە ناو ئاسۆی جیهانێک حەز دەکەن هەیانبێ. بەکورتی، ئەو زمانەی ئێمە دەیبیستین لەو راپەڕین و شۆڕشانە کە ئێمە پێی دەڵێین "بەهاری عەرەبی" زمانێکی ئۆرگانییە، یەککگرتووە و جێگیرە بۆ ئەو جیهانەی ئێمە وا دەیدۆزینەوە و نەخشەکەی لە بەرچاومانە. ئێمە ئەو زمان و دەستوورە بەهێڵەکانی ئەو جیهانە نوێیەی دەزانین کە وا خەریکە لەدایک دەبێ. کێشەی دیزاینی "جیهانی موسڵمانان" ئەوەیە کولتوورێکی سیاسیی پتەو کەم دەکاتەوە و دەیخاتە ناو رەهەندێکی ئیسلامییەوە.

دیارخەری ئایدیۆلۆجی کە یەکسەر خۆی دەردەخا، تا ئێستە وەک ئەوەی زمانی ئەو شۆڕشگێڕانە پێی نیگەرانە برێتییە لە ئیدیۆمی ئیسلامیستی. گەلێ لێدوانباز، لە ئایەتوڵڵا خامەناییەوە بۆ بێرنارد لویس، راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی بەتازەترین دەربڕی شۆڕشی ئیسلامی تێ دەگەن (هەرچەندە یەکێکیان پێی خۆشە و ئەوی تریان لێی دەترسێ). ئەو ترس یان هیوایەی کە ئیسلامییەکان هەیانە، کەوا ئەمانە کۆمەڵگەی ئیسلامین و زمانی سیاسییان کاریگەری ئیسلامیی لەسەرە، هاوسەنگ دەکرێ بەهۆی تێگەیشتنێکی جێگرەوە لەو شتەی ئێمە وا دەیبینین کەوا ڕاپەڕینگەلی عەلمانین، خەڵک بەدوای حکوومەتی عەلمانیدا دەگەڕێن، ئەمەش قسەیەک یەکسەر دەمانباتەوە سەر دووانەی هەڵەی "نەریت بەرامبەر مۆدێرنیتە". بۆیە، پێش ئەوەی بیزانین، ئێمە دووبارە پێمان دەگوترێ کە ئەگەر مەرامی شۆڕشگێڕان دیموکراسییە، ئەوا دەبێ بێئومێد بین چونکە دیموکراسی "چەمکێکی سیاسییە کە هیچ مێژوویەکی نییە، هیچ تۆمارێکی نییە لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا." بەواتایەکی تر، ئێمە پێش هەموو شتێک شتێکمان هەیە پێی دەگوترێ "جیهانی ئیسلامی" و پاشان گوێمان لەو

جیهانە دەبێ کە ئیسلامییانە قسان دەکا. جیهان و زمان، وەک گادەمار باسی دەکا، تەواوکەری یەکترن. ئەگەر ئەو بزووتنەوانە ئیسلامین، ئەوا وەک موسڵمان ئێمە دژی خۆمان دەوەستینەوە کاتێ بیر لە دیموکراسی دەکەینەوە. وەک ئەوە وایە ئەو بزووتنەوانە بەدوای کلکی خۆیان کەوتوون.

## چ زمانێک، چ جیهانێک؟

خوێندنەوەم بۆ جیهانی کراوە لە ڕێی بەهاری عەرەبی دەگەڕێتەوە بۆ پێش ڕووداوەکان. نزیکەی لە ماوەی دەیەی ڕابردوودا، بە وردی و لە نزیکەوە بیرۆکەی جیهانیبوونی کۆزمۆپۆلیتانی دەکۆڵم وەک جێگرەوەیەک بۆ بیرکردنەوە لەبارەی ئەوەی عادەتی پێی دەڵێن "جیهانی موسڵمان و عەرەبی"، ئۆریەنت یان "ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقیای باکور"، هەموو ئەمان بەبیرۆکە و چەمکی داگیرکاریدا هاتوون و ئاکام دروستکردنی "ڕۆژهەڵات" بوو لەلایەن "ڕۆژئاوا" کە خۆی سەرپەرشتیی دەکا. ئەم جیهانیبوونە نە ڕێکە و نە دیراسەیەکی میتافیزیکیشە، بگرە بوونگەرایە (بە دیزاینی هایدگەر): مێژوویی، زیندوو، بە ئەزموون، بیرخراو و کارایە. سەرەتا باسی بوونی جیهانیبوونی کۆزمۆپۆلیتانی کرد لە پێشەکیی چاپی نوێی کتێبەکەم بەناوی "سیستمی ئاینی ناڕازیبوون" (١٩٩٣-٢٠٠٥)، لە کارەکانی تردا ڕێکم خستەوە تا بۆ دۆخی ئێران بشێ. ئەو کارەم کرد زیاتر بەهۆی چەند ستراتیجێک لەسەر بنچینەی "ڕێزگرتن" (بەپێی جیاکردنەوە بەهۆی ڕێزگرتن، ئەوەی دریدا باسی کرد) بەپێی دەقی ئیسلامی، زیاتر لەبەر ئەوە بوو کە ئەو کۆزمۆپۆلیتانیزمە بەشێوەیەکی سیستماتیکی چەواشە و فڕێ درابوو. ویستم ئەو شتە ئاوەژوو بکەمەوە لە خوێندنەوەیەکی تردا کە وای لە "جیهانی ئیسلامی" کرد بیکاتەوە. لە سیستمی ئاینی ناڕازیبووندا بیرۆکەی ئەو جیهانیبوونەم کێشاوە و لە باتیان سەرهەڵدانی ئیسلامیزمی سیاسیمان دانا لەناو سیاقێکی فراوانتری کولتووری

سیاسیی ئیسلامیزم، سۆشیالیزم و ناشنالیزم.

له کتێبێکی ترم بەناوی "له ئێران: گەلێک هاته پچڕان" هەمان شتم کرد بەهۆی دانانی کولتووری سیاسیی ئێرانی لەناو بەرهەمی کۆزمۆپۆلیتانیزمی ئەدەبی. له کتێبی "ئازادیی سیستمی ئاینی ئیسلامی" باسی ئیلاهییەت دەکەم وەک ڕێگەیەک بۆ وەستانەوە له دژی جیهانیبوونی ئەوانی تر لەناو چوارچێوەی بەرگریی سیستمێکی ئاینیدا، هەروەها له کتێبی "شیعیزم"دا هەمان کارم کرد بەهۆی شیکردنەوەی بیرۆکەی "تەقیە" له شیعیزم. مەبەستی هەموو ئەمانە بۆ قسەکردن بوو لەسەر فره جیهانێک کەوا پێش پەیدابوونی ململانەی "ئیسلام و ڕۆژئاوا" سەریان هەڵدابوو. له ڕێی ئەو دووانەییەوە، ئێستە بووەتە "ئیسلامیزم بەرامبەر عەلمانیەت" هەردوو دیوی دراوەکە بەهێز بوون لەسەر حسێبی لەناوبردنی جیهانیبوونی کۆزمۆپۆلیتانی کەوا ڕووناکییانی دەکوژاندەوە. جیهانیبوونی کۆزمۆپۆلیتانی له هونەری نمایشکردن، ئەدەب و بینراودا ئاشکرا دەبێ. هونەر بۆمان ئاسایی دەکا پێگە و سەردەمی پێش دیراسەی سروشتی ئەو جیهانیبوونه ببینین و دروستی بکەین، چونکه لێرەدا بوارگەلی ئایدیۆلۆجی له ڕووی ماناوه خۆترێنن ئەو دەمەی ئێمه له ڕووی ستاتیکاوه سەیریان دەکەین. نیازی ئەم پێگه تیۆرییه بۆ پێشاندانی ئەو نەخشه چەند ڕووه و خوێندنەوەی ئەو شتەی لەودیو شته نووسراوه و نەخشێنراوەکانی "ڕۆژئاوا و ئەوانی تر"ه، که "جیهانی عەرەبی و ئیسلام"یشی تێدایه.

ئەوەی من باوەڕم پێیه سەبارەت بەو شتانەی له وڵاتانی ئێران تا میسر و تونس تا مەغریب ڕوو دەدەن، دەوەستێته سەر بنچینەی "کۆتاییی ئایدیۆلۆجیی ئیسلام"، ئەمەش پاشەکشەی کولتوورگەلی کۆزمۆپۆلیتانی ئۆرگانییانه، که له یەک کاتدا لۆکال و جیهانین به زاراوەی تایبەتی و ئەزموونی مێژووییان. ڕاپەڕینگەل بەرەو گێڕانەوەی ئەو جیهانیبوونی کۆزمۆپۆلیتانییه پێ دەنێ. مەبەستی من له کۆزمۆپۆلیتانیزم ئەوە نییه که

کانت (و ئەوانی تر) باسیان لێوە کردووە، کە مشتومڕێکی فەلسەفی و ئەخلاقییە بۆ داوایەکی ئەخلاقی، سیاسی و یاسایی دادوەریی جیهانییە، مەبەستەکەی من پێچەوانەی ئەوەیە: مێژوو هاتووە بەزاراوەی بوونێکی واقیعبینانە، نەک خەیاڵی، باس لە زیندووکردنەوەی جیهانیبوونی کۆزمۆپۆلیتانی بکا لەناو چەند ئەزموونی ئیمپریالی جیاوازدا، لە عەباسییەکانەوە لە سەدەی هەشت تا عوسمانییەکان لە سەدەی نۆزدە. کەواتە مەبەستم لە جیهانیبوونی کۆزمۆپۆلیتانی ئەوەیە کۆمەڵێک ئەزموونی راستەقینەی جیهانی هەن لە مێژوودا هەبوونە بەڵام هەردەم خراونەتە پەراوێزەوە بەهۆی ئایدیۆلۆجیای دژواری "رۆئاوا". من دەڵێم ئەوە ئەو جیهانانەیە ئێمە دەبێ بەهەموو جۆر و بیرۆکەیەکەوە بیانکێشینەوە، چونکە بوونەتە مانیفێستۆ لە شۆڕشی کردەنی لە تەواوی ناوچەکە. دووبارە خوێندنەوەی ئەو نەخشە فرە روانە، کە بوونیان هەیە بەڵام شاراوەن، واتە رزگارکردنی ئەو جیهانانەی کە وا ماوەی دووسەت ساڵ لەژێر باڵادەستیی داگیرکاری و ستەمکاریدا دەنێژرێ لەلایەن کیانێک کە بەخۆی دەڵێ "رۆئاوا" کە ئێمەش بەردەوام ئاماژەی پێ دەکەین، شان بەشانی هەموو ئەو جێگرەوە شارستانییانەی داهێنران لەلایەن سوپای بەکرێچووی ئۆریەنتالیست و رۆشنبیری بەناو چالاک.

بۆ رزگارکردنی جیهانیبوونی کۆزمۆپۆلیتانی کە ئێستە بەهاری عەرەبی دروست دەکا نابێ بەسەریدا بڕۆی یان تەنێ بەخەیاڵ باسی بکەی، بگرە دەبێ لایەنە تیۆرییە مێژوویی، جوگرافی و زاراوە سیاسییەکانی هەڵبکۆڵی، بەتایبەتی لایەنەکانی گفتوگۆ و رەوایەتی. بۆ رزگارکردن و دەرخستنی ئەو کۆزمۆپۆلیتانیزمە دەبێ رای پەڕێنی لە دژی خوێندنەوەی جەوهەریی ئیسلامیتەکان: وەک پێگەیەکی رکابەریی ئایدیۆلۆجی لەگەڵ کۆلۆنیالیزمی ئەوروپی یان "رۆئاوا". لەوەش گرینگتر، ئێمە پێویستمان بەو رزگاری و ئازادییە هەیە تاوەکو لە تەنیشت گەلێ نموونەی تری کۆزمۆپۆلیتانی

دابینێین کە بەتەواوی باڵی کێشاوە بەسەر کولتوور و ناوچەکان. مەبەست بریتییە لە ناساندنی چوارچێوەیەکی تایبەتی و واتادار بۆ مەرجەعی جیهانێک لەناو ئەوانی تردا، پاشان بچییە پێشێ بۆ شرۆڤەکرنی لایەنە هاوچەرخەکانی جیهانە نوێیەکان لەودیو رووخانی دووانەییی "رۆهەلات-رۆئاوا".

کۆتاییی ئەو ئیسلامە هاوکاتە لەگەڵ کۆتاییی ئەو "رۆئاوا"یەی کەوا دیالێکتانە هاتە بەرهەم، کە ئێستە خۆی شەکەت کردووە لەنێو چوارچێوەی بنەڕەتیی ئەورووپی. لە کاتێکدا وتارەکەی فرانسیس فوکویاما بەناوی "کۆتاییی مێژوو" هاوکات بوو لەگەڵ رووخانی یەکەتیی سۆڤیەت و بلۆکی رۆهەلات، ئاماژەی دا بەسەرهەڵدانی تاکگەرایی، تاکبالادەستی و ئیمپریالیزمی ئەمەریکا، وتارەکەی ساموێل هەتینگتن بەناوی "ململانەی شارستانییەتەکان" هاوکات بوو لەگەڵ یەکەم هەوڵ بۆ خستنی سەنتەری بازرگانیی جیهانی، لە ٢٦ی شوباتی ١٩٩٣، کە لەلایەن باندێکی موسڵمانی چەکدار ئەنجام درا. بۆیە، لە نێوان رووخانی دیواری بەرلین و یەکەم هێرش بۆ سەر سەنتەری بازرگانیی جیهانی، واتە، ماوەی سەرۆکایەتیی جۆرج ئێچ دەبلیو بوش و سەرهەڵدانی "سیستمی نوێی جیهان"ی، کۆمیونیزمی سۆڤیەت ئیسلامیزمی بەدوژمنی "رۆئاوا" دانا. وتارەکانی فوکویاما و هەتینگتنی مامۆستای پێشووی یەک دەگرنەوە لە خاڵەی کە "رۆئاوا" بۆ ماوەی چوار ساڵ بە ونی بەجێ دێڵن، خێرا نەیانزانی چی لەو رۆئاوا بکەن دوای ئەوەی فوکویاما (هیگڵی بیر هاتەوە و کارل شمیتی لە بیر کرد) سەرکەوتنی رۆئاوای راگەیاند، تا هەتینگتن (هیگڵی لە بیر کرد و کارل شمیتی بیر هاتەوە) دوژمنێکی نوێی جیهانیی بۆ رۆئاوا دروست کرد.

لەگەڵ رووخانی کتوپڕی ناوەخۆی ئەم پێکهاتە ئایدیۆلۆجییانە و سەرهەڵدانی بەهاری عەرەبی، جیهان جارێکی تر بەرەڵڵا بووە، هەر کەس دەتوانێ بیگرێتەوە. لە کتێبەکەی بەناوی "سیمبولی دیموکراتی" (٢٠٠٩)،

فەیلەسووفی ناوداری فەرەنسی ئالێن بایدۆ یاری بە دەربڕینە فرەنسییەکان دەکا: لۆ مۆند ( تاوت هەر کەس) و لۆ مۆند (جیهان) بۆ ئاشکراکردنی وشەی "دیموکراسی" وەک سیمبولێکی دەست لێنەدراو لە سیستمی سیمبولی کە پێی دەگوترێ "رۆئاوا"، دەمامکێکی لەسەر دەکا وەک یەکەم و تاکە جیهان. بایدۆ باسی لۆ مۆند دەکا وەک "جیهانێک کە بوونی ئاشکرایە"، هەروەها "تاوت لۆ مۆند"ی لێ جیا دەکاتەوە کەوا "رۆئاوا شتێکە خەیاڵی خۆیەتی. بۆیە دەڵێ:

"هەموو ئەوانی تر خەڵکی جیهانێکی ترن، واتە، بوونێکی تر، جیهانێک نییە بە رەوانی قسان بکا، بگرە تەنێ پاشماوەیەکی ژیانە، ناوچەیەکی شەڕە، واتە برسێتی، دیوارگەل و خەیاڵ. لەو "جیهان"ە یان ناوچەیەدا، کاتیان بەسەر دەبەن بە پێچانەوەی جانتایان تا رابکەن لە دەستی ترس یان هەموو پێکەوە سەریان هەڵدەگرن تا بەگەر یەکێکی تر بکەون، کێیە ئەو کەسە؟ بێگومان دیموکراتەکانن کە خۆیان بە بەڕێوەبەری جیهان دەزانن و کاریان هەیە کە پێویستە ئەنجام بدرێن."

بایدۆ زۆر بیرتیژە لە کێشانی هێڵ لە نێوان جیهان بەگشتی و ئەو جیهانەی دیموکراسی تێیدا سیمبولە، واتە "رۆئاوا":

بەکورتی، ئەگەر جیهانی دیموکراتەکان جیهانی هەموو کەس نەبێ، ئەگەر تاوت لۆ مۆند بەڕاستی جیهانێکی گشتی نەبێ، ئەوا دیموکراسی، سیمبول و راگری دیوارگەل کە لە پشتییەوە بەدوای خۆشیدا دەگەڕێن، تەنیا وشەیەکە بۆ ئۆلیگارشی پارێزکار کە بزنسی سەرەکییان پاسەوانیکردنی ناوچەی خۆیانە، وەک ئاژەڵان کە هەمان کار دەکەن، لەژێر ناوی سووباری جیهان.

رووخانی کتوپڕی ناوەوەی ئەو جیهانەی کەوا دەزانرا تاوت لۆ مۆندە، ئەم جیهانە چیی تر سیاسی نییە. جیهانێکی فەلسەفیشە. تا بگەی بەجیهانی تازە، ئەو جیهانەی ئێمە تێیدا دەژین، ئەو جیهانەی تێیدا خەڵک یاخی دەبێ، ئەو جیهانەی تێیدا مەیدانی ئازادی و گۆڕەپانی تەحریر بوونە سیمبولی شتێکی تر، شتێک لەودیو "دیموکراسیی لیبرالی رۆئاوا"، شتێک هێشتا ناوی لێ نەنراوە. پێشنیاز دەکەم، لەم جیهانەدا دیمۆگرافی، کۆچی کرێکاران، پرسی جێندەر و کارەساتی ژینگەیی کلیلی سەرەکین. لەم جیهانەدا، ئیسلام ون نابێ، دەچێتە ناو جیهانیبوونی کۆزمۆپۆلیتانی. لەبەرئەوەی ئیسلام لە دیالۆگێکی بەردەوامدا لەگەڵ شتێکی تر. ئەمڕۆ پێناوی سەرەکیی خۆی لە دەست داوە، رۆئاوا، بۆیە ئێستە بێ کەسە، هەر کەس دەتوانی بەخێوی بکا. لەم جیهانەدا، فیلم، چیرۆک و شیعر دەسەڵاتیان زیاتر دەبێ و خەڵک لە شەقام و کوچە و کۆڵانەکان هاوار دەکەن "کوا دەنگم" و "گەل دەیەوێ رژێم برووخێنێ". ئێمە دەبێ ئەم جیهانە بەهێز بکەین لە رێی رزگارکردنی بەڵگەی مادی بۆ بوونی کۆزمۆپۆلیتانیزم لە فیلم، چیرۆک و شیعر، تا ئاستیان بەرز بکەینەوە بۆ جیهانیبوونێکی نوێ کە هەر کەس تێیدا هۆشیار و ئاگەداری خۆی بێ. فەزای ئەو گردبوونەوە خۆگرە وێنەی راستەقینەی گۆڕەپانی تەحریرە.

## پێنجەم

## لە بزووتنەوەی سەوزەوە بۆ شۆڕشی یاسەمین

بۆ خلاسکردنی "ئیسلام و رۆئاوا" وەک جومگەی دوژمنایەتی و بەرهەمی مەعریفە، دانانی نەخشەیەکی ئەخلاقیی نوێی "رۆهەڵاتی ناوەڕاست" لە باتیان بە توانای فراوانکردنی فەزای قسەکردن و پێوەستبوونی نوێی بەمرۆڤایەتی، ئەمە کارێکی وەها سادە نییە. ئەمەش، لەنێو شتەکانی تردا، واتە کۆتاییی "دیراسەی رۆهەڵاتی ناوەڕاست" وەک بنەمایەک. بیرۆکەی ئەو بالادەستییە تەواو لەق و شلۆق بووە، سەری وەسوور کەوتووە، لە رووی ئەقڵییەوە ناجێگیرە بۆ سیستمی بەرهەمی مەعریفی کە بەهۆیەوە ئێمە کاتی خۆی بابەتی بەرهەم و بەکاربەر بووین، ئەمەش واتە ئێمە وەک بریکاری مێژووی خۆمان زۆر بە قورسی هاتووینەتە وەبەرهێنان. ئەم ساتە شۆڕشگێرییە پێویستی بەوەیە ئێمە لە دەرەوەی خۆمان بیر بکەینەوە.

رەوتەکانی تری بەرهەمی مەعریفی لەژێر هەلومەرجی هاوشێوەدا تەواو هاتوونەتە گۆڕین. دەبێ ئەوەمان لە بیر بێ کە تەواوی شێوازی زانستیی کۆمەڵایەتیی مۆدێرنی ئەورووپی بەپرۆژەی رۆشنگەری دەستی پێ کرد لە کۆتاییی سەدەی حەقدە و سەرەتای هەژدە، گوڕ و تینی پێ درا لە دوای شۆڕشی فرەنسیی ١٧٨٩، کاتێ بیرمەندە ئەورووپییەکان، لە ئۆگەست کۆمتەوە (١٧٩٨-١٨٥٧) بۆ کارل مارکس (١٨١٨-١٨٨٣)، دەستی پێ کرد بۆ بەتیۆریکردنی کۆمەڵگەکان بەشێوەیەکی سیستماتیکی، هەروەها دۆزینەوە لۆکالییەکانیان بەتەواوی جیهاندا بڵاو کردەوە. ئێمیلی دورخەم (١٨٥٨-١٩١٧) و ماکس وێبەر (١٨٦٤-١٩٢٠) وەستای کێڵانی ئەو رەوتە

ڕۆشنگەرییەی بەرهەمی مەعریفیی سۆسیۆلۆجی بوون.

لە پاشماوەی جەنگی جیهانیی یەکەم (ج ج ١) زانستگەلی کۆمەڵایەتیی ئەورووپی پەرەی دا بۆ نێو ئەفریقیای باکور، هەروەها بەهۆی کۆمەڵناسی گەورەی وەک تالکوت پارسنس (١٩٠٢-١٩٧٩) و س. رایت میڵس (١٩١٦-١٩٦٢) خەیاڵی کۆمەڵایەتیی ئەورووپی ڕەنگدانەوەی پارێزکاری یان رادیکالی لە ئەفریقیای باکور بەدی کرد. ئەم کەیسە هەر وا مایەوە تا جەنگی جیهانیی دووەم (ج ج ٢) کاتێ تۆقینگەلی هۆلۆکۆست دواجار بووە هۆی رووخاندنی خەیاڵگەلی ڕۆشنگەری. بیرمەندانی وەک مایکل فۆکەڵت (١٩٢٦-١٩٨٤) و تیۆریستە رەخنەییەکانی وەک یورگن هابرماس (ب. ١٩٢٩) پەیدا بوون یان بۆ خلاسکردنی یان تێهەڵچوونەوەی پرۆژەی ئەورووپی بۆ ڕۆشنگەریی مۆدێرنیتە، ئەمە پێشکەوتنێکی دوای راپەڕینگەلی فرەنسی ئایاری ١٩٦٨ بوو کە رەهەندی پۆستمۆدێرنی رادیکاڵی لێ کەوتەوە.

بۆیە، ڕەوت و پرەنسیپەکانی بەرهەمی مەعریفی هەردەم کاریگەریی بزووتنەوەی سەرەکیی کۆمەڵایەتییان لەسەر بووە لە شۆڕشی فرەنسیی ١٧٩٨ەوە تا شۆڕشگەلی ئەورووپی ١٨٤٨، شۆڕشی رووسیی ١٩١٧، بزووتنەوەی قوتابیان و کرێکاران لە شەستەکان، هەروەها مافەیلی مەدەنی و بزووتنەوەی دژە شەڕ لە وڵاتە یەکگرتووەکان. ئەوەی بینیمان لە دەیەکانی کۆتاییی سەدەی بیستەم و کورتەی "پۆستمۆدێرنیزم" دواجار خۆی بە دوا ڕێی پرۆژەی مۆدێرنیتەی ئەورووپی پێشان دا، کە لە مانیفێستۆ ئەورووپی و ئەمەریکییەکانی وەک لایەنێکی دووسەرە بوونی هەبوو لە مۆدێرنیتەی داگیرکار کە شێوەی گشتیی جیهانیان دروست کرد.

لە سۆنگەی ئەو پێشکەوتنانەوە، دیراسەی "ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست" هەر باسی سنوورەکانی ئۆریەنتالیزم بوو. بەڵام، خێرا دوای دەسپێکی شەڕی

سارد ڕەوتی بەرهەمی مەعریفی سەبارەت بە "ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست" شێوەی گۆڕا و بوو بە "دیراسەگەلی ناوچەکان"، بەهۆی بەرهەمهێنانی زانیاریی بەسوود بۆ داوودەزگە سیخوڕییەکانی ولاتە یەکگرتووەکان (و هاوپەیمانە ئەورووپی و ناوچەییـیـەکـانی) وەک هەوڵێک بۆ ڕێگرتن لە پەرتبـوونی سۆشیالیزمی سۆڤیەتی. ئەو ڕەوتەی مەعریفە دواجار بەکۆتا هات لەگەڵ کۆتایی شەڕی سارد، ڕووخانی یەکەتیی سۆڤیەت و پەیدابوونی تینک-تانکی ئەمەریکای باکور و لێژنەی کردەی سیاسی (وەک ئەیپاک و سوپای سیخوڕی واینەپ WINEP)، ئەمە قۆناخێک بوو من ناوم لێ نا "مەعریفە لەژێر پاڵەپەستۆ یان مەعریفەی ئازاد لە قۆناخی پۆست-ئۆریەنتالیستدا".

شتی هەرە گەورە لەم قۆناخانەدا پێوەندیی نێوان مەعریفە و دەسەڵات بووە: ڕەوتێکی مەعریفە هاتووەتە دروستکردن لە پێگەی دەسەڵات کە ئەو دەسەڵاتەی سەلماندووە و پشتگیریی لێ کردووە. باشە، بەهاری عەرەبی چ کاریگەرییەکی هەیە لەسەر ئەم ڕەوتانەی بەرهەمی مەعریفی لەبارەی "ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست"ەوە؟ لەگەڵ تەقینەوەی بەهاری عەرەبی پێکهاتەی داگیرکراو کە پێی دەگوترێ "ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست" بەکۆتا دێ، ئەمە لە کاتێکدایە ئەو دەمەی هەڕەشەیەکی کتوپڕ لە دژی پرۆژەی مۆدێرنیتەی ئەورووپی، لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕەخنەی پۆست-مۆدێرنی ئەقڵ و بابەتی زانیاری، کاتی لە ١٩٧٩ مایکڵ فۆکەڵتی ناردە ئێران بۆ گەڕان بەدوای کاریزمایەکی تەقێنەر کە بتوانێ ئاسۆیەکی نوێی جیهان رابگەیەنێ. بەڵام ئەمڕۆ سەرهەڵدانی ڕاپەڕینگەلی دیموکراتی پێوەستە بە کاریگەریی ئەو ڕێیەی ئێمە خەیاڵی بۆ دەکەین، بیری لێ دەکەینەوە و لەبارەی ئەو ناوچانەوە دەنووسین کە ئیمپریالیزمی ئەورووپی و ئەمەریکی ناویان لێ ناوە "ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست". ئەو ڕێژیمانەی بەرهەمی مەعریفی کە بوونیان هەیە لەنێو مەیدانی "دیراسەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست" زۆر وورن لە مامەڵەکردن لەگەڵ ڕووداوگەل کەوا لەوەتەی جانیوەری ٢٠١١دا پێش دێن. ئەمە بێنە بەرچاوت:

له کۆتاییی جولای ۲۰۱۱، حکوومەتی سووریاییی بەشار ئەسەد یاسایەکی دەرکرد کەوا رێی بە دروستکردنی پارتەیلی سیاسیی تر دا بێ لە حزبی بەعس. ئەمە لە خەیاڵیش مەحاڵ بوو، بە خەونیش کەس باسی نەدەکرد، تێی نەدەگەیشت و شرۆڤەی نەدەکرد لەنێو سنوورەکانی "دیراسەگەلی رۆهەڵاتی ناوەڕاست." ئەو حزبی بەعسە نزیکەی نیو سەدە حوکمی سووریای کرد. رەوتی مەعریفە "دیراسەگەلی رۆهەڵاتی ناوەڕاست"ی بەرهەم هێنا و پشتی گرت، ئەم رەوتە بەهیچ شێوەیەک خۆی ئامادە نەکردبوو بۆ وەها رووداوگەلێک و بۆیە تازە هیچیشی پێ ناکرێ. گۆڕانێک لە رێژیمی مەعریفە داوا دەکرێ و تەواو دەبێ بەهۆی ئەو رووداوانەی ئێستە پێش دێن. ئەمە ماوەیەکی ئینتیقالییە تێیدا سنوورگەلی نیشتمانی تێکوپێک دەدەن و یەکتر دەشێوێنن.

من پێم وایە، بەهاری عەرەبی ئەو بارگرژییەی ناساند لە کتێبەکەی من بەناوی "ئێران، بزووتنەوەی سەوز و ئەمەریکا: رێوی و هاودژی" هاودژییەکە ئەو راستییەیە کە کۆماری ئیسلامی دۆخێکی دروست کردبوو تێیدا هەرچییەک ئەمەریکا بیکردبا لە دۆخەکە (دانوستاندن یان هێرش) لە هەردوو باردا، سیستەمە ئاینییەکەی بەهێزتر دەبوو. ئەو پێگە بەهێزە وەک جاران نەماوە، زۆربەشی لەبەر بەهاری عەرەبی و بزووتنەوەی سەوزە کە کۆماری ئیسلامییان لە هاوڕێ عادەتی و دوژمنە مێژووییەکان کرد، بۆیە بەتەواوی جیۆپۆلەتیکی ناوچەکەیان گۆڕی. ئیسرائیل، دوژمنە گەورەی ئێران، تا سەر ئێسک کێشەی هەیە لەبەر بەهاری عەرەبی، بەهەمان شێوە هاوپەیمانانی مێژوویی کۆماری ئیسلامی، سووریا و حزبوڵڵا، کە ئێمە بینیمان، تووشی گرفتی گەورە بوونە. کارلێکی دیالێکتی نێوان سیاسەتی نیشتمانی و نیشتمانبڕ ئێستە جیۆپۆلەتیکی ناوچەکەیان دروست کردووە بە شێوەی ئەنگێزەی بەردەوام بۆ شۆڕش، هەریەک کار لەوی تر دەکا. سیاسەتی بێهیوایی جارێک نوشستی هێنا بەهۆی ویستی دیموکراتی

نەتەوە-وڵاتان، لەودیو تاکتیک یان کۆنترۆڵی ستراتیجیی هێزەیلی دژە شۆڕش. ئەم رووداوانە وامان لێ دەکەن دان بەپێوەندیی نێوان پێگەی نیشتمان و نیشتمانبڕدا بنێین و لە باوەشی بگرین. لەودیو هەموو لەتبوونە رەگەزی و مەزهەبییەکان، ئێمە شێوازی نوێی هاریکاریی سنووربڕ دەدۆزینەوە، کە لە بەرابەردا داوای رەوتی جێگرەوەی واقیعە تازەکان دەکەن. لەوانەیە ئێمە ئەو واقیعانە ببەینە ناو ئەوەی ئێستە دەیبینین، بەرگە دەگرن، سووکایەتی دەکەن، زاڵ دەبن بەسەر هەموو هەوڵەکاندا. راستییەکان هەمووی لەوێن: سەماکردن لە گۆڕەپانی تەحریر، هەر ئەو راستییانەش تیۆری خۆیان دروست دەکەن. هێزەیلی تێکەڵ و کاریگەریی بزووتنەوەی سەوز و بەهاری عەرەبی رەوتی نیشتمانبڕی نوێیان دروست کرد. ئێمە لە بەردەم دەروازەی جیهانێکی نوێداین، ئەمە خۆی پێشان دەدا، هەر خۆیشی واکامان دێنێ.

## بۆ ئەو چەپانەی دەیانەوێ ببنە راست

چ جۆرە مەعریفەیەک، پرەنسیپێک، جوگرافیا و زمانێک دروست دەبێ لەو ماوەی ئینتیقالییەی کە ماوە بیبینین. تەواو ئاشکرایە کە بەرِی بن پێمان وا خەریکە دێتە دەرێ. فاکتەری سەرەکی ئەوەیە سازانی پێگە و نەریتی سیاسی بۆ نێو ئەم رەوتە نوێیە زۆر زەحمەت دەبێ. ئێمە پێشتر بینیمان کەوا چەپی عەرەب و غەیرە عەرەب لە بەهاری عەرەبیدا دابەش بوونە، پشتگیریی شۆڕش لەو وڵاتانەی کە رێژیمی حوکمڕان ئاسانکاری بۆ بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا و ئیسرائیل لە ناوچەکە دەکا، هاوکات هەمان پشتگیریی دوودڵە، بەگومانە و تەنانەت بێ قسەیە بۆ ئەو شۆڕشانەی لە وڵاتگەلێک کە رەنگە ئەمەریکا و ئیسرائیل و هاوپەیمانەکانی پێیان خۆش بێ، کام لای دەگری؟ سیمۆن عەساف، جەخت لەسەر ئەم پرسە دەکاتەوە لە وتارەکەی بەناوی "لاگیری لە سووریا":

دەمێکە سووریا دڕکە لەبەر پێی ئیمپریالیزمدا. ڕژێمی بەعس هاوکاریی تەواوی بزووتنەوەی بەرگریی لبنانی و فەڵەستینی دەکا کە بۆ مانیان پشت بەسووریا دەبەستن. کەواتە، ئەوانەی خۆیان لە هەمان لادا بینییەوە لە شۆڕشەکانی میسر و تونس کتوپڕ تووشی ناکۆکییەکی توند بوون سەبارەت بەبزووتنەوەکە بۆ گۆڕان لە سووریا. لە ناخی ئەو ناکۆکییەدا دژایەتیی سووریا بوو بۆ ئیمپریالیزم و مەترسییەکانی شۆڕشێک کە چاوی لە رەحمەتی دەسەڵاتی رۆئاوایە. شۆڕشگێڕان چ بۆچوونێکیان بەرامبەر بەبزووتنەوەی سووریایی دەبێ، ئێمە چۆن ڕێژیمێک هەڵسەنگێنین کە، هەرچەندە قوربانیی ئیمپریالیزمە، زۆر بە توندی ئەوانە سەرکوت و دەچەوسێنێتەوە کە داوای چاکسازیی میانڕەوانە دەکەن؟

جیۆپۆلەتیکی نوێ، کە مەرجی بۆ راپەڕینگەلی بەهاری عەرەبی دانا و کاریگەریی قووڵی بەهارەکەشی لەسەر بوو، پێویستی بەبیرکردنەوەیەکی تازە هەبوو، هاوپەیمانی تازە و سووربوون تا جڵەوی لاوازترین و بووەڵەترین کەرتی کۆمەڵگە لە دەست نەڕوا. چەپی راستەقینە، نەک ئەوانەی دەمامکیان بەستاوە و بەناوی چەپەوە زۆر شتی نابەجێ دەکەن، ئێستە پێویستی بەوەیە لە سفرەوە دەست پێ بکاتەوە، لە یەکەتییەکانی کرێکاران، ڕێکخراوەیلی مافەیلی ئافرەتان، گردبوونەوەیلی قوتابیان: شێوازی ژیانێکی مەدەنی تێیدا ئازادییە مەدەنییەکان و دادوەریی کۆمەڵایەتی بناخەی کۆمەڵگەیەکی دیموکراتین.

بۆ ئەوەی چەپ لەم ژینگەیەدا بەخۆیدا بچێتەوە، رەهەندگەلی مێژوویی جیهانی راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی دەبێ دەستەبەر بکرێ. رەشید خالیدی، مێژوونووسی ناوداری جیهانی مۆدێرنی عەرەب، دەبوایە بگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٤٠٢ کاتێ ئیبن خەلدون (١٣٣٢-١٤٠٦) چاوی کەوت بە شەڕوان تەیموور

(١٣٣٦-١٤٠٥) تا بتوانێ بە ڕووداوگەلی بەهاری عەرەبی ٢٠١١دا ڕابگا:
ڕەشید خالیدی گوتی: "هیچمان ئیبن خەلدون نین، بەڵام ئەمڕۆ هەر مێژوونووسێکی عەرەب تەماشای شۆڕشەکانی ٢٠١١ی عەرەبان بکا دەبێ واقی وڕ بمێنێ کەوا باو و باپیرانمان ئەوەیان نەبینی کەوا ئێمە وەرچەرخانێکی مەزن لە جیهانی کاروباراندا دەبینین." ئەمە هەر تەنێ قسەیەکی ڕەوانبێژی نییە. ئێمە بەڕاستی لە لاپەڕەیەکی سپیی مێژووداین. فراوانبوون و گەورەیی ئەم شۆڕشانە لەنێو وڵاتانی عەرەبیدا دیمەنێکی پانۆرامایی هەیە کە وا لە زۆرێک دەکا دەمی بەش بێتەوە و وەها ئاسان هەرسی نەکا و تێی نەگا. ئێمە وەکو بینەر واین لە هۆڵێکی کۆنسێرتدا دانیشتووین، مایسترۆیەکی نەگبەت و بێ چارە جووڵە دەکا لە بەردەم ئۆرکێسترایەکی مەزن کە سەمفۆنیایەکی نامۆ دەژەنن. ئاوازەکە غەریب نییە، سازانەکە سەرسوڕێنەرە. هەر تەنیا موزیکڤانە تاکەکان نین، بگرە ئەو موزیکەشە کە هەموویان پێکەوە دەیژەنن و مێژوونووس بێزار دەکەن.

ڕەشید خالیدی قەناعەتی بەوەیە کە:

> ئەوەی لە تونس و قاهیرە دەستی پێ کردووە چەند ئاسۆیەکی کردووەتەوە کەوا دەمێک بوو داخرابوون. وزە، جموجۆڵ و زیرەکیی نەوەی گەنج لە جیهانی عەرەبی تەقیوەتەوە، دوای تەپاندن لەلایەن سیستمێک کە وەک شتگەلێک مامەڵەی لەگەڵ دەکردن، جڵەوی دەسەڵاتیش تەنێ لە دەستی نەوەیەکی پیری گەوجدا بوو. وێ دەچێ هەروا لە خۆیانەوە، گەنجانی جیهانی عەرەبی متمانە، دڵنیایی و ئازایەتییان بۆ دروست بووە کە وای لە هەندێ پۆلیسی دەوڵەتیی ئەو ڕژێمانە کردووە لەبەریان هەڵبلەرزن.

وزەی تەقیو بێگومان ڕەگێکی لە ئابووریدا هەیە، کاریگەریی دیمۆگرافیای

لەسەرە و لەسەر بنچینەی پێگەی قووڵی کۆمەڵایەتی و نەوەیەکە کە بێبەشە لە کولتوور، لەو هەلومەرجەدا بوو ئیسلامیزمی ڕەها گەشەی دەکرد. بەڵام ئەمجارە شتەکە جیاوازە و کەس ناتوانێ تەماشا نەکا کەوا:

ئەو شتە چییە کە ئەم لێشاوی شۆڕشگێڕییە جیا دەکاتەوە کە ئێمە لە جیهانی عەرەبیدا سەیرمان کردووە و دەیکەین؟ یەکێک لەو شتانە ئەوەیە تونس، میسر، بەحرێن و چەندان وڵاتی تر، تا ئێستە شتەکان بە ئاشتییانە چوونەتە پێشەوە: "سلمية، سلمية" ئەوە دروشمی ئاپۆرەی گۆڕەپانی تەحریرە. بەڵام خۆ گەلێ ڕاپەڕینی مەزنی عەرەبی لە پێشوودا هەر بەم شێوەیە بوونە. ئەمانە بەشێکن لەو خەباتە درێژەی عێراقی و میسرییەکان کردیان بۆ خلاسکردنی داگیرکاریی سەربازیی بەریتانی، هەروەها ئەوانەی سووریا، لبنان، مەغریب و تونس بۆ خلاسکردنی فرەنسا، باسی یەکەم ڕاپەڕینی فەڵەستینیش ناکەن لە دژی داگیرکاریی ئیسرائیل لە ١٩٨٧-١٩٩١. لە کاتێکدا تاکتیکی ناتوندوتیژ لە ڕاپەڕینگەلی نوێی میسر و شوێنی تر پێڕۆ کراوە، ئەمە بێگومان یەکەم جارە کە ڕاپەڕینگەلی عەرەبی بەم شێوەیە ناتوندوتیژ بێ، یان بەلانی کەم بێ چەک بێ.

بێگومان، نەبوونی توندوتیژی لە بەهاری عەرەبی خەسڵەتێکی بنەڕەتیی هەیە: بەهارەکە لەسەر بنچینەی نەبوونی ئایدیۆلۆجیای توندوتیژی ساز کراوە، نەبوونی ڕەوتی چەکداری بۆ نێو ڕاپەڕینی مەدەنی. هیچ PLOیەک نەبوو لەم ڕاپەڕینە، بۆ پێشخستنی کاری فەڵەستینی، هەر لەبەر ئەو هۆیەشە کەوا بەهاری عەرەبی ئیسرائیلی زیاتر ترساندووە لە چاو ئەوانی تر. هەر تەنیا ئەو ڕاستییە نییە کە گەل ڕژانە سەر شەقام و هاواریان کرد "سلمية، سلمية" هیچ باڵێکی چەکداریی بزووتنەوەکە نەبوون لە گوندەکان، چیاکان یان شوێنەیلی شاراوەی ناو شار، بێن وێستگەی پۆلیس بتەقێننەوە

یان کارمەندی سەربازی بکوژن. ئەو مردنەی بووە هۆی گرگرتنی بەهاری عەرەبی کەسی تری نەکردە نیشانە کە بێ خۆی ئاگر دا لە دژی ستەمکارێکی سیستماتیکی. بەڵێ، باڵەخانەی سەر بەرژێمی حوکمڕان سووتێنران، بەڵام ئەم جۆرە کارانە کەم بوون و دووریش بوون، لە سەرووی هەموویانەوە، کاری ئایدیۆلۆجیای سەربازی نەبوون. میسرییەکان گۆڕەپانی تەحریریان پاک دەکردەوە، وێنەیان دەکێشا، بەگشتی، جوانیان دەکرد، دوای ئەوەی مووبارەکیان رووخاند. ئەمە کاری بەکرێگیراوانەی ئۆریەنتالیست نەبوو، رۆژنامەنووسێکی ئەمەریکی ترش و خوێی پێدا بکا، ئەمە راستییەک بوو لەسەر ئەرزی واقیع، راستییەک وێنەی گەردوونی عەرەب و موسڵمانانی گۆڕی، بەلایەنی کەم ئەو وێنەی خۆیان پێشانی دنیایان دا، راستییەک بوو کۆتاییی هێنا بە دەستێوەردانی خوێناوی و سەربازی ئەمەریکا و ئیسرائیل لە ناوچەکە، لە ئەفغانستان و عێراقەوە بگرە تا دەگاتە فەڵەستین و لبنان.

راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی ستەمکارانی ناوەخۆی کردە نیشان کە بەرگریی شۆڕشگێڕانیان کپ و سیس کرد لە دژی داگیرکاریی بیانی، لە کاتێکدا خۆیان ئاسانکارییان بۆ داگیرکاران کرد. دەسەڵاتیان لەو راستییەدایە کەوا ستەمکارانی گەندەڵ هەر لە کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە بگرە تا دەگاتە لیبیا چیی تر نەیانتوانی هەر وا دەری بخەن کەوا شەڕ لە دژی ئیمپریالیزم دەکەن لە کاتێکدا خەڵکی خۆیان دەچەوساندەوە. رەش و سپی بەدیار کەوت. خالیدی ڕاست دەکا کاتێ دەڵێ:

> ئەو شۆڕشانەی لە ١٨٠٠ەوە تا پەنجاکان روویان دا زیاتر بۆ خلاسکردنی داگیرکاریی بیانی بوون. ئەم شۆڕشانە بۆ ئازادیی نیشتمانی دواجار سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و زاڵ بوون بەسەر دەسەڵاتی داگیرکاران و پێگە سەربازییە رک لێبووەکانیان لە جیهانی عەرەبی. ئەم شۆڕشانە لە ئەنجامدا

ڕێژیمی ناشنالیستیان دروست کرد لە زۆربەی وڵاتانی عەرەبیدا. ئەوانەی لە جەزائیر، لیبیا، سودان، سووریا و یەمەنن ئێستەش پابەندن بەدەسەڵات.

ئەو شۆڕشانە بەرپا کران بۆ دەسکەوتێکی بەگومان، بردیانەوە. سەرکەوتن لە خلاسکردنی حوکمی داگیرکارانەی ئەورووپی بەسەر جیهانی عەرەبی، بەڵام ئەنجام چەند ستەمکارێک بوون کە گەلی خۆیانیان چەوساندنەوە، پەرپووتیان کردن لە ئازادییە مەدەنییەکانیان، هاوکاتیش بناخەی ئیمپریالیزم لە ناوچەکە، ئیسرائیل، ڕۆژ دوای ڕۆژ بەهێزتر بوو. لە دژی ئەو باکگراوندە، ئەو شۆڕشانەی ئێمە ئێستە دەیانبینین شتگەلێکی ترن، مامەڵە دەکەن لەگەڵ کارێکی تەواونەکراو، شێوەیەکی پاخیبوونی دواخراو، هەموو ئەمانە یەکسانن بە خەباتی دژە - داگیرکار بەڵام زۆر قووڵترن لە داواکارییە پتەوەکانیان بۆ ئازادییە مەدەنییەکان. هەروەک خالیدی دەڵێ: "ئەوەی شۆڕشەکانی ٢٠١١ لەوانەی پێشتر جیا دەکاتەوە ئەوەیە ئاماژەن بە کۆتایی قۆناخی کۆنی ئازادیخوازی نیشتمانی لە بن دەستی حوکمی داگیرکار، هەروەها بەگشتی سەبارەت بەکێشەگەلی ناوخۆی کۆمەڵگەی عەرەبین." هەر بۆ دڵنیابوون، خالیدی نوشدارییی ئەوەش دەدا:

بێگومان، لەگەڵ شەڕی سارد داگیرکاریی کۆن لە ئاکامدا ڕێی زیاتری کردەوە و خۆشی کردن بۆ دزەکردنی کاریگەریی دەرەکی، یەکەم دوو زلهێزەکە، هەروەها ئەمەریکا بەتەنێ زاڵ بوو لە ماوەی دوو دەیەی ڕابردوودا. تەواوی سیستمی ناوچەییی عەرەب لەبن دەستی ئەو دەسەڵات بزۆتە بوو، کە هاوکاریی گرینگ بوو بۆ مانەوەی ئەو ڕێژیمە دیکتاتۆرانەی ئێستە لە بەردەم گەلانی خۆیان دەلەرزن. بەڵام لە کاتێکدا ئەم فاکتەرە گرینگە هەردەم لە باکگراوندا بوو، جەختی شۆڕشگەلی ٢٠١١ لەسەر کێشەگەلی ناوخۆی دیموکراسی، دەستوو و یەکسانی بوو.

بێگومـان، بێ هیچ درێژەی خـەیاڵێک، ئەمـە دەکرێ جـێی خـۆی بگرێ سـەبارەت بەپرسگەلی وەک باڵادەستیی ئیمپریالی ئەمـەریکا، دزینی خـاکی فەڵەسـتین لەلایەن ئیسـرائیل، یان هەڕەشـەی سـعوودیە بۆ هەر گـۆڕانێکی دیموکـراتی لە ناوچەکـە، یان بەڕاسـتی هەلگەرایی کـۆماری ئیسـلامی لە قـۆسـتنەوەی هـەر رووداوێک لە ناوچـەکـە بۆ بەرژەوەندی و مـەرامـی خـۆی. لەگەڵ ئەوەشـدا، ئەوەی راپەڕینگەلی سـیاسـیی پێناسـە کـردووە لە راسـتیدا شتێکی غەیرە سیاسییە، شتێکە ئەخلاقی:

بەڵام داوایەکی تر هـەبوو لە ٢٠١١. داوای شکـۆمـــەندی بـوو. ئەمـەش دەبێ بە دوو شـێوە تێی بگەیشـترێ: شکـۆمـەندیی تاک، شکۆمەندیی کۆمـەڵگە، شکۆمەندیی گەل، شکۆمەندیی نیشـتمان. داوای شکۆمـەندیی تاک زۆر ئاسـان دێتە تێگەیشتن. لە بەردەمی پۆلیسـی تۆقیـوی دەوڵەت کـە تاکی سـەرکوت دەکـرد، ئەم داوایە سـروشــتی بـوو. دانانی سـنوور بـەبەردەوامی لـەلایەن ئـەو وڵاتە دیکتـاتۆرانە لەسـەر شکۆمـەندیی نزیکەی هەمـوو هاووڵاتییـانی عــەرەب، هەروەهـا بەردەوامـــیی دەســـەڵات لە دووپاتکردنەوەی هیچوپووچیی میللەت، لە ئاکامـدا لە ناوخۆ تەقییەوە و خاوێکی گشـتیی خودی و کپبوونێکی بێوێنەی کۆمـەڵایەتیی دروست کرد. ئەمـە خـۆی لەنێـو گـرژیی مـەزهەبیـدا، هەراسـانی سـێکسـیی ئافـرەتـان، تاوان، بەکــارهێنانـی مــادەی هۆشــبــەر، بەردەوام کەمکردنەوەی مەدەنییەت و نەبوونی روحی گشتیدا دیتەوە.

شکۆمـەندی پرسـێکی سـیاسی نیـیە. شکۆمـەندی پرسـێکی ئەخـلاقیـیە ئێـســتـە بووە هێـزێکی سـیـاسی. وەک لۆجـیکێکی ئەخـلاقی "کـەرامـە" شکۆمەندی شتێکە سەربەخۆ و پێوەست نییە بەهیچ ئاینێک، تەواو بەندە بە خودی خۆی و پیادەکردنی. ناوەڕۆکی چالاکیی مرۆڤـایەتی لەوپەڕی داوا بۆ شکۆمـەندی لـە راسـتیدا پێناسـەی ئـەو گردبوونەوە شـۆڕشگێڕییـە دەکـا لە

پێناو مـرۆڤـایەتی. شکۆمـەندی کـۆتاییـیـەکـە لەناو خـودی خـۆی، هۆ و مـەرجـەکانی لەلای راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕانەیە. ئەم داوایەی شکۆمـەندی پێویستی بەئاژانسێکە، ئەو داوایە نـەخشـەی ئەخـلاق دەکێشێ، هەروەها زاراوەی "عـەرەب" رزگـار دەکا لە دەیان سـاڵ و نەوە لە چەوسـاندنەوە. وەک زاراوەیەکی ناسیاسی چووە نێو بواری سیاسی، "شکۆمـەندی" دەسـەڵاتێکی گـەورەی هـەیە، جـەربەزەیەکی سـەرەتای تێـدایە، رووداوێکی مـێـژوویی جیهانی رادەگەیەنێ کە خەریک بوو جیـهانێکی تایبەت بـەخۆی بدۆزێتـەوە: هەموو ئەمانە لەلایەن بەهاری عەرەبییەوە هاتنە راگەیاندن.

## نیولیبرالیزمی نالیبراڵ

راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕانە شیمانەی سیاسیی کردووەتەوە بۆ تەماشاکردنی رووداوگەل لەودیو جیهانی عەرەبییەوە، ئاسۆیەکانی فراوان کرد، ئەو شتەی رزگار کرد کە فەیلەسووفی ئەڵمانی، هانس بلەمنبێرگ (١٩٢٠-١٩٩٦) پێی دەوت "رەهابوونی واقـیـع"، کـە دەسـپـێکە، خـاڵی سـفـرە بۆ نوێکردنەوەی دروسـتکردنی ئەفـسـان (بەڵام ئەمـجـارە لیـبرالانەتر)، یان "ئەفسـانەگـەلی رەهـا". ئەم رێککەوتە بێنـە بەرچاوت (ئەی ئـەمـــە رێککەوت نیــیـــە؟): "لـە ناوەڕاستی شـوبات، هـەفتەی دوای ئەوەی حـوسنی موبارەک لە پۆست وەدەر نرا بەهـۆی شـۆڕشی مـیـسـری، بۆ یەکـەم جـار خـۆپێشـاندان لە ویلایەتی ویسکۆنسن دەسـتـی پێ کـرد لـە دژی هەوڵەکـانی حـاکـمـی کـۆمـاری هەڵبـژێردراو بۆ تێکشکاندنی دەسـەڵاتی رێکخـراوی یەکـەتیـیـەکـانی دامەزراندنی گشتی." ئەمە پاول رۆسنبێرگە، نووسیـاری باڵای دەستـەی هەواڵی راندەم لێنگس، کـە رۆژنامـەیەکە دوو هـەفتـە جـارێک دەردەچێ، بۆ جەزیرەش دەنووسێ. بەردەوام دەبێ: "هەرچەندە هۆیە تـایبەتیـیەکان تەواو جیـاواز بوون، لۆجیکی هـەسـتـانی گـەل لە دژی نوخبـەی دژە - دیموکراتی بەهێز زیاتر بوو لە وێکچوواندنی گۆڕەپانی تەحریر لە قـاهیرە و باڵەخانەی

کاپیتۆل و ژینگەی مادیسن و ویسکۆنسن." دەبێ ئەوە یەکەم جار کە ڕووداوی مێژوویی جیهانی لە جیهانی عەرەبی و موسڵمان وا خێرا بێ، بەڕاستی زۆر پێویست بوو، لۆجیکێکی تەواو بوو، کیشوەربڕ بوو، بەراورد کرا لەگەڵ ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئۆکیوپای وۆڵ ستریت لە ئەمەریکا.

پاول ڕۆسنبێرگ هەردوو ڕووداو پێناسە دەکا بە "ڕووداوی بێوێنە پێوەست بە یەکترین، وەک دەربڕینی نیشتمانی جیاوازیی شەپۆلی نارەزایی و شۆڕش کە ئەوروپای ڕامالی لە ١٨٤٨، یان تەواوی ئەوروپای سەراوژێر کرد لە ١٩٦٨." ئەوەی لێرە گرینگە ئەوەیە بۆ یەکەم جارە لە مێژووی مۆدێرن بناخەی مێژووی جیهانی دێتە گۆڕین. شتێک لە جیهانی موسڵمان و عەرەبی ڕووی داوە کە وای لە ڕۆسنبێرگ کردووە بیر لە "خەباتێکی درێژکراوە بکەنەوە بۆ درککرن بە جیهانێکی یەکسان و دادوەرانەتر، شتێکە سنووری کولتوورەکان دەبڕێ، هەرچەندە لە دەربڕیندا تەواو لە یەکتر جیاوازن،" لە ڕووی ئارامی و باسکردنەوە، کاتێ بە ساتە مێژووییەکانی تر دێتە بەراوردکردن: "بەڵام، وێڕای شکستی ئەم شەپۆلانەی شۆڕش (لە ئەوروپا لە ١٨٤٨ و ١٩٦٨)، کاریگەری قووڵیان هەیە، هەستی شتە ئاساییەکانی گۆڕی، هەتا ئەگەر یەکسەر ڕوون نەبووبێ چۆن لە واقیعدا ڕەنگ دەداتەوە. بۆ نموونە، خۆپیشاندان لە هەردوولای پەردەی پۆلایین لە ١٩٦٨ پێشنیازی بزووتنەوەی ماوە درێژی کرد کە یارمەتیی شەڕی ساردی دا بە ئاشتییانە خلاس بێ." ڕۆسنبێرگ خوێندنەوەیەکی هاوشێوەی شۆڕشگەلی ١٨٤٨ پێشکێش دەکا:

> کاتێ ئۆتۆ ڤۆن بیسمارک، یەکێ لە پێشەنگانی پارێزکارانی ئەوروپا لە سەدەی نۆزدە، بووە ئەندازیاری خۆشگوزەرانیی ئەڵمانیا لە ١٨٨٠ەکان، یەکێ لەو هۆیانەی ئەو کارەی کرد هاوکاریکردنی پارتی سۆشیەل دیموکرات بوو. بەڵام، ئەو کارە خۆسازاندنە خۆی لە خۆیدا دانپێدانانێک بوو بە چۆنیەتیی

ئەوەی ١٨٤٨ بەقووڵی جیهانی گۆڕی.

لە بەراوردکـــردندا بۆ ئەم خـــاڵی وەرچەرخـــانە لە ١٨٤٨ یان ١٩٦٨ لە ئەوروپا، پاول ڕۆسنبێرگ پێشنیاز دەکا کە:

شـەپۆلی هەنووکەی نارەزایی شۆڕشگێڕانە، کە لە جیـهانی عەرەبیدا چڕ بووەتەوە، بەڵام سـەداکەی لە ئێرانەوە بۆ ئیسـپانیا و لەوێشەوە بۆ ئەمەریکا هەیە، ئاماژەی هاوشێوە پێشان دەدەن، هەرچەندە جـیـاواز لە دۆخـە جـیـاوازەکـاندا کـار دەکـا. یەک جـیـاوازیی زۆر گـرینگ لە ١٨٤٨ و ١٩٦٨ ڕۆڵی مـیـدیای کۆمـەڵایەتیـیە، کە دەرفـەتێکی گـرینگ دەدا بەچینی خـواروو بۆ خۆڕێکخستن. ئەوە ماوە ببینین ئەمە چۆن دێتە سـەلماندن، بەڵام هەر هیچ نەبێ شیمانەیەکی گەورەی ئەوە هەیە کە بەشێوەیەکی گشتی کاریگەری ئەرێنیی زۆری لێ بکەوێتەوە.

شرۆڤەکانی ڕۆسنبێرگ زۆر جەخت دەکاتە سـەر دەنگی قووڵی بەهاری عەرەبی لە ئەوروپا و وڵاتە یەکگرتووەکان، کە ئێستە دەنگی خۆیان دەبین، سەدای خۆیان لەم ڕاپەڕینە کۆمەڵایەتییەدا دیارە: "شتەکان زۆر جیاوازن لە ناخی ئابووریی ئەوروپا و ئەمەریکا، هۆی گەورەی ئەمەش دەوەستێتە سەر پیادەی ئابووری نیولیبرالی، کە بەسەر جیهانی باشووردا سەپێنراوە لە هەشتا و نەوەتەکاندا، کە دواجار بووەتە نیشتمانێک بۆ لەخۆگرتنی ئیمپریالی نوێ." هەرچەندە دیارکردنی جوگرافیای "جیهانی باشوور" و "خاکی ئیمپریالیی نوێ" ئێستە جیهان بەسەر چەندان چیندا دابەش دەکا، هەڵسەنگاندن و بەراوردی ڕۆسنبێرگ هێشتە هەر بەنرخ دەمێنێتەوە:

هەردووک شۆڕشی میسری و کۆپییەکەی لە ویسکۆنسن ئاکامی فەشەلی کارەساتباری سیستەمی نیولیبرالی جیهانی بوو لە تەنگژەی دارایی کـــۆتایی ٢٠٠٨، هەروەها هەوڵ درا بۆ

رزگارکردنی ئەوانەی خەریک بوو لەناوچن، نەک ئەوانەی بوونە قوربانی. هەمان شت راستە بۆ تونس، شوێنی لەدایکبوونی بەهاری عەرەبی، هەروەها ئیسپانیاش، کە تێیدا بزووتنەوەی "دیموکراسیی راستەقینە هەر ئێستە!" خۆپێشاندانی گەورەی هاوشێوەی بەهاری عەرەبی هێنا ناو کیشوەری ئەورووپا.

دووانەی "رۆئاوا و ئەوانی تر" هەر نەوەستاوە، ئاماژەی بەجێی رۆسنبێرگ بە ئەمەریکای لاتین چوارچێوەکە فراوانتر دەکا: "تەقینەوەی بەهاری عەرەبی دەکرێ ببێتە هەوێنی تەقینەوەی ئەمەریکای لاتین کە دەمێکە چاوەڕێیە و دوور لە نیولیبرالیزم و بالادەستیی ئەمەریکا." ئەم چوارچێوەی یاخیبوونی کیشوەربڕ لە دژی نیولیبرالیزم زۆر گرینگە بەلام سنوورداریشە چونکە هۆیەلی ئابووری دنەی سەرەکیی ناوخۆ و دەرەوەی بەهاری عەرەبی بوو. ناتوانن پێناسەیان بکەن، ناشتوانن بێ ئەو هیچ شرۆڤە بکەن. لە رووی ئابوورییەوە، لەوانەیە بتوانین بەراورد بکەین لە نێوان ئەوەی لە ئەمەریکای لاتین و بەهاری عەرەبیدا روویان دا. بەلام راستیی ئەوەی کە پاڵەوانی دژە -نیولیبرالیزم، هیوگۆ شاڤێز، هاوکاریی پێشکێشی قەزافیی هاوڕێی کرد کاتێ لیبیاییەکان لە دژی هەستان، ئەمە نابێ لە یاد بکرێ، لەوانەیە هیوگۆ شاڤێز و ئیڤۆ مۆرالس هەرچییەک باش بێ بیکەن لە ئەمەریکای لاتین، راستیی ئەوەی کە وەک قەزافی و ئەحمەدی نەژادن، زۆر نزیکە ئەوەی لەو دوو وڵاتە روویان دا بپەڕێتەوە بۆ وڵاتانی ئەمەریکای لاتین. ناکرێ و مەحاڵە ببێتە پاڵەوان بۆ خەڵکی هەژار لە ڤەنزوێلا و بۆلیڤیا، بەلام هاوکاریی دیکتاتۆر یان ستەمکاری سیستمی ئاینی لە هەندێ وڵاتی تردا بدەی. جیهانی تازە یەکسەر ئەو دووڕوویییانە بەدەر دەخا و نوشستیان پێ دێنێ.

رۆسنبێرگ بەردەوام دەبێ لە شیکردنەوەی جیاوازییەکانی نێوان ئیسپانیا و ویسکۆنسن و تونس و میسر بەزاراوەی "خەباتێکی

چاوەڕوانکراوی لەمێژینە لە نێوان نیولیبرالیزم و ئابووری و سیستمی خۆشگوزەرانی لە جیهاندا"، بۆیە هەموو شتەکان دەباتەوە سەردەمی "هەردوو شۆکی جمکانەی نەوت لە حەفتاکان" و تەنانەت بەنیشتمانیکردنی نەوت لە ئێران لە ١٩٥٣ و هەوڵی گواتیمالا بۆ دامەزراندنی وڵاتێکی خۆشگوزەرانیی ستایلی نیو دیل لە ١٩٥٤، (کاتێ) سی ئای ئەی کاری دەکرد بۆ لادانی هەردوو حکوومەتە دیموکراتە هەڵبژێردراوەکە و شوێنیان بە دیکتاتۆر پڕ بکاتەوە، تا بەرگی لە ئازادی بکەن وەک ئەوەی لەلایەن ئەمەریکا پێناسە کراوە لە کاتی شەڕی ساردداً. سەبارەت بەهەموو ئەو شتانە، رۆسنبێرگ بەمجۆرە دەدوێ:

> ئەو دۆخە تایبەتییانە ململانەی بەردەوامن لە نێوان بەڵێنی ئایدیۆلۆجیی بەلاغەی بازاڕی ئازاد و واقیعی دووبارەبووەوەی قۆرخکردن، ئۆلیگارشییەکان، سەرمایەداری نابەجێ و ئی تر کە بەناوی ئازادی پێش دەکەون و دەست بەسەر جیهاندا دەگرن. یەکەمیان بەریتانیا، ئەوجا ئەمەریکا ماوەی دوو سەدەیە دەستیان بەسەر جیهاندا گرتووە لەژێر ئاڵای تایبەتی "ئازادی" کە مۆڵەت دەبەخشێ بەزۆربەی فۆرمەکانی سەرمایەداری.

بەڵام ئەمجارە، ملیۆنان کەس لە مەغریبەوە تا ئێران، لە سووریاوە تا یەمەن ڕژاونەتە سەر شەقام و گۆڕەپان و مەیدانی شارەکان تا لە یەک کاتدا خۆیان پیشان بدەن لە دژی ستەمکاری وڵاتی خۆیان و تەداوخولاتی دەرەکی و بیانی. ئەمە ئەو ساتەیە تێیدا هەموو شێوازەکانی ئایدیۆلۆجیی پۆستکۆلۆنیال شکستیان هێناوە، هەروەها دیکتاتۆری نەقۆرای وەک ئایەتوڵڵا خامەنایی یان موعەممەر قەزافی دەبێ هەموو شتێکیان بەدەر کەوێ. کەواتە، وەستانەوە لە دژی بەڵێنی ئایدیۆلۆجیی بەلاغەی بازاڕی ئازاد چیی تر لەژێر دەستی دیکتاتۆرێکی زوڕناژەنی رۆئاوادا نییە، بگرە لە دەستی ویستی دیموکراتی نەتەوەکاندایە.

پاول ڕۆسنبێرگ ڕەخنە دەگرێ لە چەپی ئەورووپی لەبەرئەوەی بەگشتی بەلاغەی نیولیبڕالیی پەسند بووە لە ماوەی دوو دەیەی بووریدا، هەتا کاتێ درێژەی بەپابەندبوونێکی تیۆری دەدا بە دادوەریی کۆمەلآیەتی و ئابووری بۆ جیاکردنەوەی خۆیان لە پارتەیلی ڕاست. هەروەها ڕەخنەش لە دیموکراتەیلی ئەمەریکا دەگرێ لەبەرئەوەی بەگشتی ڕاپەڕینی ویسکۆنسنیان پشتگوێ خستووە. خوێندنەوە و سەرنجی لەبارەی کزبوونی دەسەلآتی ئەمەریکاوە ژیرانەیە: "هەوڵە درمنگەکانی ئۆباما بۆ ڕاگەیشتن بە بەهاری عەرەبی شتێک زیاتر لە زیانێکی گشتیی بالآدەستیی پێشووی." ئەنجامی ڕۆسنبێرگ زۆر بە ڕوونی ئەو ڕێی لە بەردەممانە دەبینێ:

بەلآم شۆڕشی ڕاستەقینە ئەوە نییە دەسەلآتێکی تر لە شوێنی دەسەلآتی ئەمەریکا دابنێی، چونکە ئەمە دەبێتە ڕەوتێکی تری هەڵەی "ئازادی" کە تەنێ بازاڕ پێناسەی دەکا. شۆڕشی ڕاستەقینە ئەوەیە بازاڕی بکەیت بە خزمەتکاری خەونگەلی مرۆڤایەتی، نەک ببیت بە سەرۆکی بازاڕ. هەر بۆ ئەمەش بوو محەمەد بوعەزیزی ژیانی کردە قوربانی. ڕوحی لەبەر ئەم هۆیە دەژی، نەک هەر تەنیا لە تونس، بگرە لە تەواوی جیهانی عەرەبی و سەرانسەری جیهاندا، تەنانەت لە مادیسن و ویسکۆنسن.

بۆ ئەوەی محەمەد بوعەزیزی هەر بەشەهید بمێنێتەوە و شایەت بێ بەسەر ئەو شۆڕشەی کە دیکتاتۆر بە دیکتاتۆر ناگۆڕێتەوە، ئەمەش هەڵەیەکی تری ئازادییە، یەک پێوەری لۆجیکی و دایمیی هەیە: گەل. تا ئەو دەمەی گۆڕەپانی تەحریر کراوە بێ بۆ یاخیبوونی گەل، ئەو شۆڕش کۆتا - کراوە دەبێ. لە کۆتاییی جولای ٢٠١١دا، بە دەیان هەزار کەس گۆڕەپانەکەیان چۆڵ کرد، دوای ئەوەی سەرانی ئیسلامی بۆ یەکەم جار قسەیان بۆ خۆپێشاندەران کرد لەوەتەی سەرۆک حوسنی موبارەک لە شوبات هاتبووە خوار. بی بی سی گوتی "گەلێ خۆپێشاندەر، کاریگەریی لایەنگرانی ئیخوان

موسلمینیان لەسەرە، داوای دروستبوونی دەوڵەتێکی ئیسلامی و چەسپاندنی یاسای شەریعە دەکەن. پەیامنێران دەڵێن گردبوونەوەکان جێی نیگەرانیی عەلمانییەکان دەبن. قەت پێشنیازێکی وا نەبووە ئیسلامییە میسرییەکان قسەیان نەبێ لە شۆڕشی نیشتمانیان، یان نابێ ڕێیان پێ بدرێ لە گۆڕەپانی تەحریر کۆ ببنەوە. مەبەست ئەوەیە گۆڕەپانی تەحریر دەبێ کراوە بێ بۆ ئەوانەی خۆیان بە عەلمانی دەزانن بێنە ئەوێ، ئەگەر هەینی نەهاتن با چوارشەم بێن، بە کەیفی خۆیان، بۆ ئەوەی خۆیان دەربڕن. ترس لە ئیسلامییەکان، هەر کێیەک بن، لەوانەیە ترسی بی بی سی بێ چونکە نازانێ ترسی راستەقینەی رەهای ئیسلامیزم چییە لەناو میسر. کرانەوەی ئاسۆیی جیهان تا دێ ئەم جۆرە شتانە ئاشکرا دەکا. بەڵام یەک شت روونە: مەحاڵە وابزانی ئیسلامییەکان لە میسر خەڵک بریندار دەکەن، دەکوژن، کپ دەکەن، دەگرن، زانکۆکان پاک دەکەنەوە، شۆڕشێکی کولتووری دەکەن یان غەیرە ئیسلامییەکان ناچار بکەن وڵات جێ بێڵن، وەک چۆن کۆماری ئیسلامی لە ماوەی سی ساڵی بووریدا وای کردووە. نموونەی دڕندایەتیی کۆماری ئیسلامیی ئێران لە گۆڕەپانی تەحریر وەک ئاوێنەیەکی درێژ دەردەکەوێ. ئەمە مانای ئەوە نییە بڵێی میسرییەکان وەک موسڵمان نابێ قسەیان هەبێ لە کاروباری نیشتمان. شۆڕشی کۆتا - کراوە دەسبەجێ و بەردەوام جێگرەوەکانی خۆی دروست دەکا.

## ئەقڵانیەتی نیشتمانبڕ

ئەقڵانیەت لە نێوان سیاسەتی نیشتمانی و جیۆپۆلەتیکی نیشتمانبڕ هاوکێشەیەکە بە کاردانەوەی چەکی ئەتۆمی دەچێ، تێیدا هیچ هێزێکی دژە شۆڕش ناتوانێ بەتەواوی کۆنترۆڵی رەوتەیلی پارتە سیاسییەکان بکا هەرکە شوێنی زیاتر داگیر دەکەن و باڵادەستیان فراوانتر دەکەن. بای دیموکراسی، بۆ گۆڕینی میتافۆرێکی خۆشتر و زیاتر جەخت لە ژیان

بکاتەوە، زۆر بەجوانی لەلای ڕۆژهەڵاتەوە لە ئەفریقیای باکور هەڵدەکا و دەسکە یاسەمینی تازە بە نێو ڕووباری نیلدا دەنێرێ بۆ کەنداوی فارس، بۆ ئەودیو دەریای عەرەبی، بەسەر زەریای هیندی و بۆ نێو دوورترین ناوچەی ئێران و ئەفغانستان و پاشان بۆ نێو ئاسیای ناوەڕاست. ئەمە هێزی سروشتە، درێژە لە کاتی دروستبووندا، هەروەها درێژترە لە کاتی کرانەوەدا.

سەرکەوتنی ویستی دیموکراتیی تونسییەکان و میسرییەکان سەرکەوتنێکی هاوتەریبی حەزی ئێرانییەکان بوو، کە تەواو ئەو شتەیان کرد کە ئێمە ئێستە لە تونس و میسر دەیبینین ساڵ و نیوێک پێش ئێستە لە ڕێی بزووتنەوەی سەوز، بەڵام هێشتا ماویەتی بگاتە خەونی کۆتایی. ئێرانییەکان لە ناوەوە و دەرەوەی نیشتمانەکەیان خەنی بوون لە سەرکەوتنی خێرای ڕاپەڕینی تونس و سووربوونی قارەمانانەی میسرییەکان. هەرچەندە هێشتا ماویانە دیکتاتۆرە زل و چەپەڵەکە لەناوبەرن، بەڵام هەر دوای ئەو ڕووداوگەلە بێوێنەیەی میسر و تونس دەکەن. لەسەر فەیسبووک و تویتەر، لەسەر ماڵپەڕ و تۆڕەکان، پێگەی ئینتەرنێت و تۆڕی هەواڵ، لە ڕێی ئیمەیڵ و نامە، بە فارسی، فرەنسی، ئینگلیزی، عەرەبی، ئێرانییەکان لە سەرتاسەری جیهان شتەکان پۆست و شێیەر دەکەن، تەماشای کلیپەکانی یوتیوب دەکەن و قسەیان لەسەر دەکەن، لەسەر جەزیرە بەدیار دەکەون، دوای ڕووداوگەل دەکەون، ئامۆژگاری پێشکێش دەکەن، وردەکارییەکان شی دەکەنەوە، پیرۆزبایی لە هاوڕێ و هاوەڵە تونسی و میسرییەکانیان دەکەن، هەروەها پۆستەر و گرافیک و هێڵکاریی زۆر سەرنج ڕاکێشیان کرد کە یەکیان دەگرتەوە لەگەڵ چارەنووسی ئەوان: "داهاتوو هی ئێمەیە" ئەمە بە فارسی، عەرەبی و ئینگلیزی لەسەر ئەو پۆستەرانە نووسرابوو.

هەرکە ئەو ڕووداوانە لە تونس و میسر دەکرانەوە، زۆر گرینگ و داخوازی بوو لەگەڵ ناشنالیزمی کوێرانەی عەرەب تێکەڵ نەکرایەوە، چونکە بەهاری

عــــەرەبی زۆر لــەوە گـــەورەتر، رەواتر و تــەواوتــرە. بای بــەهــاری عـــــەرەبی گەیشتووەتە ئەودیو جیهانی عەرەبی، لە راستیدا، رەوت و شێوازی جیهانی عەرەبیی گۆڕی، شۆڕشگێڕەکانی لەودیو ناسنامەی سیاسـی وەک "عەرەب" پێــشــان دا. هــەر تەنیــا وەک عــەرەب نەبوو کــە تونسـیــیــەکــان لە دژی ستەمکارەکەیان هەستان. تەنیا وەک عەرەب نەبوو کە میسرییەکان یاخی بوون لە دژی حکوومــەتــی گــەندەڵیــان. بگرە، وەک هــاووڵاتی بوو کــە لەلایەن کۆمارەکــان ناپاکــییــان لەگەڵدا کــراوە، کــە لەوەتەی داگیـرکــاریی ئەوروپا دەیانچەوسێننەوە، کەوا تونسی، میسری، یەمـەنی و ئەوانی تر لە ناوچەکە لە دژی ئەو ستــەمکارانە هەسـتـان کە حوکمیـان کردن، لە دژی ئەمـەریکا و بەرژەوەندییــەکــانی ئەوروپا هەســتــان کە ئەو ســتــەمکارانەیان لە دەســەڵات هێشتــەوە لە دژی ویستــی گــەلی خــۆیان. دەسـپـێکی بنیـاتنانی نەتــەوەکان لەلایەن پۆستکۆلۆنیـالەوە بەڵێنی بۆش بوو بۆ هەموو ئەوانەی لەژێر سێبەری داگیرکاریی ئەوروپیدان.

ســەرکەوتــنگەلی تونسی و مـیـسری ســەرکەوتنگەلی بزووتنەوەی ســەوزیش بوون لە ئێران، هـی راپەڕینگەلی دیموکراتییـانەی ناوچەکانی تریشی بوون. لە کــاتێکدا ئەمـــەریکا بە ســـەخــتــی بریندار بووبوو بە لەدەســـتـــدانی هاوپەیمانەکانی لە ناوچەکە: کۆماری ئیسلامی، بەشبەحاڵی خۆی، دوژمنە سـەرەکییـەکانی خۆی لەدەست دەدا، لەم بەشـەی جیهانیشدا لەدەستدانی دوژمن خــراترە لە لــەدەســتدانــی هاوڕێ. لەوەتەی دروســتــبـوونی، کــۆمــاری ئیسلامی تاکە سـوودمەندی سیاسـەتی بێهیوایی بووە کە ناوچەکەی دروست کردووە، ئازارەکــانی فەڵەسـتین چەقی ئەو هەلقۆزەرەوە بوو. هاوسەنگییەکی تۆقین هەیە لە نێــوان ئەمـــەریکا و هــاوپــەیمانەکــانــی لەلایەک و کــۆمـــاری ئیسلامی و هــاوپەیمانەکانی (حەماس، حزبوڵلا و سوپای مەهدی) لەلاکەی تر. هەر گۆڕانێک لەو هــاوسـەنگییە هەر تەنیا بەتوندی ئەمـەریکا تێک نادا، توندتر کۆماری ئیسلامیش تێک دەدا، ئەمەش شـتـێکی ئەرێنییە بۆ پرسی

ئازادی لە ئێران و ناوچەکە بەگشتی.

ڕێیەکی تر، وەک ئێمە بەهێز، هەیە تێیدا ڕاپەڕین و سەرکەوتنی بەهاری عەرەبی هەوێنی خۆشییە بۆ بزووتنەوەی سەوز لە ئێران. باڵی دووانە و لێک دووری ئەمەریکا/ئێران بۆ ڕفاندنی بزووتنەوەی سەوز، دووبارەبوونەوەی ئەو هەڵەیە کەوا هیچ دیموکراسییەک بوونی نییە بەبێ نیولیبرالیزم، بەشێوەیەک کەوا دیموکراسی و بازاڕی ئازاد دوو دیوی یەک دراون. ئەو هێزانەی لەنێو ئەو بزووتنەوەی کە جەنگابوو لە دژی ئەم ڕەوتە بووە مایەی مشتومڕی زۆر گەورە. بەڵام لەگەڵ فڕینی بەگومانی بن عەلی لە تونسەوە بۆ سعوودیە، ئەو وەهمە ڕێی خۆی لەدەست دا. داوای تونسی بن عەلی بۆ ڕەچەی نیولیبرالی خەونێک بوو بۆ بانکی جیهانی و دەزگای تەمویلی پارەی نێودەوڵەتی (ئای ئێم ئێف IMF)، یەکەتیی ئەورووپا (بەتایبەتی فەرەنسای سارکۆزی) زۆر خۆشحاڵ بوو بە سیاسەتی نیولیبرالانەی بن عەلی، زیاتر لە شەڕی سەرۆک بوش لە دژی تیرۆریزم، چونکە تونسیان بە پارچەیەک لە یەکەتیی ئەورووپا دەزانی. گوێ مەدێ لەناو ئەو پێگە نیولیبراڵە، دیکتاتۆرێکی گەندەڵ و بێ بەزەیی وڵاتی بەڕێوە بردبوو بۆ بەرژەوەندی و سوودی خۆی و بنەماڵەکەی، ئەوانەی پشتگیریی ئەو بیرۆکەیە دەکەن "بازاڕی ئازاد واتە دیموکراسی" ئەوەیان دەزانی بەڵام خۆیان لێ گێل کردبوو.

لە ڕەتکردنەوەی قایلکردنی کۆماری ئیسلامی ببێتە پێویستییەک بۆ دوژمن، هەروەها لە دەرخستن و گەورەکردنی دووانەیی ئەوەی کە بەبێ هاوکاریی ئەمەریکا و ئابووریی نیولیبرال هیچ دیموکراسییەک لەدایک نابێ، کرانەوەی شۆڕشی یاسەمینی تونس بۆ نێو بەهاری عەرەبی سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ بزووتنەوەی سەوز، کە بەڕاستیش سەرکەوتن بوو بۆ ویستی دیموکراتیی تەواوی ناوچەکە.

## زەقکردنەوەی مەزهەبچییەتی: لەتکردنی شیعە و سونە

با ئێستە بچینە سەر پرسی پڕ لە گرفتی مەزهەبچییەتی، لەتبوونی شیعە و سونە کە هەردەم بووەتە هەوێنی ناکۆکی لەنێو موسڵمانان. زۆرینەی موسڵمانەکان قەناعەتی بە مەزهەبی سونە هەیە: کەمینەیەکی بچووک (لە نێوان سەتا ١٠-١٥) بەڵام کاریگەر شیعەن. شیعە لە ئێران، عێراق، ئازەربایجان، لبنان، بەحرێن و یەمەندا زۆرن، لەگەڵ ئەوەشدا، کۆمەڵگەی شیعی لە هەر وڵاتێکی ئیسلامیدا هەن. ڕەگ و ڕیشەی لەتبوونی مەزهەبی لە نێوان سونە و شیعەدا دەگەڕێتەوە سەردەمی سەرەتای مێژووی ئیسلامی و پەیوەستە بەناکۆکیی سەرەتای موسڵمانان لەسەر پرسی جێگرتنەوەی دەسەڵاتی پێغەمبەر محەمەد (د.خ.). لە تەواوی مێژووی ناوەڕاستدا دوژمنایەتییەکی چالاک هەبوو لە نێوان شیعە و سونەدا. بەڵام لە ماوەی باڵادەستیی داگیرکاریی ئەوروپی بەسەر جیهانی عەرەبیدا، هەروەها دوای دروشمی کۆنی رۆمەکان (دابەش بکە و حوکم بکە)، ئەم جۆرە لەتبوونە مەزهەبییانە، بە گشتی لە نێوان موسڵمانان و هیندۆسەکان و نێوان موسڵمان و مەسیحییەکان، کاریان لەسەر کراوە لە پێناو بەرژەوەندی و سوودی باڵادەستیی داگیرکاران.

خێرا دوای داگیرکردنی ئەمەریکا بە ڕابەرایەتیی ئەمەریکا لە ئاداری ٢٠٠٣، ستراتیجناسە سیاسییەکان و شرۆڤەکارانی سەربازی وەک سەید سەید وەلی رەزا ناسر، کە ویستیان شەڕ بە رێیەکی دەمارگیرانە و تاوانێکی سەرەکیدا ببەن، کتێب و وتاریان بڵاو کردەوە لەسەر شیعایەتی کە بەنزینی بە توندوتیژیی عێراقدا کرد بۆ دابەشبوونی مەزهەبی. سەدای ئەم جۆرە خەملاندنانەی راپەڕینی شیعەی سنووربڕ لە دژی باڵادەستیی سونە، کاریان گەیاندە ئەوەی شا عەبدوڵلای دووەمی ئوردن بێ باسی دروستکردنی "پێگەیەکی شیعی" بکا. لەبەر راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی، بەتایبەتی لەو

ولاتانەی کە دانیشتوانی شیعەیان زۆرە و لەلایەن کەمینەیەکی سونەوە حوکمڕانی دەکرێن، وەک بەحرێن، جارێکی تر پرسی دوژمنایەتیی سونە و شیعە و رکابەرییان سەری هەڵدایەوە.

ئەم ترسەی "پێگەی شیعی"، یان زیندوبوونەوەی رکابەریی مەزهەبی لە جیهانی موسڵمانانەدا، وەک ترسی نوێبوونەوەی ئیسلامیزمی سەربازی، زەنگێکی هەڵەیە، کە هەردەم پێشبینی و قسەی لەبارەوە دەکرێ لە کولتووری سیاسیی موسڵماناندا، کە بێگومان ئیسلام و مەزهەبەکانی دەگرێتەوە بەڵام سنووردارێش نییە تەنێ بەئیسلام. بەڵگەی راستەقینەی مێژووی هەنووکەی ناوچەیی بەشێوەیەکی کارامە ئەگەری دوژمنایەتیی شیعە و سونە سنوور ببڕن، دووپات دەکاتەوە. ماوەی هەشتساڵی درێژ و خوێناویی شەڕی عێراق و ئێران، دوو ولاتی گەورەی شیعی، خەریک بوو ملی یەکتر بپەڕێنن، لە هەردوولاوە شیعە شیعەی دەکوشت. شیعایەتی (ئیسلام بە گشتی بۆ ئەو پرسە) هەرگیز تاکە هۆکار نەبووە لە ناسنامەی سیاسیی گەلان. ئەمڕۆکە لە بەحرێن، کە تا بەو دواییانەش ئێران چاوی لە هەندێ ناوچەی بڕیبوو، خەڵک زیاتر بەلای عەرەبچییەتیدا دەڕوا نەک مەزهەبی شیعە، زیاتر بۆ ئەو دەسووتێ. لەنێو ولاتانی تایبەتی شیعەدا، دڵسۆزییەکان و ناسنامە بەریەک دەکەون لە گەڵێ هێڵی یەکتربڕدا. لە ئێران، ولاتێک زۆرینەی شیعە، بزووتنەوەی گەورەی مافەیلی مەدەنی دەبینین (ئێستە کاریگەریی راپەڕینگەلی شۆڕشگێری لە ناوچەکەیان لەسەرە)، تێیدا شیعەکان دەڕژێنە سەر شەقام و خۆپێشاندان دژی کۆماری ئیسلامی دەکەن، کە حکوومەتەکەی مەزهەبی شیعە بەڕێوەی دەبا. ئەمە ئاماژەکەیە بەو راستییەی کەوا شیعیزم یەکێک لەنێو چەندان هۆکاری تر کەوا قەناعەتی سیاسی و کردەی کۆمەلایەتیی خەڵک دیاری دەکا.

ئەوەی ئێمە لە زۆربەی جیهانی عەرەبی و موسڵماناندا دەیبینین لەبەر رکابەریی سونە-شیعە نییە، بگرە هەر زۆر لێیەوە دوورە، ئەمە راپەڕینێکی

لەمێژینەی کولتوورێکی کۆزمۆپۆلیتانییە، دووپاتکردنەوەی ناسنامەیەکی جیهانییە کەوا بەری مێژووی دوور و تازەیە. ئەم کولتوورە بەگوڕ و فرە لایەنە بەدەرە لە هەر قەناعەتێکی مەزهەبی یان ئایدیۆلۆجی.

زۆر گرینگە بۆ جیهان بەگشتی لەوە تێ بگەن ئێستە لە بەهاری عەرەبیدا روو دەدا، بە زاراوەی راپەڕین تێی بگەن و رووداوەکان کەم نەکەنەوە بۆ ئاستی کلێشەی خەیاڵ و بیرۆکراتی. هەلومەرجی مێژوویی خەڵک لەپێش هەموو شتێکە، نەک دەرهەستی گشتیان کە داگیریان بکا. خەڵک لە مەغریبەوە تا عومان، لە یەمەنەوە تا ئێران سوورن لەسەر گۆڕینی چارەنووسیان لە سیاسەتی بێهیوایی بۆ خەیاڵێکی ئەخلاقی کۆتا-کراوە کە بشێ بۆ ئازادی و شکۆمەندی. لەم پرۆسەیەدا، هەموو لایەنێکی ئاین و کولتوورەکان دێنە پێشەوە تەنێ تا ئەو رادەیەی کەوا بتوانن یارمەتیی گێڕانەوەی هەستی شکۆمەندی و هەوڵەکان بۆ دروستکردنی جیهانە نوێیەکەیان. ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئارەزووی ئیتنی، مەزهەبی و شۆڤێنی کە حوکمی کردووە و خەڵکیان دابەش کردووە بە شەو و رۆژێک نامێنێ. بەڵام ئەو تێکەڵە تواوەی راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی پلەی گەرمی و مەرامی خۆی هەیە، هەروەها رەوتی مێژوو دێتە گۆڕین.

## شەشەم

## سەنتەر ناتوانێ بوەستێ

پانۆرامای گشتیی راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی لە تەواوی جیهانی موسڵمان و عەرەبیدا، کە لە مێژووی ١٨ی دیسێمبەری ٢٠١٠ەوە دەستی پێ کردووە، بە پانۆرامایەکی شێواو و ئاژاوەئامێز دەچێ. لە پایزی ٢٠١١، شۆڕشەکان رێژیمگەلی حوکمڕانی تونس، میسر و لیبیایان لێ خست، هەرچەندە بۆردمانی خوێناویی ناتۆ و بەزاندنی سنووری مرۆڤایەتی سەرکەوتنی لیبیاییەکانی پیس کرد. سووریا، یەمەن و بەحرێن خۆپێشاندانی ئاشتییانە و هێمنیان بەخۆوە بینی لەسەر شەقامەکان کە داوای گۆڕانی دیموکراتییان دەکرد، بەڵام دواتر دڕندانە دەستیان نرا بەڕوویانەوە و هاتنە سەرکوتکردن. خۆپێشاندانی سەرەکی دەستی پێ کردبوو لە مەغریب، جەزائیر و ئوردن، رێژیمەکانیان ناچار کرد بەڵێنی چاکسازیی ریشەیی بدەن. بەشێوەیەکی رێژەییش گردبوونەوەی بچووک بچووک لە عومان، کوێت، لبنان، مۆریتانیا، سعوودیە، سودان و بیابانی رۆئاوای بەرچاو کەوتن.

هەریەک لەو وڵاتانەی ناوچەکە پێگە و گرینگیی تایبەتی خۆیان هەیە، هیچ دوو وڵاتێک وەک یەک نین. بۆ نموونە، سعوودیە کەڵلەڕەقترین و توندترینیانە بۆ گۆڕان لە ڕێی خۆپێشاندانی ئاشتییانە، رێژیمەکە زۆر بێ بەزەییانە توندوتیژە و هەروەها راستیی ئەوەی کە دوو پیرۆزترین پێگەی موسڵمانان، مەککە و مەدینە، لەوێن، ئەمە پیرۆزی و دەسەلاتێکی تر دەدا بەوڵاتەکە. بەڵام تەنانەت سعوودیەش بزووتنەوەیەکی گەورەی بەخۆوە بینیوە: بزووتنەوەی ئافرەتانی چینی مامناوەند، بەپێچەوانەی یاسای نیشتمانیان،

پێیان داگرت لەسەر مافی یەکسانییان بۆ هاژۆتنی ئۆتۆمۆبێل. رەنگە ئەمە لە سۆنگە گشتییەوەکەوە قسەیەکی سادە و بێ مانا بێ، بەڵام دەکرێ ئاکامی جیدی و گەورەی لێ بکەوێتەوە لەودیو داواکاریی ئافرەتان بۆ تامکردن لە ئازادییەکی مەدەنیی سەرەتایی. عێراق نموونەیەکی سەرنج ڕاکێشە، لەویاندا لە تەواوی جیهانی عەرەبیدا جیاوازە، هێشتا لەژێر داگیرکاریی سەربازیی ئەمەریکا و هاوپەیمانانادایە و بۆیە نموونەیەکی مەترسیدارە و ئاکامی کارەساتباری لێ دەکەوێتەوە هەوڵ بدرێ دیموکراسی هەناردەی ئەوێ بکرێ. ئەگەر ئەمەریکا عێراقی داگیر نەکردبا و سەدام حوسێن هەر مابا، لەوانەیە عێراقییەکان یەکەم کەس دەبوون پێوەندییان بەشۆڕشەکانی بەهاری عەرەبییەوە دەکرد. لە باتییان، ئێستە لەژێر داگیرکاریی سەربازیدان و وڵاتەکەیان وێران کراوە.

چی لە پشتی ئەو شۆڕشانەوە بوو؟ کاتێ شۆڕشی میسری دەستی پێ کرد هەردوو پیاوانی ئاینیی حوکمڕان لە ئێران و هاوشانە نیوپارێزکارە ئەمەریکییەکانیان دووپاتیان کردەوە کەوا ئەمە "شۆڕشێکی ئیسلامی"یە. بەڵام بڵاوکردنەوەی کاریگەرییەکی سادە و تژی لە شرۆڤە، بەتایبەتی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران، ئەوا شێکردنەوەی راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی گومڕاکەر بووە و هەرواش دەمێنێتەوە. بزوێنەرەکانی شۆڕشی هەر وڵاتێک تائیبەت بەخودی وڵاتەوە و داواکان لەیەک دەچن. ئەم رووداوانە وەڵامی درێژکراوە نین بۆ شۆڕشی توندوتیژی بە ئیسلامیکراوی (نەک ئیسلامی) ئێران لە ماوەی سی ساڵی رابردوودا، هەروەها هیچ ئاماژکەیەکیش لە ئارادا نییە کەوا ئایدیۆلۆجیای ئیسلامی لە پشتی شۆڕشەکانەوە بێ، (هەرچەندە رێکخراوگەلی ئیسلامی وەک ئیخوان موسلمین لە میسر تەواو غیاب نەبوون لە هەڵسوڕاندنی سیاسیی تەواوی کارەکە). راپەڕینگەلی دیموکراتی داوای چوارچێوەیەکی فراوانتری شرۆڤەی مێژوویی دەکەن، چونکە ئەمڕۆ هەر تەنیا ئیسلامیزمی سەربازی نییە بگرە تەواوی شێوەکانی

ڕەهاگەریی ئایدیۆلۆجی شەرعیەتی خۆیان لەدەست داوە.

هەروەک بینیمان، مەبەستی سەرەکیی ئەم کتێبە ئەوەیە ڕووداوەکان لە جیهانی موسڵمان و عەرەبی، کە بەگشتی پێیان دەگوترێ "بەهاری عەرەبی"، ئاماژکەیە بە کۆتاییی فۆرمەکانی ئایدیۆلۆجیای پۆستکۆلۆنیا، ئەوانەی ئێمە لە ماوەی دووسەت ساڵی بووریدا دەیانزانین. مەبەست لە بەکۆتاهاتنی پۆستکۆلۆنیالیتی واتە نەمانی بەرهەمی ئایدیۆلۆجی بەزاراوەی داگیرکارییی و کۆلۆنیالی، ئەو زاراوانەی لەلایەن بالادەستیی داگیرکاریی ئەورووپا بەسەر ناوچەکەدا سەپێنراون، هەروەها وڵاتانی ستەمکاری داگیرکراو لە پشت بەجێ مان کاتێ ئەورووپییەکان ئاڵاکانیان کۆ کردنەوە و ڕۆیشتن. ناشنالیزمی دژە داگیرکار، سۆشیالیزم و ئیسلامیزم وەک شێوەی ئایدیۆلۆجی کە ڕووبەڕووی داگیرکاریی ئەورووپا بوونەوە و نەتەوە - وڵاتیان دروست کردووە کە لە ناوچە داگیرکراوەکانی پێشوودا دروست بوون. ئەو هێزانە دواجار شەڕەکانی دژە داگیرکاریان بردەوە، بەڵام تەنیا وڵاتی کارەساتئامێزیان بەرهەم هێنا، نموونەی گەورەش بۆ ئەمانە ئەو سیستمە دژوارە ئاینییەیە کە حوکمی کۆماری ئیسلامیی ئێران دەکا، هەروەها ڕێژیمی توندوتیژ و بێ بەزەییی بەعسی سووریا، ئەو ستەمکارەی حوکمڕانی لیبیای کرد، ئەو خێڵەکییە پیاوسالارییەی تەواوی سعوودیە، ئوردن، کوێت و مەغریبی گرتەوە، هەروەها سیستمی ئۆتۆکراتی نیولیبرالی میسر و تونس نموونەی ترن. ئەم وڵاتانە جەنگان لە دژی داگیرکاری، وڵاتی خۆیان لە سەردەمی پۆستکۆلۆنیال مسۆگەر کرد، بەڵام ستەمکار و حوکمڕانی وایان لێ بەرهەم هات کە بەتەواوی و تا سەر ئێسک هاووڵاتییانی خۆیانیان چەوساندەوە و لە گۆڕ نا. بۆیە ڕەوتی ئایدیۆلۆجی لە کاتی بالادەستیی داگیرکاری دروست بوو، بەڵام لە ماوەی دوای داگیرکاری تەقییەوە، زۆر شەکەت کرا.

کۆتاییی شێوازەکانی ئایدیۆلۆجیی پۆستکۆلۆنیا مانای ئەوە نییە

کۆلۆنیالیزم بەکۆتا هاتووە، یان ئیمپریالیزم بەرگەگرتن بەرهەم ناهێنێ. ئەمڕۆ تەماشای وڵاتانی وەک بەحرێن، سعوودیە و یەمەن دەکەین وەک سێگۆشەی سەرەکیی پرۆژەی داگیرکاریی ئەمەریکا لە ناوچەکە، سێگۆشەیەک کەوا ناچارمان دەکا بیر لەودیو ئاکامەکانی بەهاری عەرەبی بکەینەوە و بچینە سەر دەسەڵاتی جیهانی لە دژی ئەفریقیا و ئاسیا. وەک سێ هاوپەیمانی سەرەکیی ئەمەریکا و ئیسرائیل لە ناوچەکە، ئەو ڕێژیمە ستەمکارانە پرسی فەڵەستین بە گەردوونێکی سۆزیار پێشان دەدەن کە لێیەوە دواجار بەهاری عەرەبی لەدایک بوو. ئەمڕۆ ئەمەریکا تاکە بزوێنەری باڵادەستیی داگیرکارییە، لە کاتێکدا ئیسرائیل کە دوا پاشماوەی داگیرکاریی ئەوروپایە لە ناوچەکە. بەڵام ڕاست لەبەرئەوەی ئەمەریکا یاریی تاک-باڵادەستی و باڵادەستیی ئایدیۆلۆجیی لەدەست داوە، هەروەها لەبەرئەوەی ئیسرائیل تەواو وەک پرۆژەیەکی داگیرکارانە بەدیار کەوت، بەرگەگرتنی ئەوان چیی تر پرسێکی وەها ئایدیۆلۆجی نییە. ئەمەریکا ناتوانێ بە تەنیا دژی ئەو هەموو ئایدیۆلۆجییانە بوەستێتەوە کە شەڕی باڵادەستیی ئەو دەکەن. ئیسرائیل شاگرد و هاوکات سەروەستای پرۆژەی داگیرکارییە و پێویستی بەناشنالیزمی عەرەبی نییە، بە ئیسلامیزمی سەربازیش نییە، یان سۆشیالیزمێک بە فیتی سۆڤیەت بێ دژی بوەستێتەوە. بۆیە دوژمنی ئیسرائیل و ئەمەریکا چیی تر بە زاراوەی ئایدیۆلۆجیای پۆستکۆلۆنیال نییە، بگرە بە جیهانی مادی، خەیاڵی و ئەخلاقییە.

ئاکامی ئەم ئایدیۆلۆجییە شەکەتانەی پۆستکۆلۆنیال وەرچەرخانێکی ڕامالینە بۆ مۆدێرنیتەی کۆمەڵایەتی. بۆیە مەیدانی شەڕ بزووتنەوەی مافەیلی مەدەنیی تێدایە نەک ڕکابەریی ئایدیۆلۆجی. خەڵک شەڕ دەکەن لە پێناو ئازادییە مەدەنییەکانیان، لە نێویاندا، دامەزراوەی دیموکراتی دوا خراون کە ئایدیۆلۆجیا و وڵاتانی پۆستکۆلۆنیال فەشەلیان هێنا لە دابینکردنی.

## کێ مامۆستای مێژووە؟

گۆڕانی ریشەیی لە ناوچەکە، لەگەڵ نزمکردنەوەی ئاڵای ئایدیۆلۆجی، هەر تەنێ بۆ عەرەب و موسڵمانان نییە ببینن و ئاهەنگ بگێڕن. جیهانی نوێ بۆ هۆشیاریی خود پێش هات، ئایدیۆلۆجییە زاڵەکانی بەرمنگاری تێڕوانینەکانی خەڵک دەبنەوە. "شتێکی بنەڕەتی گۆڕاوە. لە منداڵییەوە بەو باوەڕە گەورە کراوم کەوا ئێمە، ئەمەریکی و جوولەکەکان، دروستکەری مێژووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستین. ئێمە واقیعمان دروست کرد، ئەوانی تر سەیریان کرد، گەوزین، ئیفلیج بوون، دەترسان." ئەمە قسەی پیتەر بینارتە، کە گەورە نووسەری سیاسی بۆ زە دیەلی بیست دەنووسێ، مامۆستای رۆژنامەوانی و زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی سیتیی نیویۆرک، هەروەها گەورە ئەکادیمی لە دەزگەی نیو ئەمێریکا.

بەردەوام دەبێ:

> لە ١٩٨٩، ئەمەریکییەکان سەرکەوتن کاتێ یەکەتیی سۆڤیەت، رکابەری پێشوومان لەسەر بالادەستیی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەتەواوی لە ناوچەکە پاشەکشێیان کرد. کاتێ سەدام حوسێن ویستی رووبەڕوومان بێتەوە لە ناوەوەی ناوچەکە، ئێمە لە شەڕی کەنداودا خراپمان بەسەر هێنا. لە سالانی نەتەوەکان، ئابووریناس، مامۆستای یاسا و پسپۆڕی بانک و وەبەرهێنانمان نارد تا وانەی جیهانگیری بە عەرەبەکان بڵێینەوە، کە ئەو کاتە مانای کۆپیکردنی ئێمە بوو. بەهەزاران رێگە، هەندێ جار بەنەرمی، هەندێ جاریش دڕندانە، ئێمە ئەو پەیامەمان نارد: ئێمە یاسا دادەنێین، ئێوەش جێبەجێی دەکەن.

"ئەوان" هەرگیز یاساکانیان دانەنا و "ئەوانی تر"یش قەت جێبەجێیان نەکرد. ئەمە خەیاڵێک بوو هی نەخۆشێک بۆ سەرکەوتن و خۆبەزلزان. بەڵام

له خەياڵيش زياتر (كە منداڵێكی فەڵەستینی بە بەردێک دەتوانێ هەر كاتێ بیەوێ بیشكێنێ)، مانای رۆشنگەری بۆ بیرۆكەی كەوا "ئێمەی ئەمەریكی و جوولەكە" بەهێزترین دەسەڵاتین، ئەمە پێشی رووداني بەهاری عەرەبی بوو. ئەم دەستەواژەیە "ئێمەی ئەمەریكی و جوولەكە"، كە یەكسەر دەبێتە "ئێمە" و "خۆمان"، جیهان ئەو كاتە وابوو، واتە: "ئێمە" داگیرمان كرد، دزیمان دەكرد و زاڵ بووین، ئێمە مێژوومان نووسی، هەر یەكێكیش وێرای لە دژی ئێمە بنووسێ و بجووڵێتەوە تێكمان شكاند، ناومان لێ نا دژە سامی، دژە ئەمەریكی، تیرۆریست، بۆیە كپ و بێدەنگمان كردن، ئەگەرنا دەرمان دەكرد و بەهی خۆمان نەدەزانی. ئەو "ئێمە"یە فەشەلی هێنا لە بێدەنگكردنی هیچ كەس، نە مەحموود دەروێش، نە ئێدوارد سەعید، مۆنا هاتۆم یان عالیە سلێمان. چەندان كتێبە چاوەڕێن بێنە نووسین، شیعر بێنە نووسین، شانۆ بێنە نمایشكردن، فیلم، هەروەها هەموو ئەو ئازادییانەی كە پڕ كرابوون بە ترس و تۆقین، كەس نەیدەوێرا لەبەر ئەو نەخۆشانەی سەر "ئێمە" كارێ بكا و بجووڵێتەوە، یان وەک بینارت (كە ئێستە ژیرتر و باشترە) بنووسێ. بە چەند وشەیەک ئەو تۆقینە كورت دەكاتەوە كەوا چەندان نەوەی فەڵەستین، عەرەب و موسڵمان ئەزموونیان كرد، بە سادەیی دەڵێ "نەخێر" بۆ دەسەڵاتی تۆقێنەری خودرۆشنگەر.

بینارت كورتەیەكی زۆر باش دەنووسێ لەبارەی سەركەوتنەكانی جوولەكە و شكستەكانی عەرەبان، بە كڵێشەیەكی زایۆنی كۆتاییی پێ دێنێ، "ئێمە لە هێزەوە چووین بۆ هێز، ئەوان هەرگیز یەک هەلیان لەدەست نەدا". بەڵام پاشان دەگەڕێ بەدوای فیداكردنی خۆی، دەنووسێ و نۆستالجیای پێوە دیارە:

ئەو جیهان بەسەر چوو. ئەمەریكا و ئیسرائیل چیی تر تاكە هێزی دەسەڵاتدار نین لە رۆهەڵاتی ناوەڕاست، دوای ماوەیەكی زۆر، بۆ یەكەم جارە عەرەبەكان هێزی دەسەڵاتدارن. لە گۆڕەپانی

تەحریر، گەنجانی میسر شۆڕشێکیان بەرپا کرد. سەرۆک ئۆباما چۆکی دادا لە بەردەم واقیع و یارمەتیی حوسنی موبارەکی دا و دەرگەی پێ پێشان دا، بێنجامین ناتانیاهو سەری خۆی لە بەرامبەر مێژوودا کەچ کرد، هەر هاواری وەستانی دەکرد، بێهوودە بوو. ئێستە سەرانی میسر بەپێی ویستی گەلەکەیان دەجووڵێنەوە، حەماس و فەتحیان پێک هێناوە تا پێکەوە بەشدار بن لە هەڵبژاردنەکان. حەماس و فەتح یەک دەگرن چونکە ئەوانیش لە گۆڕەپانی تەحریری خۆیان دەترسن... بۆ سەرانی ئەمەریکی و ئیسرائیلی کە راهاتوون بە ئۆتۆکراتی فەڵەستینی و تیرۆریستانی فەڵەستینی، ئەمە شتێکی نوێیە. ناتانیاهو و پاڵپشتە ئەمەریکییەکانی داوا لە ئۆباما دەکەن سەعات ئاوەژوو بکاتەوە، بەڵام ناتوانێ.

زاراوەکان هێشتا هی نەخۆشەکانن، بەڵام شکاون. "ئێمەی ئەمەریکی و جوولەکە" نۆرەی خۆی تەواو کرد، ئێستە نۆرەی "عەرەبەکان"ە. گۆڕان چیی تر بەدەستی ئێوە نییە، چیی تر وانەی ئێوەمان ناوێ، سەردەمی "ئێمە"ی ئێوە "ئەوانی تر"ی ئێمە بەسەر چوو، چی رێ نەماوە لە جیهان بۆ تێپەڕبوونی پرسی "ئەوان" و "ئێمە" سەبارەت بە ژینگە، دیمۆگرافی و هەژاری، کە بەگشتی ڕووبەڕووی مرۆڤایەتی کرانەوە. بەڵام لە کۆتاییی وتارەکەی، بینارت ئەو هەستە خۆبەزلزانییەی زایۆنی ون دەکا، دژی قسەکانی خۆی دەوەستێتەوە کەوا "هەرچەند ئەمەریکا خۆی بە ئیسرائیلەوە گرێ بدا، هێندە لاوازتر دەبێ". کۆتاییەکەی وێ دەچێ ئازادیخواز بێ، بۆ خۆی و بۆ پێوەندی لەگەڵ زایۆنییەکان:

فەڵەستینییەکان کۆنترۆڵی چارەنووسیان دەگرنە دەست لەبەرئەوەی لە دەستی ئیسرائیل دەرچووە. زایۆنیزم، لە باشترین حاڵەتی هەر مەرامی هەیە، کۆششی ئەخلاقی سەلامەت

هێشتنەوەی جوولەکەیە لە خاکی ئیسرائیل، بەڵام ئەم حکوومەت بێ مێشک و نزیکبینە هەرەشە لە سەلامەتی و ئەخلاقی جوولەکان دەکا. کاتی خۆی، ئەو دەمەی عەرەب بێدەسەڵات و ئەمەریکا بەهێز، ئیسرائیل دەیتوانی وەها بژی. بەڵام چیی تر ناتوانێ. ئەگەر باراک ئۆباما نەتوانێ بێنجامین ناتانیاهو قایل بکا بۆ دامەزراندنی وڵاتێکی فەڵەستینی لەسەر بنچینەی هێڵەکانی ١٩٦٧، ئەوا رووداو و راپەڕینەکان روو لە هەردووکیان دەکەن. ئەوانی تر دەستپێشخەری دەکەن، لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئەمەریکا و ئیسرائیل چارەنووسی خۆیان لە دەستی نەتەوەکانی تردا دەبیننەوە. بۆ ئێمەمانان کە باوەڕمان وابوو ئەمەریکانیزم و زایۆنیزم چارەنووسیان بەدەست بوو، تەوسێکی لەوە دڕندانەتر نییە لە دنیا، واز بێنن.

فەڵەستینی و عەرەبەکانی تر کۆنترۆڵی چارەنووسیان ناگرنە دەست تەنێ لەبەرئەوەی ئیسرائیل لە دەستی دەرچووە. ئیسرائیل ئەوەی ویستوویەتی کردوویەتی، هەر ئەوهاش بەردەوام دەبێ. هێزی مێژوو ئیسرائیل و زایۆنیزمی لە قوناغ بەجێ هێشتووە. ژیان و ئەخلاقی جوولەکان هەر تەنیا هەرەشەیان لەسەر نییە بگرە دەمێک پێش ئەوەی بینارت ئەو رستانە بنووسێ بوونەتە قوربانی. هەر لەو دەمەی کە تیۆدۆر هێرزل دەستی لە نەخشەی فەڵەستین دا و گوتی وەهای دەوێ، ئەخلاق و ژیانی جوولەکان بوونە قوربانی، هەر بەردەوامیش قوربانی بوون تا گەیشتە سەردەمی ئەوەی پێی دەگوترێ "بزووتنەوەی تێنت"، کاتێ بەدەیان هەزار ئیسرائیلی رژانە سەر شەقامەکانیان و بە جیهانیان گوت لەوانەیە ئەوانیش بچنە پاڵ بەهاری عەرەبی. دوو مانگ دوای بڵاوبوونەوەی وشەکانی بینارت، ئیسرائیل خۆیشی یاخی بوو لە دژی ناتانیاهو. کارەکە لەبەر تەنگژەی نیشتەجێ دەستی پێ کرد، بەڵام بەلای گەلێ ئیسرائیلی، بە گیدۆن لیڤیشەوە، کە کۆشەنووسێکی

ناوداری رۆژنامەی هاریتزە، هەروەها بەلای گەلێکی تریشەوە:

ئەو شەوە بوو کە بێنجامین ناتانیاهو لە نووسینگەی سەرۆک وەزیران دەرکرا دەرەوە و شەرمەزار کرا.... شەوی رابردوو خۆپیشاندانەکان گەیشتنە لووتکە. دروشمگەل لەبارەی کرێی زۆر دەگمەنەوە بوون. "گەل داوای دادوەریی کۆمەلایەتی دەکا" باوترین دروشم بوو، پاش ئەویش ئەمە بوو "هوو ها، میزە با؟ مەدینەت هاریڤە ها (واتە: کەسی پاشتر کێیە دێ؟ ئەوە ولاتێکی خۆشگوزەرانە). ئەی دەلێی ئەورۆکە سۆشیالیزم هاتووەتەوە؟ بەلێ، بە گەرووی گیراو و هەستی سۆزیارانەوە. شەوی بووری، خۆپیشاندانەکان فرین. تەنگژەی نیشتەجێبوونیان لەبەر کرد، هەر ئەو نەبوو. ئەوانەی دەترسان کە خۆپیشاندانەکان زۆر تەسکن، تێکدەرن، دوێنێ بینیان فراوان بوو. ئامانجەکانی ئەو خۆپێشاندانە زۆر لەودیو کرێی بالەخانە و خانووە.

ئەمە هێشتا زۆر دوورە بگاتە ئەو رادەیەی ئیسرائیلییەکان دیوارە دروستکراوەکان بڕووخێنن، ئەقلی و جەستەیی، ئەو دیوارانەی لە چواردەوری خۆیان دروستیان کردووە و دوورن لە هیوا و ئارەزووەکانی بەهاری عەرەبی. بەلام هیچ بزووتنەوەیەکی کۆمەلایەتی بەتەواوی کۆنترۆلی بەسەر پرس و ئاکامەکانیدا نەکردووە. تەنانەت زایۆنیزمیش، دوایەمین پێگەی داگیرکاریی ئەوروپا، پرسیاری لە خۆی دەکرد. ئیسرائیلییەکان لە مەسادەی خۆیان دەهاتنە خوار.

## رۆهەلات رۆئاوایە، رۆئاواش رۆهەلات

کۆتاییی ئایدیۆلۆجییەکانی پۆستکۆلۆنیال واتە گەرانەوە بۆ سەرەتای مێژوو، نەک هەر تەنیا لە ناوچە ژێردەستەکانی پێشوودا. کاتێ چەندان جیهان پێکەوە بە رێی خۆیاندا دەچن، سەنتەر ناتوانێ بوەستێ. هەروەکو

باسم کرد، ئەگەر تەمەنی پێکهاتەی ئایدیۆلۆجیی پۆستکۆلۆنیال کۆتایی هاتبێ لە ناوچە ژێردەستەکانی پێشوودا، ئەوا داگیرکارانی پێشوو، بێ جیاوازی، گیرۆدەی دەستی سیاسەتی پۆستمۆدێرن بوونە چونکە پرسی سەرەکیی ئەو پێکهاتە ئایدیۆلۆجییانە (ناوە نهێنییەکەی رۆئاوایە) چیی تر پرس نییە و باوی نەماوە. رەچاوی ئەمە بکە: ئەگەر لە جیهانی موسڵمان و عەرەباندا دیموکراسی نکووڵیی لێ بکرێ، ئەوا لە ئەورووپا و ئەمەریکای باکور ئێسکی لەبەردا دەرهێنراوە (ئەمە جیاوازیی ئارندتە لە نێوان شۆڕشی فەرەنسی و ئەمەریکی کە چیی تر باو نییە لە سەردەمی پۆستمۆدێرنی سیاسی کە سیفەتی سەرمایەدارییە)، ئەم دوو هۆیە خەڵکی مەیدانی ئازادیی تاران و گۆڕەپانی تەحریری قاهیرە دێنێتە تەک یەک و یەکیان دەخا لەگەڵ ئەوانەی لە پورتا دو سۆلی مەدرید و گۆڕەپانی سینتاگما لە ئەسینا، هەروەها لەگەڵ ئەوانەی لەودیو زەریای ئەتلەسین کە بەشدارن لە بزووتنەوەی ئۆکیوپای وۆڵ ستریت لە ئەمەریکا و تەواوی جیهاندا. میسر، ئیسپانیا و ئەمەریکا لەوانەیە زۆر لە یەکتر جیاواز بن، بەڵام ئەوەی یەکیان دەخا مێژوویەکە لە ویستی دیموکراسی کە داپۆشرابوو بە ستەمکاری و رووتکردنەوەی دیموکراسی بۆ مەرامی خۆیان.

لە گۆڕەپانی تەحریر و پورتا دێل سول ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ سەرەتاکانی دیموکراسی، ئەو دەمەی بیرۆکەکە هێشتا ناوێکی بۆ خۆی نەدیتبووەوە. ئەگەر بیرۆکەی دیموکراسی لە ئەسینا بووبێ لەدایک، ئێستە ئەو شارە خۆی پێوەندیی بەگۆڕەپانی تەحریر کردووە، گرێبەستی لەگەڵ مێژوو نوێ کردەوە. هەروەک ستاسیس گۆرگۆریس، مامۆستای ئەدەبی کلاسیک و بەراورد و بەڕێوەبەری پەیمانگەی کۆمەڵگە و ئەدەبی بەراوردکار لە زانکۆی کۆڵەمبیا لە نیویۆرک، بەم شێوەیە لێی دەدوێ، "گومانی تێدا نییە کە رووداوگەلی تەحریر رۆڵێکی کاریگەریان گێرا لە دروستبوونی سینتاگما. بۆیە، لەبەر هەندێ، ئەوەی لە ئەسینا لە دیسێمبەری ٢٠٠٨دا رووی دا

یارمەتیی بزواندنی گەنجانی دا لە گەڵێ بەشی جیاوازی جیهانی عەرەبی."
سۆفییە موسڵمانەکان قسەیەکیان هەیە دەڵێ کاتێ سۆفیگەری بوونی هەبوو سەرەتا هیچ ناوێکی نەبوو، هەرکە ناوی بۆ پەیدا بوو، سۆفیگەری نەما. هەمان شتیش راستە بۆ دیموکراسی. لەو وەهمەی پێی گوتراوە "رۆئاوا" واقیع پێی دەگوترێ "دیموکراسی" دەمێکە ناوێکی دۆزیوەتەوە، لە واقیعدا پێی دەگوترێ میسر، بەڵام ئازادیی میسالی یاخییان هێشتا ناوێکی بۆ خۆی نەدۆزیوەتەوە. لە ئیسپانیا ناویان هەیە بەڵام توانایان نییە بیدۆزنەوە، لە میسر ناویان نییە بەڵام بەگوڕ و تینەوە وا بەدوای ناوێکدا دەگەڕێن، هاوکات پیادەی دەکەن. تەحریر سینتاگمای گێڕایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا قاهیرە ئەسینای گەڕاندەوە سەرەتا مێژوویەکی نوێ.

رەچاوی کەیسی ململانەی مەزهەبیی ئیسلامیی نێوان شیعە و سونە بکە. ئەم مەزهەبچییەتییە یارمەتیی ئەوە دەدا ئیسلامیزم بە هەرە گرینگترین پێکهاتەی ئایدیۆلۆجی پێشان دا لە وڵاتانی موسڵمان و عەرەبیدا. ئەم رەوتەی ئیسلامیزم کار دەکا لە بەرامبەر شەرعیەتدان بەوڵاتی جوولەکان، چونکە ئەمە تاکە رێیە کەوا ئیسرائیل مانایەکی هەیە، نەک هەر تەنیا بە زاراوەی بوون و دراوسێیەتی نا بگرە زیاتر بە زاراوەی خودی خۆی: وڵاتی جوولەکان لە دژی ئیسلامیزمی سەربازی. بێگومان وڵاتێکی جوولەکان هەبوو لە ناوچەکە نزیکەی سێ دەیە پێش ئەوەی کۆمارێکی ئیسلامیی هەبێ. مەزهەبچییەتیی تێکەڵ (جوولەکە، مەسیحی، ئیسلامی، هیندو) ئیسلامیزم بەهێز دەکا و بەهەڵە ئیمتیازی پێ دەدا وەک ساتێکی پێناسەکراوی کولتووری سیاسی لە ناوچەکە. بەڵام تۆماری کارەساتباری ئیسلامیزم لە ماوەی سی ساڵی رابردوو لەلایەن کۆماری ئیسلامیی ئێران وەک نووشدارییەکە بۆ جیهانی عەرەبی نەک بۆ رەتکردنەوەی ئیسلامیزم بگرە بۆ ئیسلامیزم بخەنە ناو سیاقێکی فراوانتری کولتووری سیاسی. ئەم بەسیاقکردنە ئیسلامیزم وەک بەشێک لە کولتوورێکی سیاسیی فراوانتر

پێشـان دەدا، کە ناشنالیزم و سۆشیالیزمیش دەگرێتەوە. ئەم پرۆسەیە دەوەستێتە سەر شەکەتیی ئیسلامیزم وەک ئایدیۆلۆجیایەک، شتەکان پاک دەکاتەوە، خاڵی سفر بۆ مێژوو دادەنێ.

لەت لەتبوونی سیستماتیکی ئیسلامیزم لەنێو کۆزمۆپۆلیتانیزمی فراوانتری سیاسی کە بەدرێژاییی مێژوو لە خۆی گرتووە بۆیە رێ پاک دەکاتەوە بۆ خاڵی سفری مێژووی پۆست - ئایدیۆلۆجی. بەڵام، لێرەدا رەشکەرەوەکە هەیە، هەروەها "رۆژئاوا" زۆر پشتی بەستاوە بە "ئەوانی تر" بەشێوەیەک کاتێ "ئەوانی تر" خۆی لە گرێبەستی نوێی مێژوو کردەوە، "رۆژئاوا" نازانێ چی لە خۆی بکا. بۆیە شکۆمەندیی سینتاگما و تەحریر پێکەوە دێن ناو لە "دیموکراسی" دەنێنەوە لەسەر بنچینەی رەوتی ئەسینا-قاهیرە. لەسەر ئەو بنچینەیە، بیرۆکەی "رۆژئاوا" لەسەر رووی زەوی دێتە سڕینەوە.

## نیگەرانی و ترسی هەڵە

با ئێستە زۆر قووڵتر رەچاوی شەکەتیی ئیسلامیزم بکەین. لە دەسپێکی راپەرینی شۆڕشگێڕی میسری لە کۆتاییی جانیوەری ۲۰۱۱، بووە جۆرێک لە کلێشە بە بەراوردکردنی بە شۆڕشی ئێرانیی ۱۹۷۹. خۆپێشاندانی جەماوەری لە میسر لە دژی دیکتاتۆرێکی پشت ئەستوور بەئەمەریکا وای لە گەلێ چاودێر کرد زۆر شتیان بیر بێتەوە، ئەوانەی سی ساڵ پێشتر دیمەنی هاوشێوەی تەحریریان بینی لە ئێران. ئەمە وای لێ کردن باوەڕ بکەن تەحریر "شۆڕشێکی ئیسلامی" ترە و بەرێوەیە. ئەمە خوێندنەوەیەکی هەڵەی شۆڕشی ئێرانیی ۱۹۷۷-۹۹ بوون بەڵام، خوێندنەوەکە بۆ شۆڕشی میسری ۲۰۱۱ هەڵەتر بوو.

رێی بەراوردکردنی هەردوو شۆڕش عادەتەن لەسەر بنچینەی پاڵنەرێکی ئایدیۆلۆجی بووە. لایەنگران و زوڕناژەنانی ئیسرائیلی لە ئەمەریکا و

هاوشـانه زایۆنیـیـەکانیـاندا له ئیـسـرائیل ئەوەیان هـەڵبژارد بێن شـۆڕشی ئێرانی و میسری بەراورد بکەن چونکه دەترسن له خۆپێشاندانێکی گەورەی جەماوەری له وڵاتێکی سـەرەکیی عـەرەبان که رەنگه دژی داگیـرکاریی ئەو وڵاته بوەستنەوه که پێی دەگوترێ "ئیـسرائیل". سەرۆک وەزیرانی ئیـسرائیل چ کاتی به فیرۆ نەدا له لێدانی ئەم زەنگه: "ئەوەی له ئێران رووی دا لەوانەیه له مـیـسـریش روو بدا ... بێنجـامـین ناتانیـاهو گـوتـی... دوای کـۆبوونەوەی لەگەڵ راوێژکاریی ئەڵمـانیـا ئەنجێلا مێرکل،" هارێتز ئەمەی بڵاو کـردەوه له ٣١ی جانیوەری ٢٠١١. وێ دەچێ سـەرۆک وەزیرانی ئیـسرائیل ئامـاژەیەکی له ئەکادیم و نووسـەری ئێرانی عەباس مـیلانی، که کار بۆ پەیمانگەی سینک - تانکی هـوڤـەر له کـالیـفـۆرنیـا دەکـا، وەرگـرتبێ، کـه رۆژێک پێش نوشداریـیـەکەی ناتانیـاهو هەمـان قسـەی بڵاو کـردبووەوه له نامـیلکەیەکی پاڵپشـتی ئیـسـرائیلی بەناوی "کـۆمـاره نوێیـەکه" له نیـویۆرک بڵاو کرایەوه. مـیلانیش لەوه ترسـا لەوانەیه ئیـخـوان مـوسلمین دەست بەسـەر شـۆڕشی مـیسـریدا بگرێ و کۆمـارێکی ئیـسـلامی دروست بکـا. بێگومـان هەردووک سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل و بیره هاوشێوه و هاوپەیمانه ئێرانییەکەی هەر به عادەت ئەو راستییه پشتگوێ دەخەن کەوا پێش شەست ساڵ "ئیخوانێکی جوولەکان" کۆمارێکی جوولەکەی دامەزراند له هەمان ناوچه. خێرا دوای ئەو لێدوانه هـاوبەشـەی ناتانیـاهو و مـیلانی، عەلی خامـەنایی، رابەری کۆمـاری ئیـسـلامی، چەقـەنەی بۆ رووداوگەلی مـیسـر لێ دا وەک رەنگدانەوەیەک بۆ مـیراتی ئایەتوڵلا خـومـەینی و خێرا ناوی له رووداوەکان نـا "واگاهاتنەوەی ئیسـلامی". هێندەی نەبرد، ئیخوان موسـلمینی میسری بەتوندی هـاته گۆ و گوتی: ئەمه شۆڕشێکی ئیسـلامی نییه، ئـەمه شـۆڕشێکی میـسرییـه و هـی میسرییەکانـه، موسـڵمان، مـەسیـحی و هەمـوو ئەوانی تر به ئایدیۆلۆجیـای جیاجیاوه.

له نێوان پڕوپاگەندەی زایۆنی و بیرکردنەوەی بەحەزی ئیسلامی و چەندان

بیر و بۆچوونی تر کە پێوەریان دانا بۆ سەرکەوتنی شۆڕشی میسری، بە هەر ڕێیەک بێ، هەموو گوتیان ئەمانە کاریگەریی نموونەی شۆڕشی ئیسلامییە لە ئێران. ئەم بۆچوونێکی هەڵەیە و هەر زۆریش هەڵەیە چونکە ئەوەی لە ئێران ڕووی دا "شۆڕشێکی ئیسلامی"ی نەبوو بگرە بەزۆر و زەبروزەنگ شۆڕش بە "ئیسلامی" کرا. ڕێیەکی دڕندانە بوو بۆ چەوساندنەوە دەرهاوێشتە و قۆستنەوەی هەندێ دیمەن بوو وەک: تەنگژەی بارمتەی ئەمەریکی ١٩٧٩-٨١، شەڕی ئێران - عێراقی ١٩٨٠-٨٨ و کاروباریی سەلمان روشدیی ١٩٨٩-٩٩. پاکتاوکردنی دڕندانەی زانکۆ، شۆڕشگەلی کولتووری، لەداردانی ژمارەیەکی ئێجگار زۆری ئۆپۆزیسیۆن و بەزۆر دوورخستنەوەی زیندووەکان، هەموو ئەمانە ئەنجام دران لەژێر باڵ و سوودی تەنگژەی ناوەخۆ و ناوچەیی لە ماوەی سی ساڵدا بۆ گۆڕینی شۆڕشێکی کۆزمۆپۆلیتانی و فرە لایەن بۆ سیستمێکی ئاینیی دڕندانە و قێزەوەن. کودەتای ١٩٥٣ بە سەرکردایەتیی سی ئای ئەی، پڕ چەککردنی سەدام حوسێن بۆ بەرپاکردنی جەنگ لە دژی ئێران و، دروستکردنی تاڵیبان وەک دڕکێک لە دژی داگیرکاریی سۆڤیەت لە ئەفغانستان (ئەندازیاری هەموو ئەمانە ئەمەریکا بوو) و دزینی بەردەوامی خاکی فەڵەستینی لەلایەن ئیسرائیل قەزایەکی ناوچەیی دۆزییەوە بەهۆیەوە بۆ یەکەم جار کۆماری ئیسلامی هەموو جێگرەوە سیاسی و ئایدیۆلۆجییەکانی تێک شکاند و بەشێوەیەکی سیستماتیک تەنگژەکانی ناوچەکەی بۆ مەرامگەلی خۆی بەکار هێنا و دەسەڵاتی خۆی پێ بەهێزتر کرد. ئەوەی لە ئێران لە نێوان ١٩٧٧ و ١٩٧٩ ڕووی دا "شۆڕێکی ئیسلامی" نەبوو و ناتوانێ ببێتە پێشڕەو و نموونە بۆ میسر لە ٢٠١١. لەم سۆنگەیەوە، زۆر گرینگە ئەوەمان لە بیر بێ کە بەدرێژاییی مێژوو میسر کاریگەری هەبووە لەسەر ئێران، نەک بە پێچەوانەوە.

هیچ شرۆڤەیەکی هەڵە یان نیگەرانییەکی دروستکراو سەبارەت بە

کاریگەریی "ئیسلامیزم"، راست یان دروستکراو، رێی پێ دەدرێ ڕاپەڕینی مەزن و تژی لە خۆشیی تونسییەکان و میسرییەکان بشێوێنی و شکۆمەندیی ئەوان بکا بە شکۆمەندیی خۆی لە نیشتمانێکی ئازاد و دیموکراتدا. هەروەها هیچ هۆیەک نییە بۆ باوەڕکردن بەوەی هەردوو گەل رێ بە رفاندنی خەون و ئارەزووەکانیان بدەن لەلایەن رەهاگەلێکی سەرسەخت و دەمارگیرێکی دوورەدەست. هیچ گومانی تێدا نییە کەوا ئیخوان موسلمین لە میسر، هەروەها پارتە سیاسییە موسڵمانییەکان لە وڵاتانی تر، دەستیان هەبوو لە راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی. بەڵام نابێ ئەو رێکخراوگەل و تۆڕگەلانە چەواشە بکرێن، هەرچەندە بێگومان نابێ متمانە بە هیچیان بکرێ بۆ رابەرایەتیکردنی شۆڕش.

نابێ لەژێر هیچ هەلومەرجێکدا تێگەیشتنمان سنووردار بکەین بۆ کولتوورگەلی سیاسیی دەوڵەمەندی ناوچەکە، بیانهێنینە ریز ئیسلامیزمی سیاسیی ئەم و ئەو، چونکە ئەم سیاسەتە تایبەتە شۆڕشگێڕییە هەرگیز تاکە سەرچاوەی بیرۆکە و کارەکان نەبووە لە ناوچەکە. ناشنالیزمی دژە داگیرکار، هەروەک بینیمان، ئاکامی گەورەی هەبوو لەودیو هەر سنوورێکی دروستکراوی نیشتمانی لە سەردەمی داگیرکاری. هەمان شت راستە بۆ بزووتنەوەگەلی سۆشیالیستی شۆڕشگێڕی. بەرەی گەل بۆ رزگاریخوازیی فەڵەستین (PFLP)، بۆ نموونە، کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر بزووتنەوە مارکسییەکان لە ناوچەکەدا. ئەم خێروبێرە سنووربڕەی سیاسەتی بێهیوایی و خەباتە یاخیبووە ئاشکرایە لە هاریکارییە ناوچەییەکان کەوا دنەی دا بە راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی، کە لکەکانی دەگاتە ئەودیو هەر ناشنالیزمێکی رەگەزی و دروستکراوی سەردەمی داگیرکاری. ئەو ئایدیۆلۆجییانە هاتنە بەرهەم و بڵاوکردنەوە لەژێر هەلومەرجی تایبەتی مێژوویی، ئەمە ئاشکرایە لە یادگە و بەڵگەکانی مێژوو. ئەوەی پێویستە ئێستە دۆخێکە بۆ بینین و ناساندنی سیاسەتی

شۆڕشگێڕی نوێ.

لە تارانەوە بۆ تونس، لەوێوە بۆ قاهیرە و ئەولاتریش، کولتووری ناوەخۆی کۆزمۆپۆلیتانی دەگەڕێنرینەوە، جیهانی نوێ دێنە دیتنەوە، لەودیو و لە سەرووی هەر کاریگەرییەکی نەرێنی و نیگەرانییەکی هەڵە. میسرییەکان داهاتوویەکی جەماوەرییان بردەوە. هەرچەندە ئەمە ئاکامی ئێرانییەکان نەبوو لە ٢٠٠٩، سەرکەوتنگەلی تونسی و میسرییەکان لە ٢٠١١ ئاکامی دەبێ بۆ ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی، بە هەمان شێوە بۆ بزووتنەوەکانی تری نیشتمانی و دیموکراتی لە ناوچەکەدا. دەبێ چاومان بکەینەوە: ئەمان هەمان خەڵکن، ویستی دیموکراتییان توانای هەیە هەمان یاری بکەن لەگەڵ سیستمی ئاینیی تاوانکار لە ئێران و هاوکات خۆی دەردەبڕێ لە تونس و میسرا!.

## کۆماری ئیسلامی لە بەحرێن

ئێستە با ئەفسانەیەکی تر تاوتوێ بکەین: ئەوەی کە کۆماری ئیسلامی هاوکاریی راپەڕینی دیموکراتی دەدا لە بەحرێن چونکە زۆرینەی دانیشتوان شیعەیە و ئەمەش واتە هاوپەیمانێکی سروشتی پیاوانی ئاینی حوکمڕانە لە ئێرانی دراوسێ.

خێرا دوای دەسپێکردنی راپەڕینی دیموکراتی بەحرێن، هاوکار و هاوکات لەگەڵ میسر و تونسییەکان، زۆربەی شتەکان لکێنرا بە کۆماری ئیسلامی. هەردووک رێژیم لە بەحرێن و هێزی داگیرکەری سعوودی، پێشەنگی ئەنجوومەنی هاریکاریی کەنداون (GCC) کە دەجوڵێنەوە بۆ هێشتنەوە نوخبە لە دەسەڵات، کۆماری ئیسلامییان تۆمەتبار کرد بەوەی هانی یاخیبوون دەدا لە شانشینە بچووکە بەڵام ستراتیجە گرینگەکە. "خێزانی شاهانەی سونی لە سعوودیە،" رۆژنامەی تەلەگراف رای گەیاند، "لە کاریگەریی گەشەسەندووی شیعەی ئێران لە رۆهەڵاتی ناوەڕاست دەترسێ

و، یارمەتیی سوونەکان دەدا لە بەحرێن لە دەسەڵات بمێننەوە." حوکمڕانە ئاینییەکانی کۆماری ئیسلامی نکووڵی لە هەر دەستوەردانێک دەکەنەوە. هەمان ڕاپۆرتی تەلەگراف دەڵێ "وەزیری بەرگریی بەریتانیا" ئێستە دانی بەوەدا ناوە کەوا ئەندامانی گاردی نیشتمانیی سعوودیە ڕەوانەی بەحرێن کراون، لەوانەیە مەشقیان پێ کرابێ لەلایەن هێزەیلی چەکداری بەریتانی لە سعوودیە." کەواتە بۆمان بەدیار دەکەوێ کەوا هێزەیلی چەکداری بەریتانی ئەو هێزە سەربازییەی ڕاهێناوە کەوا بە توندی ڕاپەڕینی دیموکراتیی سەرکوت کرد لە بەحرێن، لە کاتێکدا بەریتانیا کۆماری ئیسلامیی تۆمەتبار دەکرد بە دەستوەردان. لێرەدا، ئەم دووڕوویییە سەرسڕهێنەرە بەریتانیا، لەگەڵ ئەوەشدا، مانای ئەوە نییە کە کۆماری ئیسلامی پاڵەوانی ئازادییە.

لە هەمان کاتدا، چالاکوانانی دیموکراسیی بەحرێنی زۆر دڕندانە سەرکوت دەکران. "دوای ئەوەی بە توندی داپۆشینی هەواڵی سەرکوتکردنی گرووپەیلی ئۆپۆزیسیۆن لەلایەن ڕۆژنامەوانانی بیانی کپ کرد،" ڕۆی گوتمانی مایامی هیرالد لە دوبەی لە ٢٥ی ئایاری ٢٠١١دا گوتی، "دەسەڵاتدارانی بەحرێنی دەستیان کردووە بە هێرش بۆ سەر ڕۆژنامەوانانی لۆکاڵ کە کار بۆ ئاژانسەیلی نێودەوڵەتیی هەواڵ دەکەن، دەیانگرن، لێیان دەدەن و ئاشکرایە، بەلایەنی کەم لە یەک نموونەدا، بە کارەبا ئەشکەنجەیان دەدەن." چاوبڕکردن بە نێو دووڕوویی و دوودەرکی کەوا هەوری ڕەشیان هێناوە بەسەر وێنە ڕاستییەکەدا، ئاشکرایە کەوا کاریگەریی کۆماری ئیسلامی لە بەحرێن ئەوە نییە کە ڕژێمەیلی حوکمڕان لە بەحرێن و سعوودیە و، لایەنگرانیان لە لبنان و واشنتۆن دی سی، وامان لێ بکەن باوەڕ بکەین: ئەو حوکمڕانە ئاینییانەی لە ئێران هاوکاریی ڕاپەڕینی دیموکراتی دەکەن لە ئێران. ئەم جۆرە هاوکارییە بەڕاستی زۆر سەیر دەبێ. باشە بۆچی کۆماری ئیسلامی یارمەتیی ڕاپەڕینی دیموکراتی دەکا لە بەحرێن، لە کاتێکدا دڕندانە هی خۆی سەرکوت دەکا؟ تەنێ لەبەرئەوەی

خۆپێشاندەران لە بەحرێن شیعەن؟ ئەم جۆرە قسانە لە گەپ زیاتر هیچی تر نین، ئەوەی کۆماری ئیسلامی و بەحرێن بە هاوبەشی هەیانە هەر تەنێ ئەوە نییە زۆرینەیان شیعەن بگرە ئەوەیە هەردووکیان دیکتاتۆری زۆر دڕندەن.

بەهاری عەرەبی گەڕانەوەی کۆماری ئیسلامیی چەوسێنراوە، دۆزینەوەی ساتێکی گەردوونیی سی ساڵ لەمەوبەرە، تێیدا پیاوانی ئاینی سەربازی شۆڕشێکیان دزی و کردیان بە سیستەمێکی دڕندانەی ئاینی، بەزۆر و بەزەبروزەنگ وایان کرد. لەم سۆنگەیەوە، پاشان، کۆماری ئیسلامی بەڕاستی کاریگەرییەکی راستەوخۆی لەسەر بەحرێن هەبوو. بەڵام هیچ رۆڵی نەبوو لەو رووداوانەی کە لە دوای راپەڕینی دیموکراتی جەماوەریدا روویان دا لەو دوورگە بچووکە، کە ماڵی کەشتیگەلی پێنجەمی ئەمەریکایە، تێیدا ئەو پاڵپشتە مەزنەی دیموکراسی، واتە ئەمەریکا، چاوی کوێر کرد لە راست ئەو رێژیمە بکوژەی بەحرێن، لە کاتێکدا سەربازی راهێنراوی سعوودی، کە بەریتانیا مەشقی داون، تەداخولیان کرد و راپەڕینەکەیان سەرکوت کرد. تاکە کاریگەریی کۆماری ئیسلامی هەیبووە لەسەر بەحرێنە ئەوەیە رێژیمی حوکمڕان فێری ئەوە بکا، هەر بۆ نموونە، چۆن یاخیبوونێکی دیموکراتییانە سەرکوت بکا، هەمان رۆڵی هەبوو بۆ سەرکوتکردنە دڕندانەتر و خوێناویترەکەی بەشار ئەسەد لە سووریا. نە ئاین، نە ئایدیۆلۆجیا نە هیچ شتێکی تر لێرەدا مانای نییە و کار ناکا، جگە لە هێزێکی دڕندانە لە پێناو مانەوەی خود. هەمان شت راستە بۆ سعوودیە و وڵاتانی تری کەنداوی فارس، هەروەها بۆ ئیسرائیل، بۆ ئەمەریکا و هاوپەیمانە ئەوروپییەکانیشیان. پەنجەوانە ئایدیۆلۆجییەکان ئێستە لە دەست کرانەوە.

لە نووسینێکی پڕ ئاشکراکردن لە رۆژنامەی ئیندیپێندێت Independent، پاتریک کۆکبێرن باسی ئەو دڕندایەتییانە دەکا رێژیمی حوکمڕان لە بەحرێن دەیانکا لە دژی هاوولاتییانی شیعەی خۆی. ئەو بەرپرسیارێتییە دەخاتە ئەستۆی کۆماری ئیسلامی، بەو راستییەی کە خۆی لە ویستی

دیموکراتییانەی بەهاری عەرەبی دەدزێتەوە. کۆکبێرن دەڵێ:

چەوساندنەوەکە سەرتاسەرییە. هەندێ جار پیاوانی تەناهیی دەمامکدار کە شەوانە هێرش دەکەنە سەر گوندەکانی شیعەنشین، هاوکات مزگەوتی شیعە و شوێنە ئاینییەکان بۆ کۆبوونەوە تێک دەدەن. تا ئێستە بەلایەنی کەم ٢٧ مزگەوت و شوێنی ئاینی تێک دراون، لە کاتێکدا دروشمی دژە شیعە و پاڵپشتیی حکوومەت بەردەوام بە سپرە دێتە نووسین لەسەر ئەو دیوارانەی بەپێوە ماون.

بەوردی باسی سەرکوتکردنی توند و ئەو ڕێگە پرۆفیشنالانە دەکا حکوومەت بەکاری دێنێ بۆ پاکتاوکردنی شیعە:

ئەو پەرستار و دوکتۆرانەی لە سیستەمی تەندروستیدا کار دەکەن، لەلایەن شیعەوە بەڕێوە دەبرێن، لێیان دەدرێ و دێنە گیران لەبەرئەوەی چارەسەری خۆپێشاندەران دەکەن. مامۆستا و قوتابی هاتوونەتە دەسبەسەرکردن. نزیکەی هەزار کەسی پرۆفیشناڵ دەرکراون و مووچەی خانەنشینیان لێ بڕاوە. ڕۆژنامەیەکی ئۆپۆزیسیۆن داخراوە. ئەو قوتابییە بەحرێنییانەی بەشدار بوونە لە خۆپێشاندان لە دەرەوە مووچەی مانگانە و پارەیان لێ بڕاوە.

ئەمانە و دڕندایەتییەکانی تر کە لەلایەن ڕژێم لە بەحرێن ئەنجام دراون تەواو لە نامیلکەی کۆماری ئیسلامیدا هەڵێنجراون. ئەرێ میسر حوسێن مووسەوی و مەهدی کەڕوبی، دوو دامەزرێنەری سەرەکیی کۆماری ئیسلامی و ئێستە سەرۆکی بزووتنەوەی سەوزن، دەسبەسەر بوون و لە ماڵەوە هاتنە گرتن، شیعە نین؟ ئەرێ نەدا ئاغا سوڵتان، سوهراب عەرەبی، ئەمیر جافەدیفار، لەگەڵ ژمارەیەکی ئێجگار زۆری تری خۆپێشاندەری بێ تاوان

خوێنیان سارد کرایەوە و هاتنە کوشتن لەلایەن هێزەیلی تەناهیی کۆماری ئیسلامی، شیعە نەبوون؟ ڕێکخراوەیلی سەرەکیی مافەیلی مرۆ بەدرێژی باسی ئەشکەنجەی سیستماتیکی خۆپێشاندەرانی شیعەیان کردووە لە کۆماری ئیسلامی. مەهدی کەڕوبی بە وردی باسی ئەتککردن و بەزۆرگایینی ئافرەت و پیاوە گەنجەکانی کرد لە کاتی دەسبەسەریدا. بۆچی کۆماری ئیسلامی، بتوانێ وەها مامەڵە لەگەڵ هاووڵاتییانی شیعەی خۆی بکا، خەمی شیعەکانی بەحرێنیەتی؟ ڕێژیمی حوکمڕان لە کۆماری ئیسلامیدا نموونەیەکە بۆ حوکمڕانانی بەحرێن و ڕێژیمە چەوسێنەرەکانی تر لە چۆنێکی سەرکوتکردنی ڕاپەڕینگەلی دیموکراتی بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە، لەلای ئەوانەدا نییە کە خەڵکی دەچەوسێننەوە.

ڕاپەڕینی دیموکراتی لە بەحرێن هاوکات و یەکگرەوە بوو لەگەڵ بەهاری عەرەبی، هەروەها بەهارەکەش ئارەزوو و داواکانی ئاڵوگۆڕ کرد لەگەڵ بزووتنەوەی سەوز لە ئێران. نە لەتبوونی شیعە-سونە لە بەحرێن و نە لەتبوونی موسڵمان-مەسیحی لە میسر دەتوانێ ڕووداوگەلی دیموکراتی ڕاگرێ لە جیهانی عەرەبی و ئەولاتریش. لە هەمان باری خراپی ئابووری، کارەساتی کۆمەڵایەتی، چەقبەستووی سیاسی و بەلاوەنانی کولتووری لەدایکبوونە، ئەم ڕاپەڕینە کۆمەڵایەتییانە لەنێو دوو کێشوەردا پەرەیان دا و هیچ پێوەندییان بە لەتبوونی ئاینی و غەیری ئاینییەوە نەبوو. بەری هیچ جموجۆڵێکی ئایدیۆلۆجی نەبوون. لە باتیان لە دژی ئایدیۆلۆجییەکان هاتنە جووڵە، ئایدیۆلۆجیای کۆن و نوێ.

زۆر گرینگە بیرمان بێتەوە چۆن هۆکاری شیعی هاتە نێو جیۆپۆلەتیکی هەنووکەی ناوچەکە. خێرا دوای داگیرکاریی عێراق بە ڕابەرایەتیی ئەمەریکا، ستراتیجیستە سەربازییەکانی ئەمەریکا وەک سەید وەلی ڕەزا ناسر دەستیان کرد بە جەختکردنە سەر پارتی سەرەکیی بەرپرس بۆ ئەو خوێنڕشتنە و بیرۆکەی ململانەی شیعە-سونەیان وەک کێشەیەکی سەرەکی

باس کرد. هەروەها هەر لەو کاتەدا بوو کەوا شا عەبدوڵڵای دووەمی ئوردن باسی "پێگەی شیعە"ی کرد وەک هەڕەشەیەک بۆ سەر سەقامگیریی ناوچەکە. بیرۆکەی مەزهەبچییەتی تاکتیکێکی سەربازیی ئەمەریکی بوو هیچی تر بۆ سیاسەتی ناوچەکە. ئەمە مانای ئەوە نییە کەوا داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئەمەریکا نەبووە گڕدانی ململانەی شیعە-سونە، بە هەمان شێوە کە داگیرکردنی لبنان لەلایەن ئیسرائیل لە ١٩٨٢ بنچینە بوو بۆ دروستبوونی حزبوڵڵا. بەڵام ئەم ئەندازیارییە سەربازییەی مەزهەبچییەتی یەکسان نییە بە باڵادەستیی ئایدیۆلۆجی ئیسلامی، بەدرێژاییی مێژوو دروست بووە بۆ ڕکابەریی باڵادەستی و داگیرکاریی ئەمەریکا و ئەورووپا.

با واز لەوە بێنین ئاخۆ هۆکاری شیعیی تاکتیکی ستراتیجی سەربازیی ئەمەریکا بوو یان نا بۆ بەلاڕێبردنی ئەو ئازارەی سەرووەریی نیشتمانی عێراقی هەیبوو یان حوکمڕانانی کۆنی عەرەبان بیریان لێ دەکردەوە سەبارەت بەگەلی خۆیان، ڕاستییەکە ئەوەیە شیعە و سونە، موسڵمان و مەسیحی، ئاینی و غەیرە ئاینی، ئاسیاوی و ئەفریقی، تەنانەت ئەورووپییەکانیش، ئێستە ڕاپەڕیون لە دژی خراپیی بارودۆخیان. خەڵک ئێستە لە ئیسپانیا هاوار دەکەن و دەڵێن گۆڕەپانی تەحریر هی ئەوانیشە. ئەرێ ئەوانەش شیعەن؟ ململانەی شیعە-سونە بابەتێک بوو بۆ بیربردنەوەی بابەت و خاڵە سەرەکییەکە، مانۆڤەرێکی ستراتیجی بوو بۆ بەلاڕێبردنی سەرنجی سەرەکی لەسەر پرسەیلی ڕاستەقینە، کە دیموگرافین، ئابوورین، پرسەیلی مافەیلی ئافرەتانن، ئازادییە مەدەنییەکانن. ئەمانە ئەو شتانەن کە مێژووەکانی پێ دروست دەکرێ، جیهانەکانی پێ دێنە گۆڕین.

باسکرنی لەتبووی شیعە-سونە دووبارە هەر ئامانجێکەیەک نییە بە دروستکردنی مەزهەبچییەتی کە ڕاپەڕینگەلی دیموکراتی ناشیرین دەکەن، بگرە ناوەندێکی ڕەگەزپەرستییە بۆ شێواندنی دۆخەکە، بزووتنەوەگەلی شۆڕشگێڕی لە ڕاستیدا لەو شتانە گەورەترن و دەچنە ئەودیو ئەو بارگرژی

و دوژمنایەتییەی داگیرکاران دروستیان کردووە. ڕاستییەک دەمێنێتەوە ئەویش ئەوەیە بەهاری عـــەرەبی ناتوانێ چاوی کـــوێر بکا لە ڕاست دڕندایەتییەکانی کۆماری ئیسلامی بەس لەبەرئەوەی ئەمەریکا دوژمنیەتی. زۆر گرینگە دڕندایەتی و تاوانەکانی کۆماری ئیسلامی بهێنرێتە بەر دیدی بەهاری عەرەبی و خەڵک لە بیریان بێ. بەهاری عەرەبی پەرە نادا هەتا ناوچە سەوزەکانی ئێرانیشی تێدا نەبێ.

## ڤیتکردنەوەی جیهانێکی ژێردەستە

لە دیراسەی کلاسیکیدا "داگیرکردنی میسر"، تیمۆسی میشێل شتێک بۆ ئەو وڵاتە دەکا کە فۆکەڵت خۆی ئەوەی دەستەبەر نەکرد: بیرۆکەکانی درێژ دەکاتەوە بۆ نێو سیاقێکی غەیرە ئەورووپی. میشێل باسی ئەو دۆخە دەکا تێیدا میسر (وەک بیرۆکە و ناوچە) لەلایەن داگیرکاران کاری ئەندازیاریی بۆ کرا و پێشان درا، لە شارەکانییەوە تا قوتابخانە و تا سیستەمی سەربازی، خەڵکیان لە جەستە و ڕوح کرد، لێکیان کردنەوە، هەروەها شوێنی نێوان گشتی و تایبەتیان داگیر کرد، بوونیان هەبوو لە نێوان ئۆریەنتی نیشتمانی خۆیان و مۆدێرنیتەی ئەورووپی، کەلێنێکی گەورە بوو. خاڵی سەرەکیی دیراسەکەی میشێل ئەو بیرۆکەیە کەوا میسر لە پێشانگەیەکدا پێشان دراوە، نەک وەک واقیعێکی سەپێنراو، بگرە وەک پێشانگەیەک کە خۆی خۆی نمایش دەکا. سەدایەکی دیراسەکەی دیبۆرد بەناوی "کۆمەڵگەی بینەر، ١٩٦٧" هەیە لە خوێندنەوە فۆکەڵتییەی میشێل لەبارەی میسرەوە وەک پێشانگەیەک:

> ئەگەر جیهان لە دەرەوەی پێشانگەکە لەم سۆنگەوە بنەڕەتێکی سادە نەبێ، خۆی واقیع نەبێ، بگرە زنجیرەیەک نوێنەرایەتی بێ، ئەوا جیاوازیی نێوان پێشانگەکە و شتی ڕاستی، پاش هەموو شتێ، شتێکی ڕەها نەبوو. جیاوازیی روونی نێوان نوێنەرایەتی

و شته ئەسڵییەکە، دەرکەوت لە پێشانگەکە، لە راستیدا تەنیا لەو نوێنەرایەتییە پێک دێ کە دروست کرابوو بۆ ئەو کارە. دەبوایە بژین هەرچەندە واقیعی ژیانیان لەنێو پێشانگەیەکدا بوو، بەڵام دەرچوون لە پێشانگەکە نەیبردنەوە سەر خودی واقیع، بگرە بردنی بۆ پێشانگەی تر.

ئەمە هەر تەنیا میسر نەبوو، ئەورووپاش بوو. ئەورووپا خۆی، "رۆئاوا"، شان بەشانی پێشانگەکەی میسر، پێشانگە بوو: وەک پیازێک وابوو، چین لەسەر چینی نوێنەرایەتیکردن، تا دەگەیتە ناوکەکە، لەوێش هیچی تێدا نەبوو. ئەورووپا میسری ژێردەستەی پێشان دا بەو شێوەیەی خۆی بەمۆدێرن کرد، نەک بۆ لاساییکردنەوەی راستییەکان بگرە بۆ زیادەڕۆییی چوارچێوەکانی مانا و وایان لێ بکا مانادار بێنە بەرچاو، لە کاتێکدا وا نەبوون لە واقیعدا لەبەر حوکمی داگیرکاری. ئەورووپا میسری بەوێنەی خۆی دروست کرد: رابردووی لەسەر ئێستەی میسر رەنگی دایەوە، لە هەمان کاتدا نیگەرانییەکانی ناوخۆی خۆی شاردەوە. ئەورووپا بووە دەسەڵاتێکی بەپرەنسیپ فەرمانی کرد بە واقیعی میسر. بەمۆدێرنی کرد و بچووکی کردەوە. بۆیە ئۆریەنتاڵ دروست کرا بەپێچەوانەی مۆدێرن.

حەفتەم

## کۆتاییی پۆستکۆلۆنیالیزم

ئێستە کاتی ئەوە هاتووە بە وردی باسی مەبەستی سەرەکیم بکەم لە کاتی سەرهەڵدانی بەهاری عەرەبی، ئەو بەهارەی ئێمە دەیبینین بۆ خلاسکردنی پۆستکۆلۆنیالیتی وەک مەرج و رەوتێکی ئایدیۆلۆجی. ئەم حوکمەم پشت دەبەستێ بەو تاوتوێیەی بەوردی لە ماوەی سی ساڵی رابردوودا کردوومە، لە چەندان حاڵەت و سیاقی جۆرەوجۆردا. هەروا کتوپڕ بۆم نەهات ئەو دەمەی حوسنی موبارەکم بینی بارگەی تێک نا و کشۆکی سەرۆکایەتی لە ١١ی شوباتی ٢٠١١دا بەجێ هێشت کەوا سەردەمی پۆستکۆلۆنیالیتی تەواو بوو. ئێستە بەهەندێ وردەکاریی تیۆری باسی ئەوە دەکەم مەبەست چییە لەم بابەتە و چۆن گەیشتم ئەو حوکمە تایبەتە.

### مێژووی مشتومڕێک

لەگەڵ دەسپێکی بزووتنەوەی سەوز لە ئێران لە جونی ٢٠٠٩، چوومە سەر شاشە بۆ ناساندنی رەوتەکە وەک بزووتنەوەیەکی مافەیلی مەدەنیی ئەودیو ئایدیۆلۆجیاکان. ئەم بۆچوونە، کە گەلێک پشتگیرییان کرد و گەلێکیش دژی بوون، کاردانەوەیەک نەبوو لەو ساتە بۆم هاتبێ بۆ تەنگژەی دوای هەڵبژاردنەکان لە ئێران. بگرە رەگ و ڕیشەی ئەو قسەیەم دەگەڕێتەوە بۆ مێژوو و سەردەمی پێش داگیرکاری و سەرهەڵدانی بیرکردنەوەی ئایدیۆلۆجییانە لە بەرەی ئێرانی و مۆدێرنیتەی داگیرکاری بەگشتی، بەتایبەتیش لەوەتەی دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی لە دوای شۆڕشی ئێرانیی ١٩٧٧- ٩٩.

تەنێ ساڵێک بەر لە سەرهەڵدانی بزووتنەوەی سەوز، هەروەها ئەو دەمەی زەنگی چەوتی لێکۆڵینەوەکەی سامویل هەتینگتن بەناوی "ململانەی شارستانییەتەکان" لێ درا لە دوای رووداوگەلی ٩/١١، کتێبێکم لە ٢٠٠٨دا نووسی بەناوی "سیستمی ئاینی لیبرالی ئیسلامی: بەرگەگرتنی ئیمپراتۆر". ئەمە پاڵپشتێک بوو بۆ لێکۆڵینەوەکەم بەناوی "ئایدیۆلۆجیای ئیسلامی" کە جێی خۆی گرتبوو. کتێبەکە باسی وردەکاریی سەرهەڵدانی ئیسلامیزم دەکا لە ململانەی ئایدیۆلۆجی لەگەڵ داگیرکاریی ئەوروپا لە تەواوی جیهانی موسڵمانانـدا، لەگەڵ چەند ئاماژەیەکی بەراوردکاریی سادە بۆ دۆخی سیستمی ئاینی لیبراڵی مەسیحی لە ئەمەریکای لاتین. مشتومڕەکەم سادەیە. بەدرێژایی مێژوو، ئیسلام پێشکەوتبوو لە گفتوگۆ لەگەڵ پێناوێک: فەلسەفەی یۆنانی، سیستمی ئاینی جوولەکە، مەزهەبچییەتیی مەسیحی، کولتووری ئیمپریالی فارس کە هێزێکی سەرەکی بوو لەنێو هێزەیلی سیاسی و رۆشنبیری کە لەگەڵیدا ئیسلام کاری لەسەر ئایدیۆلۆجیای خۆی کرد. لە ماوەی زیاتر لە دووسەت ساڵی بووریدا، من دەڵێم، داگیرکاریی ئەوروپی پاڵنەری سەرەکی بووە بۆ بیرمەندانی موسڵمانان و بۆیە بەشێوەیەکی سیستماتیکی ئاینەکەیان بردە ناو پێگەی ململانەی ئایدیۆلۆجی لەگەڵ مۆدێرنیتەی داگیرکار کە ناوە نهێنییەکەی "رۆژئاوا"یە. بە پێچەوانەی هەموو رووخسارەکان، لە کاتێکی هەستیاری وەک ٩/١١دا، ئیسلام چیی تر لە دژی رۆژئاوا نەوەستایەوە، پێوەندیی مەترسیداری نێوان "ئیسلام و رۆژئاوا" زەمەنی خۆی تێ پەڕاند، لە راستیشدا، موسڵمانەکان چوونە ناو قۆناخێکی نوێی مێژووی خۆیان. لە دوای رووخانی یەکەتیی سۆڤیەت، یەکگرتوویی ئەوروپا و سەرهەڵدانی جیاوازیی ئابووری، ستراتیجی و سەربازی لە نێوان ئەمەریکا و ئەوروپا، "رۆژئاوا" ئەو کاتە لە نێوەخۆیدا تەقیبووەوە. بۆیە "ئیسلام" وەک بەهێزبوویەک کە هەردەم پێشەنگ بووە لە چەمکی "ئەوانی تر" ئێستە بێ خاوەن مابووەوە: لە قۆناخی

نوێی بەربڵاوبوونیدا زیاتر بەلای سیستمی ئاینی لیبراڵدا دەچوو نەوەک هەر بەیەک سیستمی ئاینیی باڵادەستدا بمێنێتەوە.

لەم قۆناخە نوێیەدا، کاتێ نەک هەر تەنێ ئیسلامیزمی سیاسی بگرە تەواوی پێکهاتە ئایدیۆلۆجییە پۆستکۆلۆنیالەکان گەیشتنە ئەوپەڕی شەکەتبوون، ئەوەی ئێمە دەیبینین گەشە دەکا "مۆدێرنیتەیەکی کۆمەڵایەتی"یە نەک "مۆدێرنیتەی سیاسی" وەک ئارەزووی میسالی ئایدیۆلۆجییە رکابەرەکان. ئەمە پرۆژەیەکی تەواو نوێیە کە هاتووەتە پێش دوای رووخانی بیرکردنەوەی ئایدیۆلۆجییانە کە هەردەم وەک پرۆژەیەکی داگیرکاری کاری کردووە تا سەردەمی پۆستکۆلۆنیالیزم.

ئێستە روومان دەکەینە ئەو شتەی کە من ناوم لێ ناوە "دوای ئایدیۆلۆجیا": کۆتایی دۆخی پۆستکۆلۆنیالی بەرهەمی مەعریفی.

## دوای ئایدیۆلۆجیا مانای چییە

پاڵپشتی تیۆری بۆ پێگەی ئەکادیمیم زیاتر سەرچاوەی گرتووە و پڕ زانیاری بووە بەمەشقی من وەک کۆمەڵناسێک کە رەگی داکوتاوە لە مەعریفەی سۆشیۆلۆجی، ئەمەش دۆخێکی ماناگەرییە کە (دوای کارە پێشەنگەکەی مارکس شیلەر) دێ و کارەکەی کارل مانهایم بەناوی "ئایدیۆلۆجیا و یوتۆپیا، ١٩٢٩" پشتگیریی لێ دەکا. ماوەی نێوان بڵاوکردنەوەی "ئایدیۆلۆجیای ئەڵمانی"(١٨٤٥)ی کارل مارکس و فریدریک ئینگڵز و دەقەکەی مانهایم زۆر مانای هەیە لە مێژووی مەعریفەی سۆشیۆلۆجی: هەلومەرجی کۆمەڵایەتی بۆ بەرهەمی مەعریفی دەکەوێتە جەرگەی تێگەیشتنمان لە سروشتی پێکهاتە ئایدیۆلۆجییەکان، ئەمەش کارێکە کە لە بنەڕەتدا نەوەی کۆمەڵناسانی منی پێ گەیاندووە لە کاتی دەرچوونی "ئۆریەنتالیزم، ١٩٧٨"ی ئێدوارد سەعید، دەمێک پێش ئەوەی دیراسەگەل لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەربچن، ئەمە بوارێکی باشی دا بەپێشکەوتنی

دیراسەگەلی پۆستکۆلۆنیال، هەر بە لێشاو هاتنە پێش.

پاول ریکۆر زنجیرەیەک وانەی لەسەر مانهایم لە ١٩٧٥ لە زانکۆی شیکاگۆ گوتەوە. دوای مانهایم، ئەگەرەکانی ریکۆر ئەوەیە "بەریەککەوتنی ئەو دوو رووە دژ بەیەکە یان ئەو دوو شتەی (ئایدیۆلۆجیا و یوتۆپیا) تەواوکەری ئەرکی یەکترن شتێکی لێ دەردەچێ پێی دەگوترێ خەیاڵی کۆمەڵایەتی و کولتوری." ریکۆر هەوڵ دەدا هەردوو بیرۆکەکە تێکەڵ بەیەکتر بکا و لە هەمان کاتیشدا دژی یەکتریان بکاتەوە. ئەو دەڵێ "ئایدیۆلۆجیا... دەسپێشخەری پرۆسەیەکی چەواشەکار و نارێکە بەهۆیەوە تاک یان کۆمەڵ حاڵەتی خۆی باس دەکا بەڵام بێ ئەوەی بزانێ حاڵەتەکەی تەواو لەبارەی چییەوەیە. لە کاتێکدا، یوتۆپیا... شۆڕەتێکی نامەتیقیی هەیە. یوتۆپیا وا دەردەکەوێ جۆرە خەونێکی کۆمەڵایەتی بێ ئەوەی خەمی هەنگاوە راستییەکانی بێ کە پێویستن بۆ جووڵە بە ئاراستەی کۆمەڵگەیەکی نوێ." لەو دوو دیدە جیاواز و هاوکات تێکەڵەوە، ریکۆر دەگاتە ئەم قەناعەتە: "لە یەک خاڵدا یەک دەگرنەوە ئەویش سیفەتی گشتیان لە رووی راستی و جیاوازییەوە، هەم راستن و هەمیش جیاوازن." هەروەها دەڵێ ئایدیۆلۆجیا شتێکە ئێمە وەسفی ئەوانی تری پێ دەکەین دەیخەینە پاڵیان، لە کاتێکدا یوتۆپیا شتێکە تەنێ بۆ خۆمانمان دەوێ. سەرچاوەگەلی ریکۆر بۆ "خەیاڵی کولتووری" وەک بەڵگەیەک خزمەتی کرد بەنەوەی ئەکادیمیی خەیاڵی من کە باسی رادێن بە دۆخی پۆستکۆلۆنیال تا بەو خەیاڵە بیر لە پێگەی داگیرکاری بکەنەوە، کە لە بنەڕەتدا جیاوازە لە ئایدیۆلۆجیای باڵادەست کە لە ناوەڕاست و چەقدا خەیاڵی مەرجدار کردووە، واتە ئەوسەری گەردوونی داگیرکاریی بە زیندوویی هێشتووەتەوە. قسەکانی ریکۆر هەمووی لەسەر بنچینەی تێبینییەکەی مانهایمە کە دەڵێ ئایدیۆلۆجیا جێگیرە و یوتۆپیاش رەوتێکی ناجێگیری بەرهەمی مەعریفییە.

بیرۆکەی ئایدیۆلۆجیا شتێکی تێدا رەنگ دەداتەوە کە لە ململانەی

سیاسییەوە هەڵێنجراوە، واتە ئەو گرووپەی حوکم دەکا دەتوانێ ببێتە دیلی بەرژەوەندییەکانی کاتێ دێ بیر لە دۆخێکی تایبەت دەکەنەوە بۆ شاردنەوەی راستییەکان و زیاتر چەقاندن و پاڵپشتیکردنی باڵادەستیان. ئەوەی لە وشەی "ئایدیۆلۆجیا"دا روونە ئەو واگابوونەیە کە لە هەندێ دۆخدا گرینگە بۆ ویژدان و بیری ئەو گرووپانەی لە ناخی دۆخی کۆمەڵگە تێ دەگەن، هەم خۆیان هەمیش کۆمەڵگە جێگیر دەکەن،... بیرۆکەی بیرکردنەوەی یوتۆپیایی، بەشبەحاڵی خۆی، رەنگدانەوەی بیرێکی پێچەوانەی خەباتی سیاسییە، واتە ئەو گرووپانەی کە دێنە چەوساندنەوە رۆشنبیران زۆر حەزیان لە تێکدان و گواستنەوەی قۆناخی کۆمەڵگەیەکە کە بێ ئەوەی بزانێ هیچ توخمێکی نەرێنیی دۆخەکەی خۆی نابینێ.

بەڵام لە باسی داگیرکاری و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، ئایدیۆلۆجیا بێگومان کاریگەرییەکی تەواو جیاوازی هەیە. ئایدیۆلۆجییەکان دەرمانی یاخیبوون بوون، بۆیە پێگەیان تەواو ناجێگیر و یوتۆپیایی بوو. لە مارکسەوە تا مانهایم، بیرۆکەی "ئایدیۆلۆجیای باڵادەست" کاریگەری زۆری جێگیربوونی سیستمی کۆمەڵایەتیی لەسەر بوو و لەگەڵ یەکرێزیی ئەو چینانەی سوودیان لێ دەبینی. بەڵام ئەمە هەرگیز وا نەبووە لەنێو چوارچێوەی داگیرکاریدا، تێیدا ئایدیۆلۆجیاکان خەونی یوتۆپیایی بوون بۆ گۆڕان، گۆڕانێک کەوا خوازراو بوو، لە راستیشدا زۆر پێویست بوو، بۆ ئەوەی تەواو پێچەوانەی داگیرکاریی ئەورووپی بوەستێتەوە. لەوپەڕی باڵادەستیی ئایدیۆلۆجییەکانی ئەورووپا، ئایدیۆلۆجییەکان بە هیچ شێوەیەک هێزێکی جێگیرکەر نەبوونە، راستییەکەی بەپێچەوانەوە بوو، ئەمانە یەکەم شت بوون خەڵک گومانی لێ دەکردن. بۆ نموونە، ئارەزووی رژێمی پەهلەوی بۆ دروستکردنی ئایدیۆلۆجیایەکی شاهانە نیشانەی سەرەکیی ئایدیۆلۆجیایی شۆڕشگێڕی بوو کە رکابەریی یەکتریان کرد بۆ لێخستنی.

ئەو ئایدیۆلۆجییانە یوتۆپیایی بوون لەبارەی مۆدێرنیتەی داگیرکاریی

ئەورووپییەوە، بۆیە ئایدیۆلۆجیای یوتۆپیایی، ئەو هاودژییە بوو کەوا پشتگیریی بەرهەمی ئایدیۆلۆجیی شۆڕشگێڕی دەکا و لە یەک کاتدا هەم تەمەنی سیاسی هەم هی کار و ماناشی زۆر کەمە. مەبەستی سەرەکیی من هەردەم ئەوە بووە کەوا ئەو ئایدیۆلۆجییانە، بەوانەشەوە کە خۆیان بە "عەلمانی" و دژە "ئیسلامی" دەردەخەن، لە راستیدا نەرێنین، دەرهاوێشتەی کاری ترن، تەنانەت ئاکامەیلی چاوەڕواننەکراوانی داگیرکارین، ئەمانە پەلکێش کراون بۆ نێو ئایدیۆلۆجیای پۆستکۆلۆنیال و پێکهاتەی وڵات، بۆیە هاودژانە کۆلۆنیالن. ئەگەر "رۆئاوا" لە "ئایدیۆلۆجیای ئیسلامی" بکەیەوە، دەڕووخێ، ناتوانێ لەسەر پێی خۆی بوەستێ. هەموو ئەو جۆرە ئایدیۆلۆجییانە، نەک هەر تەنێ ئیسلامیزمی سەربازی، بگرە ناشنالیزمی دژە کۆلۆنیال، سۆشیالیزمی جیهانی سێیەم، داهێنان و بەری گفتوگۆ و رکابەریی لەگەڵ و دژی مۆدێرنیتەی داگیرکار، هەوێنی داگیرکارین، کە کۆد و ناوەکەی "رۆئاوا" بووە و دەبێ. لە سەردەمی سەرمایەی جیهانگیریدا، "رۆئاوا" لە ناخەوە رووخاوە، بۆیە رەوتی دیالۆگی کە خۆی پێوە هەڵواسیبوو رووخا و بەسەرچوو. سەنتەری ئەو جوگرافیا خەیاڵییە و دووانەی بەرهەمی مەعریفی و ئایدیۆلۆجی لە هیچ شوێنێکی تر ناوەستێ، بەڵام لە باتیی گێرەشێوێنی کە چووبووە نێو ئەو فرە جیهانەی کە پێشتر هەبوو بوونی هەبوو، شتێک بوو لەودیو ویستی کەسانی تر کەوا "رۆئاوا" تەنێ بۆ مەرامی خۆی و لەژێر دووانە و دوژمنایەتیی "رۆئاوا و ئەوانی تر" بەکاری هێنان.

لەسەر رەوتی داگیرکاریی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، بۆیە لە رووی ئایدیۆلۆجییەوە زاڵ بوونە، ناهاوسەنگیی ئایدیۆلۆجی/یوتۆپیا هەردەم رەوان و گۆڕاو بوونە. ئایدیۆلۆجیی جێگیر نییە و هەموو رەوتە یوتۆپیاکان لە زمان و پێگەدا ئایدیۆلۆجی بوون، ئەمە رەوتێکی ناجێگیر بوو کە خۆی خۆی رەت دەکاتەوە. بۆیە پێگەی داگیرکاریی ئەودیو ئایدیۆلۆجیا واتە رووخانی رەوتی خودی داگیرکاری، هەروەها کۆتاییی دیکتاتۆری گەورە و

ڕۆشنبیریی گشتگیره، یوتۆپیا و ئایدیۆلۆجیای گۆڕاون، ئەمانە هەمووی لە ناوەخۆی پێکهاتە و ڕەوتەکەدا نوشتسیان هێنا. ئەمە ڕووخانی دووانەی ئایدیۆلۆجی/یوتۆپیا (دیکتاتۆر/ڕۆشنبیر) کە دواجار هاوولاتیبوونی کۆماری لێ لەدایک دەبێ.

وەک هەوێنێک بۆ بەرهەمی مەعریفەی جووڵەی سیاسی، ئایدیۆلۆجیا هەردەم شوێنپێی شتێکی تر بووە، هەردەم زاراوەیەکی گشتگیرە، ئاماژکەیەکە بۆ نەبوونی ئەوەی دەخوازرێ ئێستە هەبێ. کەموکوڕیی مێژووی بنەڕەتی هەردەم هیوا و هەلومەرجی بوونی ئایدیۆلۆجیای کورت هێناوە. ئایدیۆلۆجیا مەرجێکی کاتییە، ڕەخنەیەکە لە دۆخی کۆمەڵایەتی کە لێی بووە لەدایک. وەک ڕەوتێکی سیاسی، ئایدیۆلۆجی لەنێو خودی خۆیدا هەردەم پێویستیی سستبوونی خۆی هەڵگرتووە، هەردەم هاودژییەکانی ناوەخۆی بەدیار دەکەوێ و مانایەکی جیاوازی دەبێ لەوەی کە هەیە. ئەو میتافیزیکییەی کە ئایدیۆلۆجیا دەری دەخا بوونێکی نەرێنیی خودە، دەرخستنێکە وەختێک ئاسایی بوو و ئێستە مەحاڵە لەبەر ڕەوتی نوێی تر. ئایدیۆلۆجی هەردەم درۆیەکی خوازراو بوو و ویستوویەتی بەسەر ڕاستییە دڕندایەتییەکاندا زاڵ بێ.

لە کۆتاییدا، ئیسلامیزم خۆی دا بەدەستەوە، لەبەرئەوەی کۆماری ئیسلامی بوو بەهەوێنی مردنی ئایدیۆلۆجیاکەی خۆی، لەگەڵ کۆتاهاتنی کاریگەریی ئایدیۆلۆجییەکانی کە هەیبوو بەسەر ئەوانی تردا. لەنێو خودی کۆماری ئیسلامیدا پێکهاتەیەکی ئێسکیمان بینی کە کاتی خۆی تەندروست بوو، ئەو کاتی هەوێنی بزاوتنی ئایدیۆلۆجیی سیاسی بوو. ئەوڕۆ لە گۆڕەپانی تەحریر لە قاهیرە تا مەیدانی ئازادی لە تاران، ئێمە لەدایکبوونی یەکەم کەسی دوای سەردەمی داگیرکاری دەبینین، ئەو تاکەی کە هەموو هەلومەرجێکی داگیرکاریی بەجێ هێشتووە، هەروەها ئاهەنگ دەگێڕێ بۆ شەکەتبوونی سەردەمی دوای داگیرکاری، کە تێیدا هەموو ئایدیۆلۆجییە

ڕەهایەکانی جیهانی ژێردەستە مانیفێستۆی باڵا و کۆدی سەرەکی بوون. ئەو هێزە دڕندانەی کە ئەو وڵاتانەی دوای سەردەمی داگیرکاری، لە ئێرانەوە تا بەحرێن، یەمەن، سعوودیە، سووریا و تا لیبیا، هەیانبوو بۆ پێشاندانی مانەوەی خۆیان و چەسپاندنی خۆیان، ئێستە ئەو درۆیەی ئەوان دەیانکرد لەبارەی شەرعیەتی ئایدیۆلۆجییەوە ئاشکرا دەکا. هەموو ئایدیۆلۆجیاکان، ئیسلامی و غەیرە ئیسلامی، گەیشتوونەتە کۆتایی تەمەنیان لەژێر هەلومەرجی جیهانگیریی سەرمایەدار کە تێیدا کەس سەنتەر و سەرۆک نییە، هیچ جەمسەرێکی تێدا نییە، هیچ کۆدێکی سەرەکی نییە، هیچ دینگەیەکی وەها سەنتەر نییە کە سەرمایەدار دەیپەرست، ئێستە بەشێوەیەکی سیستماتیکی فەشەل دێنێ لە کۆنترۆڵکردنی.

## خاڵی توانەوەی ئایدیۆلۆجی

ئەم توانەوە ئایدیۆلۆجییە و بەرپرسیارەتیی بەهێزی واقیع خاڵێکە گەڕانەوەی بۆ نییە، گەیشتووەتە خاڵێک هیچ حکوومەتێک ناتوانێ حکوومەتاتی ڕابگەیەنێ و ئیتر ناوچەکە بووەتە کۆمەڵێک وڵاتی کارسۆنی هەوڵ دەدەن حوکمڕانی کۆمەڵگەکان بکەن کەوا نەخشەی خۆیان دادەڕێژن. کۆتاییی "ئایدیۆلۆجیایەکی ئیسلامی" ئامارکەیە بەکۆتاییی ئایدیۆلۆجیا وەک پرۆژەیەکی داگیرکاری لە جیهانی پۆستکۆلۆنیال کە تێیدا مەرجی ئیمپراتۆری بەرپرسیارەتەکانی خۆی بۆ بوون بە ئیمپراتۆر و بەسەرێک پێویست دەکا و بەسەرێکیش هەڵی دەوەشێنێتەوە. لەژێر ڕۆشناییی ئەم بارودۆخە جیهانییانە، پاشان، وڵاتانی پۆستکۆلۆنیال کاریگەرانە بوونەتە گاڵتەجاڕی دەستی ئایدیۆلۆجیای خۆیان، رووخساری شەڕانگێزی خۆیان پێوەست بە ئیمپریالیزم (ئێران، سووریا و لیبیا) ساختە دەکەن، لە کاتێکدا پێگەی وڵاتی خۆیان قایمتر دەکەن، کەچی هەمووی بەتاڵە.

ئاوێتەبوونی ئاشکرای ئێران، سووریا و لیبیا لەگەڵ جۆرە سیندرۆمێکی

تورێتی، ئەقڵ لەدەستچوو بەبیرۆکە و چەمکی "دوژمن"ی شمیتی وەک بەردی بناخەی دۆخی خۆیان، روونترین ئاماژکەیە بۆ پەرپووتبوونی (ئیفلاس) ئایدیۆلۆجیاکانیان. هاوینی ٢٠٠٩ لە ئێران و بەهاری عەرەبیی ٢٠١١ رۆ دەچنە نێو مێژووی بێ شەرەفی وڵاتانی پۆستکۆلۆنیال وەک وەرزێک کاتێ تیۆریستەکانی وەک ماکس وێبەر، تالکوت پارسنس، یورگن هابرماس و ریچارد رۆرتی بانگ کرانە دادگەیەکی کەنغەرئاسا لە تاران و بە ناچاری کراس و بێجامەی زیندانیان لەبەر کرد و دانیشتن لە شوێنی بەرگریکاران شان بەشانی نوخبەی بزووتنەوەی چاکسازی کە تۆمەتی پیلانی کودەتای ئاوریشمیان خرا پاڵ بۆ لێخستنی کۆماری ئیسلامی. لە قسەی بەراییی سەردۆزگەری گشتی لە دانیشتنی یەکەمی دادگەییە گشتییەکەی سەرانی باڵی چاکسازییان، کە لە تەنگژەکانی سەردەمی دوای هەڵبژاردنی ٢٠٠٩ گیرا بوون، تۆمەتبار کرد بەخوێندنەوە و داوەتکردن و بڵاوکردنەوەی بیرۆکەکانی یورگن هابرماس لە رێگەی رێخۆشکردنی رۆشنبیرانە بۆ بەشداربوون لە شۆرشی ئاوریشمی لە دژی کۆماری ئیسلامی. بە رووبەکی قایم و بەبێ ئەوەی تۆزقاڵێ ئاگەداریی ئەو تۆمەتە گەورانە، دادگەی کەنغەرئاسای ئیسلامیی هابرماسی لە غیابدا دادگەیی کرد و سزایان دا. مەبەستی بزووتنەوەی چاکسازی، سەردۆزگەری دەوڵەت تۆمەتی خستە پاڵ، شتێک نەبوو زیاتر لە دنەدان بە عەلمانیەت، دەمامکدار وەک حوکمی یاسا و دیموکراسی.

داوەتکردنی هابرماس بۆ ئێران لە ٢٠٠٣ بەتایبەتی بۆ ئەم مەبەستە بوو. لە کۆبوونەوەیەکی نهێنی لە شوێنی حەوانەوەی بەرێز کادیڤار، کە سەعید هاجەریان و شابستاریش لەوێ بوون، پرۆسەی بە عەلمانیکردن بە وردی دێتە شیکردنەوە و چەندان رێنوێنیی نوێ خرانە بەرباس. بەرێز هابرماس دەگەرێتەوە وڵاتەکەی و قایل بووە بەتوانای راوێژکاری بۆ مەبەستی

چاکخوازەکان بۆ دامەزراندنی سیستمێکی عەلمانی لە ئێران.

تیۆریستی سیاسیی جۆن کین، نووسەری، لەنێو چەندان کتێبی تر، "کۆمەڵگەی مەدەنیی جیهانی، ۲۰۰۳"، بە پیلانێکی هاوشێوە تۆمەتبار کرا، هەروەها بە "تیۆریستی سەرەکیی شۆڕشگەلی ئاوریشمی و ئەندامێکی دەستەی سیخوڕی بەریتانی MI6 ناوزەد کرا." بەم شێوەیە، بە یەکێک لەو تێکدەرە سەرەکییانە دانرا کە گوایە هەوڵی داوە بۆ لێخستنی کۆماری ئیسلامی.

چارەنووسێکی هاوشێوەی ئەمە چاوەڕێی ماکس وێبەر بوو، کاتێ، ئەوەی ئێرڤان ئەبراهامی ناوی لێ نا "دانپیانانی ئەشکەنجەدراو"، سەعید هاجەریان، سەرۆکی ستراتیجی چاکسازی، بەم شێوەیە باسی ماکس وێبەری کرد و دانی پێدا نا کەوا چەمکی سوڵتانیزمی کۆمەڵناسی ئەڵمانی بەهیچ شێوەیەک بۆ ئێران ناگونجێ و ناشێ." ڕێژیمی پشت ئەستوور بە "ویلایەتی فیقە" شەرعیەتی خۆی لە ئیمامی سەردەم وەردەگرێ (خوای گەورە و بەدەسەڵات گەڕانەوەی خێرا بکا)، هەروەها لە ئەنجامدا ئەمە لەگەڵ بیردۆزی سوڵتانیزمی ماکس وێبەر یەک ناگرێتەوە. ئەو دەڵێ: "من ئیهمال بووم و بەبێ ئەوەی قووڵ بیر بکەمەوە بیرۆکەکانی وێبەرم هێنا ناو وڵاتەکەمان." هاجەریان زیاتر دووپاتی کردەوە کەوا ماکس وێبەر توانیبووی کارەکەی خۆی جێبەجێ بکا لە چەواشەکردنی سیاسەتی ئێرانی (نزیکەی دوای ۹۰ ساڵ لە مردنی لە ۱۹۲۰) چونکە شۆڕشی کولتووری باش بەڕێوە نەبرابوو و دەسەڵاتداران باش بە کاری خۆیان هەڵنەستابوون و باش واگا نەبوون. دەڵێن هاجەریان گوتوویەتی هەر تەنێ ماکس وێبەر نەبوو، بگرە پۆستسترەکتورالیزم، پۆستماکسیزم و فێمینیزم بوو کەوا وەک یەک ناپاک بوون لە دانانی دیزاینی لێخستنی کۆماری ئیسلامی. لە ڕێگەی هاوکاریی مامۆستا حوسێن بەشیرییە، مامۆستایەکی ناسراوی تیۆری سیاسی کە ناچار کرا نیشتمانەکەی بەجێ بێڵێ، هاجەریانیش هاتە ژێر بار و

کاریگەریی جۆن کین.

ئیسلامیزمی سەربازی ئەوکات بووبووە پارچە پارچەی وەهمی دەروونی، زۆر دەترسا لە پێشنیازکرنی بیرۆکەیەک بەهۆیەوە گەمژەیی و دڕندەییی سەرکردایەتیی ئێرانی پێ ئاشکرا کرابا، ئەوەی بن بەرێ بێنێتە سەر بەرێ وەک رۆژی کۆتای ویزاردی ئووز.

## لێکترازاندنی بیری ژێردەستە

زمانی وڕێنەئاسا و لێکدانەوەی دەروونی راستی و خەیاڵ لە ناخی حوکمی سەردۆزگەری گشتی لەو دادگە کەنغەرئاسایەی تاران لە تۆماری مێژوویدا دوایەمین چارەنووسی ئایدیۆلۆجیای ئیسلامییە و قووڵاییی ترسێکی وەهمئاسا و خەیاڵێکە، کە سەرانی ئێران خۆیان تێیدا نغرۆ بوونە لە بەرگریکردن لە کۆماری ئیسلامی، هەر خۆیان ئەو کۆمارەیان هێنا دنیا و هەر خۆیشیان گۆڕی بۆ لێ دەدەن. ئەگەر بەخشانە تەندروست و کاریگەرەکەی عەلی شەریعەتی بەناوی سەردانێکی کورتی فرەنسی، باسی دەسوەردانە ئەورووپییەکان بکا لە جیهانێکی شۆڕشگێڕی موسڵمان، ئەوا نوێنەرایەتیی دەسەڵاتی ئایدیۆلۆجیای ئیسلامی دەکا، پاشان لەم سۆنگەیەوە، بەڵگەی سەردۆزگەری گشتی رۆژی دواتر لەلایەن ئایدیۆلۆجییە شەڕانگێزەکانی کۆماری ئیسلامی ئامادە کرا، ئەمە خۆی لە خۆیدا راگەیاندنی مردنی ئەو دەسوەردانەیە. وەک لاپەڕەیەکی گابریێل گارسیا مارکیز (١٩٧٥)، حوکمەکە زیاتر بەبڕوانامەی مردنی خودی ئایدیۆلۆجیای ئیسلامی دەچێ نەوەک پیلانێک بۆ لێخستنی کۆماری ئیسلامی کە دروست بووە بەهۆی دوژمنگەلی راستی، بەلاغی و خەیاڵی. بۆیە دەسەڵاتی لێخستنی کۆماری ئیسلامی دەکەوێتە ناو خودی دۆکیومێنتەکە، نەک بەوانەی کە کرانە نیشانە.

لە دوای خلاسبوونی "ئایدیۆلۆجیای ئیسلامی" و سەرهەڵدانی

بزووتنەوەگەلی پۆستئایدیۆلۆجی لە سەرانسەری جیهانی موسڵماناندا، ئێمە لەدایکبوونی یەکەم کەسی سەردەمی دوای پۆستکۆلۆنیال دەبینین. پۆستئایدیۆلۆجی لێرەدا واتە پۆستکۆلۆنیال، واتە کۆتاییی داگیرکاریی وەک دۆخێکی بەرهەمی مەعریفی، بەو مانایەی کە پێکهاتەی هەموو ئایدیۆلۆجییە گەورە و رکابەرەکان لە دژی ستەمکاری ناوەخۆی و باڵادەستیی بیانی لە وەڵامدا بوون بۆ داگیرکاری و بۆیە لە پێگەی هاودژیی خۆیاندا هەر ژێردەستە بوون. بزووتنەوەی سەوز و بەهاری عەرەبی، تاڵیی نزیکەی دووسەت ساڵە، زاڵ دەبن بەسەر مێژووی داگیرکاری و سەردەمی دوای داگیرکاری و ئایدیۆلۆجیا، بۆیە بەم شێوەیە یەکەم راپەڕینی سەردەمی دوای داگیرکارین وەک ڕکابەرێکی موسڵمان لەگەڵ مۆدێرنیتەی پۆستکۆلۆنیالدا. ئەوانەی لەناو "چەپ"دان و دژایەتیی بزووتنەوەی سەوز و بەهاری عەرەبی دەکەن، کە لە تێکەڵەیەکی سەیری سیاسەتی بێهیوایی، تۆریەنتالیزمی سیاسی و وێرانبوونی دژە داگیرکاریدان، کەوتوونەتە داوی خەیاڵی پاشکەوتوو و بێ سەروبەریان.

ئازادبوونی پێدا پێدا لە دۆخی پۆستکۆلۆنیالی بەرهەمی مەعریفی بە زاراوەی ئایدیۆلۆجیای یوتۆپیایی پرۆسەیەکی مێژوویی بوو و جەنگی خۆی کردبوو. ئەوەی لەپێشمانە پیاسەکردن نییە بە نێو پارکدا. تا ئەمڕۆش زاراوەی وەک عەلمانی، عەلمانیەت و بەعەلمانیکردن هەر ماونەتەوە و وەک درک وان لە بەردەم ئەو دۆخەی داگیرکاری. وەک ئەلبێرت مێمی درکی پێ کرد لە کتێبەکەی بەناوی "داگیرکار و داگیرکراو، ۱۹۵۷"، کەوا سڕینەوەی شوێنەواری ژێردەستەیی کارێکی وەها ئاسان نییە، لەبەرئەوەی ئەنجامەیلی دەروونیی توندوتیژی زاڵ دەبێ بەسەر کاریگەرییە سیاسییەکانی. مێمی زانی پرۆسەکە چەندان قۆناخی گەرەکە، هەر لە نیشتمانپەروەری تۆقێنراو بگرە تا دەگاتە رەگەزپەرستی لە دژی داگیرکەر. بەتایبەتی بە زاراوەی ئایدیۆلۆجی، ناشنالیزمی دژە داگیرکەر و "گەڕانەوە بۆ خود" (ئاین،

کولتوور، رابردوو)ش پشت دەبەستن بە هەمان پرۆسە. ئەم قۆناخانە، بە زاراوەی سیاسی و دەروونی، نەرێنی، بەرتەک و نیشانەکراون لە دژی ئەفسانەگەرای داگیرکار کە ئاژانسی ژێردەستەی رەت کردووەتەوە، هەروەها پێگەیەکی رەقیشە بەرامبەر بالادەستیی کولتووریی ژێردەستە. بەلام زالبوونی ئەمە تەنیا ئەو دەمە رێی تێ دەچێ کە ئەم جۆرە وەلامە نەرێنییانە هەبن.

## مۆدێرنیتەی کۆمەلایەتی و ئەقلی ئیستاتیکی

دۆخی بەرهەمی مەعریفی دوای سەردەمی ئایدیۆلۆجیا کە سەرکەوت بەسەر پۆستکۆلۆنیالیتی ئێستە بووەتە شتێکی جیهانیی پێشەنگ: ئەو جیهانە وەردەگرێتەوە کاتی خۆی بە پۆستکۆلۆنیالیتی دۆرابوو بەهۆی دووبارە فێربوون چۆن تێیدا بژی. هەردوو ساتە گرینگەکە و لایەنی پابەندی ئەم قۆناخەی دوای ئایدیۆلۆجییەی جیهان ئەمانەن (١) ئامازکەی بە پێکهاتەی چالاکیی مۆدێرنیتەی کۆمەلایەتی کە مۆدێرنیتەی سیاسی و ئایدیۆلۆجی تێ دەپەرێنێ و بەجێیان دێلێ بەشێوەیەک کەوا هەموو ئایدیۆلۆجیاکان پێکەوە پارێزراو دەبن بەلام هەرگیز هیچیان پێ ناکرێ و (٢) هەستانی بەم کارە لە رێگەی کاری ئەقلی ئیستاتیکی کەوا زالە بەسەر دۆخی داگیرکاری و پێگەی ئەقلی سیاسی. نە مۆدێرنیتەی کۆمەلایەتی و نە ئەقلی ئیستاتیکی چیی تر ئایدیۆلۆجین. هەردووکیان ئێستە دوو شتی جیهانین، کاریگەرییان هەیە بەسەر جیهانیبوونی کۆزمۆپۆلیتان کە لە سەردەمی ئایدیۆلۆجیدا هاتبووە چەوساندنەوە و سەرکوتکردن.

لە کاتێکدا پۆستئایدیۆلۆجی واتە کۆتایی دۆخی پۆستکۆلۆنیالیتی، بۆیە بالادەستیی درێژبووەوەی ئەوروپی، واتە کۆتایی سیستمی ئاینی و قۆناخەکانی شیکردنەوەی مێژوو، پێگەی مۆدێرنیتەی کۆمەلایەتی ئامازەیە بە رێی کۆتایی مۆدێرنیتەی سیاسی. لە "جیهانی موسلمانان"دا (کە زۆری

لێ دەکرێ پێگەی پێشووی خۆی وەرگرێتەوە )، لە سێ سەردەمی جیاوازدا، کە بەریەککەوتن و سوودیان لە یەکتر بینی، پێکهاتە ئایدیۆلۆجییەکان رکابەرییان دەکرد بۆ دروستکردنی مۆدێرنیتەی سیاسی. دوای دووسەت ساڵی ئەو پێکهاتە ئایدیۆلۆجییانە، هەروەها ستەمکار دوای ستەمکار، دواجار گەیشتین بەخاڵی هەڵوەشاندنەوەی ئایدیۆلۆجیای داگیرکاری و بەرهەمی مەعریفیی داگیرکاران. کۆدی سەرەکیی مۆدێرنیتەی پۆستکۆلۆنیالیتی ئەوروپی زۆر پێی داگرتبوو لەسەر گێڕانەوەی سەرەکیی مۆدێرنیتەی سیاسی، لە کاتێکدا لایەنی رەهاگەریی ئەم مۆدێرنیتەیە، لەسەر بنچینەی گوتاری هیگڵی، تەواو دوورە لە دۆخی پۆستکۆلۆنیالیتی، بەڵام یەک دەگرێتەوە لەگەڵ لایەنی ستاتیکی دژە داگیرکار. لە سەنتەرگەلی چاوەڕوانکراوی ئەم سەپاندنی مۆدێرنیتەی داگیرکارییە، پۆستستروکتورالیستەکان بیریان لە تێکدانی ئەو کۆدە سەرەکییە کردووەتەوە، لە کاتێکدا رەخنەگری نیومارکسیی پۆستستروکتورالیزم پێ دادەگرن لەسەر پاراستنی، بۆیە هەردووکیان، لە کاتی رەتکردنەوەی یەکتر، هەر بە شێوازی ئەرستۆیی دەمێننەوە. ئایدیۆلۆجیا وەک فۆرمێکی ئەودیو وجوود، لێکدانەوەیەکی جیهان کە جیهانی چەواشە کرد، ئەم سەروو بوونەی لەدەست داوە بۆ فەلسەفەی کیشوەری ئەوروپی، هەرچەندە ئەم کیشوەرە هەرگیز ئەو بالادەستییەی نەبووە، یان لە تەواوی جیهاندا نەیبووە. ئایدیۆلۆجیا وەک کۆدێکی سەرەکیی ئاینیی مێژوویی رۆڵێکی مێژوویی گێڕاوە بۆ ئەوروپا، بۆ "رۆژئاوا" وەک بالادەستییەکی بێوێنە و بەهێز. بەڵام ئایدیۆلۆجیا وەک بالادەستی و بەهێزبوونی مێژوو، بەکارهێنانی دەسەڵات وەک کۆدی سەرەکیی جیهان، پێگەیەکی شڵۆقی هەبوو بەسەر مێژووی جیهانی ئەوانی ترەوە، کە لە راستیدا بەتەواوی هاتە پاراستن لەلایەن ئەو جیهانەی پێی گوترا جیهانی "ئەوانی تر".

کەواتە مۆدێرنیتەی کۆمەلایەتی پشت دەبەستێ بەو نوێنەرایەتیکردنی

سروشتی خەڵک کە ئەویش ڕێڕەوێکە بەرەو بەهاووڵاتیبوون، هاووڵاتیبوونێک بە بەڵێن و هیوا و فیتی هیچ ئایدیۆلۆجیایەک نەبێ، بگرە خۆی لەنێو جیهانیبوونێکی کۆزمۆپۆلیتانیدا دەبینێتەوە کە لە یەک کاتدا هەم پتەو و هەمیش دیارە لە بەجیهانیبوونیدا. بزووتنەوەی سەوز بەم دروشمە دەستی پێ کرد "کوا دەنگم؟"، هەروەها سەدای خەڵکی لە بەهاری عەرەبی بەم هاوارە دەستی پێ کرد "خەڵک داوای لێخستنی ڕێژیم دەکا". هەردوو دروشم سزای مردن دەدا بەسەر هەموو ئەو بزووتنەوە ئایدیۆلۆجییانەی فەشەلیان هێنا لە دابینکردنی مافەیلی هاووڵاتیبوون، بەتایبەتی لە دروستکردنی ئایدیۆلۆجیای ڕکابەر، شۆڕشەیلی کۆمەڵایەتی پێش بزووتنەوەی سەوز و بەهاری عەرەبی خەونی پێوە دەبینی لە مانیفێستۆی هاووڵاتیبوون، بەو شتەشەوە کە پێی دەڵێن "دەستوور"، بەڵام نوشستیان هێنا لە لێکدانەوەی هاووڵاتیبوون بە زاراوەی دامەزراوەیی، کە بەناخی پێگە جیهانییەکەیاندا ڕۆ چووە. هەموو وڵاتە ستەمکارییەکان لە جیهانی موسڵمانان، ئایدیۆلۆجیای ئیسلامیش لەگەڵیان، لە ڕاستیدا ئایدیۆلۆجیا بەو چەشنە، پاشماوەی تۆز لەسەرنیشتووی ئەو ئایدیۆلۆجیا و وڵاتانە ئێسکەپەیکەری بەهاووڵاتیبوونی ئێمە ئاشکرا دەکەن. چ خەوشێک لە بیرۆکەی هاووڵاتیبووندا نییە لە دۆکیومێنتی ئایدیۆلۆجی کە ئێمە پێی دەڵێین "دەستوور"ی ئەم ستەمکارانە: بێ لە چەند هەمواركردن و گۆڕانکارییەک، تەواوی دەستوورەکانی ئەو وڵاتانە لە یەک دەچن و دەکرێ زۆر بەئاسانی بێنە بەراوردکردن. بەڵام لەگەڵ یەکەم هاواری "کوانێ دەنگم؟" و "خەڵک داوای لێخستنی ڕێژیم دەکا"، ئەم ستەمکارانە دەستوورەکانیان قۆپاندەوە و بوون بە ئامێری کوشتن و بەرگرییان لە وڵاتی بەکرێگیراویان کرد. بیرۆکەی "هاووڵاتیبوون" تەنێ لەو حاڵەتەدا ئایدیۆلۆجییە ئەگەر بێتو بکەوێتە چوارچێوەی دەستوورێکی ئایدیۆلۆجی، چیی تر ئایدیۆلۆجی نییە کاتێ پشت دەبەستێ بە پێکهاتەی مادیی مۆدێرنیتەی کۆمەڵایەتی کە وەستاوە لەسەر هێزەیلی مێژووی و

پێکهاتەیلی کۆمەڵایەتی (بزووتنەوەگەلی مافەیلی ئافرەتان، یەکەتییەکانی کرێکاران، رێکخراوەیلی قوتابیان، دەستەگەلی پیشەیی، دەستەی خەڵکی لە دەرەوە ژیاو، هەروەها جۆرەکانی تری دەستەیلی ئارەزوومەندان). هاووڵاتیبوون بەدەنگێکی بەرز بە زاراوەی ئایدیۆلۆجی دێتە راگەیاندن، بەڵام بە هێمنی پراکتیزە دەکرێ لە دامەزراوەگەلی کۆمەڵایەتی.

ئەم پێکهاتەگەلە کۆمەڵایەتییە سیستمیانە، مۆدێرنیتەی کۆمەڵایەتی کە بەری ئەوانە، هەروەها بنەمای ئەخلاقیی پیادەکردنیان چیی تر لە هیچ "شۆڕشێکی تێکڕا"دا بەهەدەر ناچن. ئەمانە وەک پارچەی بچووک بچووکی وێنەیەک نوێن کە هەر بەم شێوەیەش دەمێننەوە. ئەگەر، بەپێی چەمکی یۆرۆسێنتریی شۆڕش، چاوەڕێی "شۆڕشێکی تێکڕا"مان دەکرد، ئەوا دەبوایە بێئومێد باین کاتێ تەماشای کرانەوەی بەهاری عەرەبیمان کرد.

یەک پەیام، تەنیا یەک پەیام بەدەنگێکی بەرز و روون دەگوترێتەوە لە مەغریبەوە تا ئێران، لە سووریاوە لە یەمەن، هەروەها لە هەر شوێنێکی نێوانیاندا: "خەڵک داوای لێخستنی رژێم دەکا." ئەم راپەڕینانە نە تایبەتین و نە پشت دەبەستن بە خەمی ناوچەیی. ئەمانە بەتەواوی زنجیرەیەک یاخیبوونی فراوانی جیهانین، هەروەها شۆڕشی بچووک و هەڵوەشێنراو نین، بگرە ئاماژەکەی پۆستمۆدێرنێکن کەوا بە پێشە خۆی کەوتووە. ئەمانەی ئامارکەی سیستمی تەواو جیاوازن، هێشتا ماوە، دەبێ دیراسەیەکی نوێی سیمبولیان بۆ بکرێ. کاتێ رەوتی ئایدیۆلۆجی کە لەنێویدا "موسڵمان" وەک هاووڵاتی دەستیان کرد بە تێڕوانینێکی قووڵ بۆ زاراوەی ژێردەستەیی، ئەوا پێگەی پۆست-ئایدیۆلۆجی زاڵ دەبێ بەسەر پۆستکۆلۆنیالیتی، دوای ئەوەش ئێمە دەچینەوە سەر ئەو پێگەیەی کە مۆدێرنیتە وەک پرۆژەیەکی ئەورووپی خۆی لە خۆیدا پرۆژەیەکی ژێردەستەکردن بوو، کە زۆر باش جیهانی پۆست-ئایدیۆلۆجی دەگۆڕێ بۆ نێو پۆستمۆدێرن لەو سۆنگەیەی کەوا کۆلۆنیالیزم هەرگیز بالادەستیی ئەقڵ و پێشکەوتنی بەخۆوە نەگرتووە، لە

باتیان تەنێ پێیاندا تێپەڕیوە و جیهانی کردووەتە چەندان وڵاتی ژێردەستە.
بەڵام پۆستمۆدێرنیتی لەم تێڕوانینەوە واتە نزیکبوونەوە لە ئەقڵی ستاتیکی
کە دژی ئەقڵی گشتی دەوەستێتەوە، لەوێوە کاری دیراسەی سیمبولێکی تر
دەس پێ دەکا وەک رەهاگەرییەکی لاساییکار کە لەنێو ویژدانی هەڵەی
رەوتی داگیرکاری بەرەچەیەکی ئایدیۆلۆجیی فەزایەکی جیهانگیریی
بەرهەمی مەعریفی دێتە پێناسەکردن. کێشە لەگەڵ هاردت و نیجەر، وەک لە
بەشی یەکەمدا باس کرا، ئەوەیە ئەوان داوای "شۆڕشی تێکڕا" دەکەن لە
کاتێکدا تیۆری پۆستمۆدێرنی ئیمپراتۆریەت پێشکێش دەکەن، ئەمەش
بێگومان شتێکی زۆر ئاسایییە بێتە ئەنجامدان لەلایەن بیرمەندانی
شۆڕشگێڕی ئەورووپی و ئەمەریکایی. بەڵام ئەوەی ئێمە دەیبینین لە
شۆڕشگەلی کۆتا-کراوەی بەهاری عەرەبی تەواو پێچەوانەی شۆڕشگەلی
تێکڕایە، هەروەها بەهاری عەرەبی دەبینین دەکرێتەوە و دەتەقێتەوە لە نێو
دۆخێکی ئیمپراتۆریی وادا کە وا لە ئیمپراتۆری پۆستمۆدێرن (لە رێی
ئاژانسەکانی کە ئەمانەن: ئەمەریکا، یەکەتیی ئەورووپا، ناتۆ و یو ئێن و تاد.)
یەک بگرن لەگەڵ شێخنشینی سعوودیەی پۆستمۆدێرن، هەروەها رێ بە
فەیلەسووفی ئەورووپی دەدا ببێتە هاوڕێی شەڕوانانی خێڵەکی لیبیایی بۆ
دڵنیاکردنەوەی دروستبوونی لیبیایەکی هاوڕێی ئیسرائیل لە دوای قەزافی.

بیرۆکەی "ئەقڵێکی ئیستاتیکی"، کە من لێرەدا پێشنیازی دەکەم،
سەرچاوەی گرتووە لەو شتەی کە کریستۆف مێنکە لە کتێبی "سەروەریی
هونەر (١٩٩٨)، پێی دەڵێ "نەرێنیی ئیستاتیکی"، لە رێی داتاشینی هونەر لە
ئەقڵی خۆی و ئەقڵی ئەودیو فەلسەفە. تەنێ بەهۆی باوەڕکردن بە کارگەلی
هونەری لە پێوەندیی نەرێنییان بە هەموو شتێکەوە، ئەمە هونەر نییە، مێنکە
وا دەڵێ، ئاخۆ دەکرێ ئۆتۆنۆمیی ئەو جۆرە کارانە، بە لۆجیکی ناخی
نوێنەرایەتییان و رێی ئەزموونکردنیان، باشە بێنە تێگەیشتن. تا ئێستە
یەکلا نەبووەتەوە بەڕاستی هونەر چییە، کارێکە تژییە لە هاودژی،

رەتكردنەوە و نەرێنی. تەواو لەو سیفەتانەدا هەیە (واتە هاودژی، رەتکردنەوە و نەرێنی (ساف و سادە) کەوا کارگەلی هونەری (لە سینەمای عالیە سلێمانەوە بگرە تا دەگاتە مۆزیکی موحسین نەمجو، بۆ هونەری مۆنا حەتوم، لەوێشەوە بۆ رۆمانەکانی سونولا ئیبراهیم) ئەقڵێکی ئیستاتیکی دەخەنە روو کەوا لەودیو ئەقڵی ئایدیۆلۆجی کار دەکا و باس لە مۆدێرنیتەیەکی کۆمەڵایەتی دەکا کەوا ناکرێ بێتە گرتن، ئەشکەنجەدان و کوشتن بەرێی درندانە و پیسی هەر ستەمکارێکی پۆستکۆلۆنیال. هونەر واقیعی نییە، هەروەها نیشانەکانی ئاماژەن بۆ هیچ جگە لە خۆیان نەبێ، لە ناواقیعیبوونی خۆیدا ئەقڵی واقیع هەڵدەواسێ، بەپێی ئەو پێناسە باشەی کەوا بۆ هونەر هەیە، هەموو شتێکی تر دەچێتە خانەی یاخیبوونی ئیستاتیکی، بۆیە هەردەم بە هەڵواسینی واقیع دادەنرێ. مێنکە باشی بۆ چووە کەوا هونەر ستایش ناکا، تەنیا رەت دەکاتەوە، بێ ئەوەی ئاماژە بۆ هیچ شوێنێک بکا. شیعرگەلی گۆرانی و سیمبولەکانی یاخیبوون نیشانەی ناشایستەی ئەقڵی ئیستاتیکین کەوا، ئەوانەشی کەوا دەمێکە هاتوونەتە هەڵوەشانەوە، رێژیمگەلی مەعریفە و دەسەلات هەڵدەوەشێننەوە، هەروەها تەواوی بیرکردنەوەی ئایدیۆلۆجیی ئەرشیڤکراو تێکوپێک دەدەن کەوا بناخەیان بۆی داناوە.

## کەللەڕەقیی سیمبولی

مەبەستم لە "کەللەڕەقیی سیمبولی" لێرەدا رەوتی شۆڕشگێڕی ئیستاتیکییە تێیدا نیشانەی یاخیبوون رەتی دەکەنەوە رازی بن بە رەوتگەلی شەڕانگێزان، هەروەها رۆشنبیر و بیرمەندان دەبن بە کەسانی زیادە. لەم دۆخەی کەللەڕەقیی سیمبولیدا، لەودیو دەستگەیشتن بە ئایدیۆلۆجیا و یوتۆپیا، نیشانەکان واتە، بەشێوەیەکی کاتی، هەر تەنیا شوێنەوارێکی دریدایی لەم نیشانانەدا نییە، تەنانەت نایەنە دۆزینەوە، کەس بیری

بەلایانەوە ناچێ، شوێنەواریی دریدایی لەنێو خودی خۆیدا ڕەوتێکی درێژکراوەی هیگڵییە، کە لێیەوە دریدا نەیتوانی مەدرەجە شکێنەرەکانی ئازاد بکا. لەبارەی ڕەوتگەلی داگیرکاریی وێرانکارییەکەیەوە پێویستییان بە هیچ شوێنەوارێک نییە. بۆ ئێمە، نیشانەکان هیچ مانایەکیان نییە. هەر ئەمەیە پێی دەڵێین دۆخی دوای پۆستکۆلۆنیالیتی، دۆخێک کەوا دەبینین تێیدا بەهاری عەرەبی سەر دەکەوێ و شتی نوێ لێی دەبن. کاتێ دریدا پێ دادەگرێ لەسەر شوێنەوارەکە وەک ئەوەی بیەوێ "باسی غیاب بکا لە وجودا"، واتە وجوودێکی هەردەم غیاب، تەواوی پرۆژەکەی بۆ خۆلادان لە میتافیزیکی پشت ئەستوور دەمێنێتەوە بەبوونێکی هیگڵی کەوا هیگڵ هەردەم بەدوای سەرکەوتنیدا دەگەڕا. بەڵام لە کەللەڕەقیی سیمبولیدا کە ئێمەی لە پۆستکۆلۆنیالیتی دەرهێنا، هیچ پێویست ناکا پەنا بەرین بۆ هیچ شوێنەوارێک، چونکە هیچ بوونێک نییە ئێستە غیاب بێ. حەسەن ئاغای قەساب خۆ ئیمام حوسێن نییە، نەخێر هەو نییە لە هیچ نمایشێکی تازیەشدا. تەنێ لەوێیە نمایش دەکا، نمایشکردنیش ڕێی لێ ناگرێ لە ناوەڕاستی شانۆکە بوەستێ و ڕوو لە جەماوەر بکا، لە دەق بچێتە دەرێ و بڵێ: "ئەوە چی ڕوو دەدا ماجد؟" لە هەمان کاتدا لەگەڵ شمیری زۆڵ دەجەنگێ.

ڕەوتی پۆستکۆلۆنیالیتیی ئێمە سەردەکەوێ، لە شۆڕشگەلی کۆتا-کراوەدا، ئێستە ئێمە تێ دەگەین کەوا هیچ شوێنێک نییە، پێویستیش نییە، بۆ "شۆڕشی تێکرا". ئەوەی بۆ بیرۆکەی شۆڕشێکی کۆتا-کراوە پێویستە ئەوەیە ئاگەداری و چاودێریی گۆڕەپانی تەحریر بکرێ، ئەوە دڵنیا بکرێتەوە کەوا ڕووداوگەل چیی تر نەکەونە ژێر کاریگەری و باری ڕەوتگەلی پۆستکۆلۆنیالیتی. بەڵام، کۆتاییی پۆستکۆلۆنیالیزم وەک ڕەوتێکی کردەی سیاسی و پێکهاتەیەکی ئایدیۆلۆجی مانای کۆتاییی دۆخی جیهانگیری و سەرمایەداری نییە کەوا یاری بە سەرکەشییەکانی داگیرکاری و ئیمپریالی

دەکا لە جیهانێکدا کە ئێستە پێکهاتەیلی نوێی زاڵی تێدا بەدی دەکرێ. شەکەتبوونی پێکهاتەیلی ئایدیۆلۆجی لە رەوتی پۆستکۆلۆنیال رێ لە سەرهەڵدانی رەوتێکی نوێتر ناگرێ کە دەیەوێ سەربکەوێ، ئا لێرەدا، بەرگەگرتنی ئەو رەوتانەی بالادەست بوون زۆر گرینگ دەبن بۆ پرۆسەی شۆڕشگێڕی. ئیسلامیزم بەسەر چوو، بەلام موسڵمانەکان بەردەوام دەبن لە پێشاندانی بازنەی گشتیی خۆیان. سۆشیالیزمی جیهانی سێیەم دەبێ خۆی بسازێنێ لەگەڵ رەوتی نوێی بەرگەگرتن لە غیابی هەر کامپێکی سۆشیالیستی. ناشنالیزمی دژە داگیرکار بەهەمان شێوە دەچێتە پاڵ شێوە و رەوتگەلی هاریکاری لەم راپەڕینگەلە شۆڕشگێڕییانەی کەوا خەریکە تەواوی سنوورەکان دەبڕن. رۆڵی توندوتیژی وەک بەردی بناخەی ولات (تا ئەو رادەیەی کە بەناوی وەستاندنی توندوتیژی، ولات دەگاتە توندوتیژی و بەکاری دێنێ: داگیرکاریی سەربازی لەژێر ناوی کۆمەکی مرۆیی دێتە بەکارهێنان) چەقی سیاسەتە ئەمەش واتە دەبێ بەشێوەیەکی رادیکالانە بێتە رەچاوکردن. هەرکە جیهان دەست دەکا بە سازان لەگەڵ ئەو جوگرافیا ئازادە نوێیە، پێویستە ئێمە دووبارە بیر لە بیرۆکەی مرۆڤایەتی بکەینەوە، لەودیو پەستبوونی توند، کە هۆبس و رۆسی باسی لێوە دەکەن، دەمێکە پێناسەی زاراوەکانی سیاسەتیان کردووە، ئەمەش، لەوەتەی مارکس و وێبەر، بووەتە بەردی بناخەی دروستبوونی ولات.

هەشتەم

## ڕەگەز، جێندەر و چین لە شۆڕشگەلی سنووربڕدا

هەرکە دادگەییکردنی مێژوویی حوسنی موبارەک لە سەرەتای ئابی ٢٠١١دا دەستی پێ کرد، شۆڕشگێڕانی میسری نیگەران بوون لە هێزەیلی تێکەڵاوی سەربازی و ئیخوان موسلمین کە هاوپەیمان بوو لەگەڵ سەلەفییەکان (هەردووک دەمێکە دەچەوسێنرێنەوە و وەلادەنرێن لە میسر)، نیگەران بوون نەبادا ئەمانە شۆڕشەکەیان لێ ببەن و بیکەن بە هی خۆیان. شۆڕشگێڕەکان ترسان نەبادا دادگەییکردنی موبارەک، دوایەمین تەنازول بێ کەوا دەستەی سەربازی بیکەن بۆ ڕازیکردنی شۆڕشگێڕەکان. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم ترسەش، خەلیل حەنانی، سکۆلەرێکە لە سیاسەتی ئیسلامی لە پەیمانگەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە زانکۆی دورهام و نووسەری کتێبی "ئیخوان موسلمین لە میسر: سیستمێکی سیاسیی پیر لە دژی سەعات دەجەنگێ (٢٠٠٨)"ە، وتارێکی بۆ "المیسر الیوم" نووسی، تێیدا باسی ئەوە دەکا کەوا ترس لە سەلەفییەکان (هەروەها ئیسلامی سیاسیش بە گشتی) شتێکە لە ڕاستیدا تەواو لە شوێنی خۆیدا دانەنراوە. "سەلەفیزم" وا خەریکە دەبێتە دێوەزمەیەک بەرۆکی سیاسەتی میسر دەگرێ. حەنانی بەم شێوەیە نوشداری دەدا:

> خڕبوونەوەی جەماوەریی ئیسلامییەکان لە گۆڕەپانی تەحریر لە ٢٩ی تەمووز، کە زۆربەیان سەلەفی بوون، تەنێ ئەوەی پێشان دا کە هەندێ هێزەیلی سیاسی هەن لە میسری دوای موبارەک لە هیچ شتێک نابوورن و بێ ئۆقرەن. مەبەستم هەر سەلەفییەکان

نییە، بگرە هەندێ گرووپەیلی لیبراڵ و عەلمانیش کەوا بە جۆشن بۆ کپکردنی دەنگی ئیسلامییەکان لە سەردەمی سیاسیی نوێی میسر. ئەم گرووپانە نەک هەر تەنیا سەلەفییەکان بچووک دەکەنەوە وەک رەوتێکی شەڕانگێز کە مەبەستیان تێکدانی شۆڕش و دروستکردنی دیکتاتۆریەتێکی نوێیە، بگرە مافی هاتنە ناو گۆڕەپانی تەحریر تەنێ بە هی خۆیان دەزانن، کە شوێنێکە بۆ گردبوونەوەی گشتی بۆ هەموو میسرییەکان.

ترسی "کۆماری ئیسلامی"یەکی تر لە ناوچەکە هۆکارێکی گەورەیە لە پشت ئەم نیگەرانییە، نیگەرانییەک کە بەڕاستی لەلایەن هەندێ میسری هەستی پێ کراوە بەڵام ئاگر بۆ خۆشکردنی زیاتر بەهۆی پارێزکار و نیولیبرالی ئەمەریکی (و ئیسرائیل)ەوەیە (کە بێگومان هەرگیز ئاماژە بە "کۆمارێکی جوولەکان" ناکا وەک هەڕەشەیەکی کاریگەر بۆ سەر دیموکراسی لە ناوچەکە لە ماوەی شەست ساڵی رابردوودا). هاوسۆز بۆ پرسی سەلەفییەکان، حەنانی دەڵێ ئیسلامییە میسرییەکان ماوەیەکی زۆر لەژێر چەپۆکی رێژیمی موبارەکدا هاتنە چەوساندنەوە و بۆیە هەموو مافێکیان هەبوو گۆڕەپانی تەحریری تازە ئازادکراو بەکار بێنن بۆ وەشاندنی بۆچوون و دەرخستنی دەسەڵاتیان. ئەو دانی پێدا دەنێ، بێگومان:

قورساییبوونی سەلەفییەکان (کە گەلێکیان سەرەتا دژی شۆڕشەکە بوون) دەکرێ ورووژێنەر بێ. بەڵام هیچ هێندەی ئەوە شۆک نییە ئەو دەمەی سەلەفییەکان دروشمی ئیسلامی بەرز دەکەنەوە، وەک "ئیسلامییە، ئیسلامییە"، یان داوای جێبەجێکردنی یاسای شەریعە دەکەن. ئەم جۆرە دروشمانە لەنێو سنوورگەلی ئازادیی بیروڕای خۆیاندایە. ئەوەی زۆر کاریگەر و لە راستیدا بێزارکەرە ئەوەیە کاتێ هەندێ لیبراڵ و عەلمانی هەمان تاکتیکی چاندنی ترس و تۆقین بەکار بێنن وەک

ڕژێیمی موبارەک بۆ بچووککردنەوەی ئیسلامییەکان، لە باتیی ئەوەی پێکیان بکەن لە پرۆسەکە.

حەنانی بەم ترسەی سەلەفییەکان دەڵێ "سەلەفۆبیا"، بۆیە باوەڕی وایە ئەو سەلەفۆبیایە دەبێتە ڕێگر لە بەردەم "گۆڕانی گرینگ کە لەنێو بزووتنەوەی سەلەفی ڕوو دەدا". ئاماژە بە ناکۆکییەکانی ناو بزووتنەوەی سەلەفی دەکا و سووره لەسەر ئەوەی کە ئەوان خۆیان سازاندووە لەگەڵ بۆچوونی دیموکراتی و حەزیان دەکرد لەگەڵ هێزەیلی عەلمانی و لیبراڵ ڕێک بکەون. دواتر دەڵێ: "ڕاستە، هەندێ سەرکردەی سەلەفی هەڵوێستێکی دوژمنکارانەیان هەیە بۆ دیموکراسی و پارتەیلی عەلمانی، بەڵام ئەوانی تر، بەتایبەتی سەلەفییە گەنجەکان، دەیانەوێ میانڕۆ و ژیرانەتر بجووڵێنەوە. ئێستە حەز دەکەن ببن بە بەشێک لە پرۆسەی سیاسی." پاشان حەنانی نوشداریی ئەوە دەدا کەوا "بە پشتگوێخستنیان، لەوانەیە ڕێی توندتر بگرنە بەر بۆ سەلماندنی بوونی سیاسییان. پێویستە سەلەفیزم لە بازنەی ئایدیۆلۆجی پەلکێش بکرێتە ناو سەنتەری سیاسی. ئەگەر ئەمە ڕوو بدا، سەلەفیزمی میسری دەکرێ کراوەتر و کەمتر دۆگماتیک بێ." دواتر بەم شێوەیە کۆتایی پێ دێنێ:

ململانەی نێوان عەلمانی و ئیسلامییەکان هەر تەنێ ئایدیۆلۆجی نییە، بگرە کۆمەڵایەتیشە. سەلەفییەکان و لایەنگرانیان زیاتر لە چینی خوار مامناوەندیی میسرییەوە دێن، بەتایبەتی لە شارۆکە بچووکتر و ناوچە لادێییەکان کەوا پشتگوێ خراوە لەلایەن سیاسەتی فەرمی لە ماوەی سی ساڵی ڕابردوودا. وەک هەر گرووپێکی سیاسیی تر، ئێستە شەڕ دەکەن بۆ پشکی یەکسانیی خۆیان لە سەردەمی دوای موبارەک. لەتبوونی سەلەفی-عەلمانی ململانەی بەرژەوەندییەکان پێشان دەدەن لەسەر چۆنیەتیی دروستکردنی سیستمی سیاسیی میسری، نەوەک ململانەی

ئاشتەوەنەبووی ئایدیۆلۆجییەکان. لەبەر ئەم هۆکارە، سەلەفییەکانی میسر دەبێ قسەیان لەگەڵ بکرێ، نەک لێیان بترسێن.

ترسی ئیسلامیزمی سەربازی لەنێو شۆڕشگێڕە میسرییەکان لەلایەن ئەوانی تر هاوسەنگ دەکرێ (کە بەشێوەی یەکسان پابەندن بە ئارەزووی دیموکراتییانەی شۆڕش) کە باسی لێبووردەیی و دیالۆگ دەکەن، هەرچەندە هێشتا لە پاڵ دووانەی هەڵەی ئیسلامی-عەلمانین، بەتەواوی فەزای گشتی پشتگوێ دەخەن (خودی گۆڕەپانی تەحریر) کە تێیدا ئەمانە و پێگە سیاسییەکانی تر هەڵدەمژرێنە نێو داهاتووی میسر. ئەوانەی نوشداری لە دژی ئیسلامیزمی سەربازی دەدەن بە دەگمەن دەنگیان هەڵبڕی لە دژی دڕندەیی و دووڕوویی نیولیبراڵ و نیوپارێزکارە ئەمەریکاییەکان، هەروەها نوشداریشیان نەدا لە دژی توخمە شکستپێهێنەکان و پیلانگێڕییەکان لەنێو چەپی ئێرانی، کە تەواوی بەهاری عەرەبییان رەت کردەوە (وەک چۆن دژی بزووتنەوەی سەوزیش وەستانەوە) وەک پیلانێک لەلایەن ئیدارەی ئۆباما. ترس، نیگەرانی و گومان دەبن بە شەڕانگێزی. هیچ رێیەک نەبوو بۆ دڵنیاکردنەوەی ئەوانەی بەخۆیان دەگوت "عەلمانی و لیبراڵی" کەوا ئیسلامییە میسرییەکان پابەند دەبن بە بنەماگەلی دیموکراسی، هەروەها هیچ رێیەکیش نەبوو بۆ نکووڵیکردن لەوەی ئیسلامییەکان پشکی یەکسانیی خۆیان بەرنەکەوێ لە شۆڕشی میسری.

بەهۆی ئەم ترس و گومانانەوە، دوو پرس زۆر گرینگ و کاریگەرن لە مشتومڕی عەلمانی-ئیسلامیدا: جێندەر و چین. داوای جێبەجێکردنی شەریعە بەتەواوی ئاکامی مەترسیداری لێ دەکەوێتەوە بۆ پرسگەلی ئافرەتان، لە هەمان کاتدا ئیسلامییەکان داوایەکی کەمیان هەبوو بۆ چینگەلی پلە نزمی کۆمەڵگە، نەک لەبەرئەوەی پشتگیریی بەهێزی چینی مامناوەندییان نەبوو، یان هەژاران زیاتر دیندارتر بوون. لەودیو ئەمانەوە

پرسیێکی تر هەیە، ئەویش پرسی رەگەزە، کە ئەویش ئاشکرا و روون بوو لە هەفتەکانی یەکەمی کرانەوەی بەهاری عەرەبی. دوای بەسەربردنی ژینێک لەژێر چەپۆکی دیکتاتۆریەت، میسرییەکان کتوپڕ گۆرانییەکیان گوت ئاوازەکەی جیاواز بوو، پرسیارەکە ئەوە بوو ئاخۆ ئامادە بوون و حەزیان دەکرد شیعرگەلی گۆرانییەکان باشتر بکەن.

## گۆڕینی شیعگەلی گۆرانی

لە بەهاری ٢٠١١دا رەمزی عیسام لە قوتابییەکی میسری ئاسایی بوو بە گۆرانیبێژێکی هەرە ناوداری شۆڕش لە نیشتمان. بی بی سی باسی لە یەکێ هەرە گۆرانییە بەناوبانگەکەی عیسام کرد: "دروشمی ئاوازدار بووبوو بە سروودی نیشتمانیی شۆڕش: خەڵک گۆرانییان دەگوت: بڕۆ، بڕۆ، داوایان دەکرد بەڕێز موبارەک دابەزێ. پاشان یەک رۆژ و گۆرانییەک جیهانیان گۆڕی:

> "بڕۆ" گۆرانییەک بوو عیسام پێکی وەنابوو لە دروشمگەلی نارەزایی شۆڕش لە رۆژەیلی سەرەت. هەرکە چووە پێش و دووبارە نمایشی کردەوە درکی بەوە کرد کە وشەکان بێ مانا بوو، چونکە ئەو کات موبارەک رۆیشتبوو. خێرا لێریکی نوێی نووسی، هاوارەکەی لە "بڕۆ"وە گۆڕی بۆ داوای خلاسکردنی حوکمی سەربازی. "هەرگیز لە بیر ناکەم، دایکی شەهیدێک هەردەم لەگەڵماندا بوو و قەتیش پێ نەدەکەنی و زەردەی نەبوو.... ئا لەو ساتەدا بوو دڵی خۆش بوو و دەستی کرد بە زەردە چونکە گوێی لێ بوو وشەکانی گۆرانییەکە گۆڕاون."

وێڕای ترسگەلی لەنگەرگرتوو، میسرییەکان خێرا فێری لێریکی دەبوون. پرسیارەکە ئەوە بوو چەند بەخێرایی لێریک دەگۆڕن و ئاوازێکی نوێ دادەنێن، یانیش بەپێچەوانەوە. نوشدارییەکەی هەنا ئارندت لەبارەی

شۆڕشی فرەنسی (کەوا هەرگیز سنوور نابێ بۆ داواکەلی کۆمەڵایەتی لە هەر راپەڕینگەلێکی شۆڕشگێڕی ئەگەر یەکسەر ببرێنە ناو رەوتی سیاسی) لێرەدا زۆر گرینگە. بەڵام سروشتی کۆتا-کراوەی ئەو داواکارییانە چوارچێوەیەکی جیاوازی کاتی دانا کە یەکسەر نارەزایی بەرز بووەوە، ئاسۆیەکەی فراوانتر کرد بۆ تێوەگلانی ئەوانی تر بۆ ماوەیەکی درێژ. کولتووری سیاسیی میسر دەگۆڕا، هەروەها گۆڕانەکان مێژوویی بوون هەرچەندە ئاسۆیان نادیار بوو، هەموو داوا و گۆڕانە سیاسییەکانی تر تۆمار دەکرێن لە دژی سیاسەتێکی خۆگرانە کە هێشتا لەدایک نەبووە.

ترسی ئیسلامیزمی سەربازی هێندەی خراپ بەکارهێنانەکە سروشتی بوو. هیچ ئەگەرێک نەبوو ئیسلامیی سەربازی پەنای بۆ بەرێ لە میسر لە ٢٠١١ وەک ئەوەی کردیان لە ئێران لە ١٩٧٩، هێزەکانیان کۆ کەنەوە و یەک بگرن، شکست بە ڕکابەرانیان بێنن، لەگەڵ دەستەی سەربازی و پاڵپشتانی ئەمەریکییان پیلان دانێن، کۆمارێکی ئیسلامی دامەزرێنن، شەریعە بەتەواوی جێبەجێ بکەن، زانکۆکان پاک بکەنەوە، ڕابەرایەتیی شۆڕشگەلی کولتووری یەک بەدوای یەکتردا بکەن، یاخییان لە وڵات دوور بخەنەوە، ئەوانی تر بکوژن، ئەوجار بتوانن کۆمارێکی ئیسلامیی شەیتانئاسا و دڕندەئاسای ئێرانی لە میسر دروست بکەن. بەڵام ئەو ترسەی کە ئاگری ئەو نیگەرانییەی خۆش کرد باش بوو بۆ شۆڕشەکە، لایەنە دیموکراتییەکانی کاریگەرتر کرد. ئیسلامیزمی سەربازی تاکە هەڕەشە نەبوو کەوا شۆڕشگێڕە میسرییەکان تووشی دەبوون. ناشنالیزمی تاک و دەمارگیر، کودەتایەکی سەربازیی تازە، توندوتیژی مەزهەبی، دەسوەردانی ئەمەریکا/ئیسرائیل و سعوودیە، هەروەها چەپی دژوار کە لەسەر هەردوو پەت یاری دەکا، ئەمانە ئەو هەڕەشانە بوون کە بە پلەی جیاجیا مومارەسەی دامەزراوگەلی دیموکراتی راپەڕینی شۆڕشگێڕیان دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا ئێستەش کاریگەرییان ئەرێنی بوو بۆ شۆڕش، خزمەتی ماسولکە

دیموکراتییەکانیان دەکرد.

ئێمە پێویستە چوارچێوەی مەرجەعی بەهاری عەرەبی فراوانتر بکەین تا ژێرەوە و ئەودیو جوگرافیای جیهانی موسڵمانان و عەرەبان ببینین. بۆ نموونە، لە فرە لایەنیی کۆچی کرێکاران بکۆڵینەوە بۆ نێو ئەفریقیای باکور، ئەمە دیاردەیەکە ئاکامەیلی سۆنگەی دیموگرافی و ئابووریی راپەڕینەکان ئاشکرا دەکا. ئەم جۆرە کۆچەی کرێکاران پرسی چینایەتی دێنێتە پێشەوە، لەگەڵیشیدا پرسگەلی رەگەز و جێندەر قیت دەبنەوە، تێگەیشتن لەمانە خوێندنەوەیەکی باشترمان دەداتێ بۆ بەهاری عەرەبی لە چاو یەک خۆپێشاندان یان یەکێکی تر لە گۆڕەپانی تەحریر، کە لەوانەیە خزمەتی رێڕەوی شرۆڤەکانیش بکا. بێگومان ئێمە پێویستمان بەوەیە باشتر سەرنج بدەینە کاردانەوەکان لەسەر شەقام، دەشبێ ئەو سۆنگەیە وەرگرین کە دەتوانێ شرۆڤەکە قووڵتر و باشتر بکا، بەهێزتری بکا، هەموو لایەنە کۆمەڵایەتییەکان لەخۆ بگرێ، ئەوانەی پێوەستن بە رەگەز، جێندەر و چین.

## رەگەز و رەگەزپەرستی

خێرا دوای سەرکوتکردنی دڕندانەی راپەڕین لە ئێران لە حوزەیرانی ٢٠٠٩، دەنگۆ لەسەر وارگەیلی ئەلیکترۆنی و لەنێو لایەنگرانی بزووتنەوەی سەوز دەستی پێ کرد گوایە هەندێ لەنێو هێزەیلی تەناهیی کۆماری ئیسلامی، کەوا بەکرێ گیرا بوون بۆ هێرشکردنە سەر خۆپێشاندەران، لە راستیدا هەر ئێرانیش نەبوون، بگرە لە راستیدا "عەرەب" بوون. وێنەگەلی هێزەیلی تەناهی بڵاو بوونەوە، زۆریان تاکی رەشتارە بوون و بە بازنەیەکی سوور نیشان کرابوون، هەروەها ناوەکانیان بە ناوی عەرەبی دەچوو، زیاتر دەگوترا گوایە ئەندامانی حزبوڵڵای لبنانی و حەماسی فەڵەستینی بوونە. ئێرانیگەلی وەک من کە خەڵکی ناوچەیلی باشووری نیشتمانین، کە بەو کەسانە دەچێ لە وێنەکان بە بازنەی سوور نیشانکراو بن، هەروەها بیرمان

دێتەوە کە بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین بە عەرەبان دەچوێنراین لەلایەن ئەوانەی پێستیان سپی بوو و خەڵکی باکور و سەرسنوور بوون، باوەڕیان بەو دەنگۆیانە نەدەکرد. هەروەها ئەوەشمان بیر هاتەوە کەوا لە دوای داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن سۆڤیەتەوە و بە لێشاو ئەفغانی کۆچیان بۆ ئێران کرد، هەموو جۆرە تاوان و خراپەکارییەک دەخرایە پاڵ ئەفغانییەکان.

پاشان، نزیکەی دوو ساڵ دواتر، "بەکرێگیراوان" لەلایەن قەزافییەوە بەکار هێنران بۆ سەرکوتکرنی راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی کە سەری لە لیبیا نابوو، دەگوترا گوایە ئەو بەکرێگیراوانە ئەفریقین. کەناڵی جەزیرە بڵاوی کردەوە: "لە کاتێکدا وڵاتان هاووڵاتییانی خۆیان لە لیبیا دەگەڕێننەوە لەبەر دۆخی نالەباری ئەوێ، گەلێ کرێکاری کۆچکردووی ئەفریقی لە لیبیا لەژێر مەترسیدا دان چونکە تۆمەتبار کراون بەوەی لەلایەن قەزافییەوە بەکرێ گیرابن بۆ سەرکوتکردنی خۆپێشاندەران." ڕاپۆرتەکە وردەکاریی زیاتر گوت، "بە دەیان کرێکاری خەڵکی سەبسا‌هارانی ئەفریقی ترسی کوژرانیان هەیە و بە سەتانیش خۆیان شاردووەتەوە، ئاپۆڕەیەکی تووڕەی دژە حکوومەت راوی "بەکرێگیراوە ئەفریقییە رەشەکان دەکەن"، بەپێی شایەتە بەچاودیتەکان."

ئەم مێتافۆرە گەشتەوەرانەی کاری رادیکاڵانەی توندوتیژی، توندوتیژییەک کە هەردەم دەخرێتە پاڵ ئەوانی تر، کەس ناڵێ من وام کرد، بوونە رێگر لە بەردەم راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی سنووربڕ لە خاکەیلی موسڵمان و عەرەبان، ئەمە پاشماوەی قێزەوەنی رەگەزپەرستیی کۆن و چاخی ناوەڕاستی ئەم کولتوورانەیە، بەکارهێنران بۆ ناشیرینکردنی کولتوور و دواتر داگیرکاریی ئەوروپا ئەو هەلەی قۆستەوە و زیاتر بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی بەکاری هێنان، ئێستە گەڕاوەتەوە بۆ ناشیرینکردن و کپکردنی ماقووڵترین و باشترین ساتەکانی راپەڕینگەلی جەماوەری لە دژی

ستەمکاری ناوخۆ و بالادەستیی بیانی. مانیفێستۆکانی ئەم ڕەگەزپەرستییە فرە لایەن کرا بوون و هەر تەنێ سنووردار نەکران بە ساتی شۆڕشگێڕیی خۆپێشاندەرانی سەر شەقام یان چالاکییەکانی سەر ئینتەرنێت کە بکەرانیان نادیار بوون. زۆر باش ئەم مانیفێستۆیانەیان بردە ئەوپەڕی شرۆڤەکاری و بەکاریان هێنان بۆ کاری بەئەنقەستی قێزەوەن. ناساندنی ڕەگەزپەرستیی "عەرەبان" لەنێو ئامێرگەلی تەناهیی کۆماری ئیسلامی لەلایەن هەندێ چالاکوانی دیموکراتی ئێرانی ڕەنگی دایەوە لەلایەن چەند ڕۆشنبیرێکی پێشەنگی گشتیی عەرەبی کە دەهاتنە سەر شاشە و مافەیلی مەدەنیی ڕاپەڕینیان لە ئێران ڕەت دەکردەوە و بە پیلانی ئەمەریکا و ئیسرائیلیان دەزانی و دەشیانگوت سعوودیە پارەکەی دەدا، پاشان یەکسانیان کرد لەگەڵ "شۆڕشی سیدار" لە لبنان. ئەم جۆرە قسانە پاشان لە ناخەوەڕا دەنگیان دایەوە، تەنانەت گەورەش کرانەوە، لەلایەن هەندێ چالاکوانی ئێرانی، کە گاڵتەیان بە شۆڕشەکانی تونس میسر دەکرد، ڕەتیان دەکردەوە و بە "کودەتایەکی سەربازیی شکۆمەن"یان دادەنا، یان بە پێکەنینەوە دەیانگوت عەرەبەکان ئێستە ئەو کارە دەکەن کە ئێمە پێش سی ساڵ کردمان، بۆیە پێیان وابوو عەرەب سی ساڵ لەپاش ئەوانەوەن.

ئەم بارنە داخراوەی ڕەگەزپەرستی خۆی خۆی پێ گەیاند، خانە چرووپرەکانی بەسەر تەواوی جەستەی سیاسیی نەتەوەکاندا و ناشنالیزمی ئیسلامییاندا بڵاو بووەتەوە. ڕەگ و ڕیشەی ڕەگەزپەرستی، کە ئێرانی و عەرەب بە یەکتری دەفرۆشنەوە و پێکەوەش لە دژی ئەفریقییە ڕەشەکان بەکاری دێنن، ڕەگێکی قووڵە و تژییە لە کێشە. لایەنی ئەم جۆرە پرسانە ئاماژە دەکەن بە پێویستیی ڕزگاریبوونێکی سەرتاسەری لە ڕەگ و داوی ڕەگەزپەرستی کە چوونەتە نێو بارنەی بەئەقڵانیکردنی توندوتیژی. لەلای عەرەبان، وەک جۆزیف مەساد لە کتێبەکەی بەناوی "عارەبە ئارەزوودارەکان، ٢٠٠٧"دا باسی دەکا، لە ڕووی ناشنالیزمی عەرەبییەوە، ڕەوتی "فارسی"

بەشێوەیەکی سیستماتیکی بەئەقڵانی کرا و خرایە وەبەرهێنان بۆ هەموو جۆرە گەندەڵییەکی ئەخلاقی و نەخوازراو و گەندەڵیی سێکسبازی، بۆیە دەماری پیاوانە و هەستی راست و رەوانی بۆ عەرەبان دروست کرا. قسەکانی مەساد بەهۆی هەڵپەی بزووتنەوەی سەوز لە ئێران باویان نەما و بەسەرچوون، چونکە قسەیەکی تر هاتە ئاراوە گوایە ئێرانییەکان هەستی فێمینیان تێدا زیاترە و ژنانین، زۆر جوانن، زۆر لاوازن، هێندە بۆرژوازین بەکەڵکی راپەڕین نایەن، کەواتە، وەک ئافرەتان، پێویستیان بە یارمەتیی دەسەڵاتێکی سەروەوە. ئیمپریالیزم، بەشبەحاڵی خۆی، دەسەڵاتێکی راستەقینە بوو، بۆیە هەر ئەو پیاوانە و نێرانەیە. شۆڕشەکانیش دەسەڵاتێکی راستەقینەن، کەواتە ئەوانیش نێرینەن. لە کاتێکدا بزووتنەوەی سەوزی ئێران بە ژنانی و فێمنین دانران بەهۆی باسکردنیان بە لاواز، پڕ خەوش و لەلایەن "رۆژئاوا"وە داگیر کراون، شۆڕشەیلی تونسی و میسری هاتنە وەسفکردن وەک نێرینەیەکی بەهێزی ناشنالیزمی عەرەبی. ترس و نیگەرانی و تۆقین لە نێرینەیی ناشنالیزمی عەرەبی، بۆ درێژکردنەوەی قسەکانی جۆزیف مەساد، زۆر ستایش کراوە بە بەراورد لەگەڵ وەسفکردنی بزووتنەوەی سەوز وەک شتێکی مێیینە، نەرم، چینی مامناوەند، بۆرژوازی و لە سەروو هەموویشیانەوە، گوایە هەموویان پێویستیان بە هاوکاریی دەسەڵاتێکی سەروو هەیە.

کێشەی تەندروستیی رەگەزپەرستیی ئێرانی مێژوویەکی جیاوازی هەیە. تژی و دەورەدراوە بە دووانەیی و دەسەڵاتی رەگەزپەرستیی ئارییایی، چەند بەشێکی دانیشتوانی ئێرانی، زۆربەیان پاشایین لە پێگە و هەڵوێستی سیاسیاندا، وا باوەڕ و قەناعەتیان پێ کراوە کەوا ئەوان دوورگەیەکن ساف لە ئارییایی، بەڵام بەداخەوە بە دەریایەک لە بنەچەی دژە سامی دەور دراون، ئەمەش واتە، ئەوان ژیانیان لێ تێکچووە لەبەر داگیرکردنی عەرەب و موسڵمانان، پێویستیان بە لکاندنەوە هەیە بە رەگی ئەورووپی لە "رۆژئاوا" بۆ

وەرگرتنەوەی دەسەڵات و شکۆمەندی. لەسەر بنچینەی دۆرانی مێژوویی ئیمپراتۆری ساسانییەکان (٢٢٤-٦٥١) بەهۆی سوپای داگیرکاری عەرەبان لە شەڕی قادسیە (٦٣٦)، بەتایبەتی، ئەم ترۆما نیشتمانییە هەردەم بە خراپترین جۆری خێونفۆبیادا لەناو بیری ئەواندا چنراوە. هەر تەنێ عەرەب نین، بگرە تورک و مەغۆلەکانیش، لەسەر بنچینەی داگیرکارییە یەک بەدوای یەکەکانی ئێران لە سەدەی حەفت و هەشتەوە، بوونە ئاوێنەی رەگەزپەرستیی ئێرانی. مانیفیستۆی ناوەخۆی ئەم رەگەزپەرستییە بۆچوونێکی پاشەکشەیی و دژوارە بۆ فارسە لووتبەرزەکان بۆ کەمینەکانی وەک کورد، ئازەری و بەلوچی. رەگەزپەرستیی دەرەکی و ناوەکی پێکەوە دێن جۆرە رەگەزپەرستییەکی فارسی دروست دەکەن کە دواتر دەبێتە ئاوێنە و سەرچاوەی داهێنانی رەگەزپەرستیی عەرەبان. دووانەی فارس/عەرەب، رەگی داکوتاوە لە مێژووی چاخی ناوەڕاست و سەردەمی داگیرکاری، لە بەرامبەردا دەبێتە میتافۆرێکی سەربەخۆ و خۆی نانی خۆی دەدا و گەورە دەبێ.

لەسەر بنچینەی ئەم کارە دووانەییەی رەگەزپەرستی و دەمارگیری، پرۆژە سیاسییە ناشنالیستییەکان ئامازکە و هەوێنی کارەساتباری مێژووی پۆستکۆلۆنیالی بوون لە ماوەی سەدەی بووریدا. ئێرانچییەتی رکابەریی دەکرد لەگەڵ تورکچییەتی لە ئاسیای ناوەڕاست و بووە هۆی دروستبوونی عەرەبچییەتی لە رۆئاوا و ئەفریقیای باکور، کارەساتی تێکەڵەی ئەمانە، لە کاتێکدا هەموویان یەکن لە دژی رۆئاوا و هاوکاتیش هاوکار بوون لە دروستکردنی، پێکەوە دێن کار دەکەن و دژی ئەفریقییە رەشەکاندا دەوەستنەوە.

حەز و ئارەزووی بەرەگەزپەرستیکردنی راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی سنووربڕ رۆڵێکی سیستماتیکی هەبوو لەو مێژووە نابەجێیە، شتێکە لە هیچ شوێنێک باسی ناکرێ، شۆڕشگێڕەکان بەدوای کڵاوی بابردوو دەکەون

ئەگەر بیتو وابزانن ئازاد کراون. هەروەک رۆژنامەنووس و فیلمسازی زیمبابۆیی فەراری سیڤینزۆ دەڵێ:

> لە توندوتیژیی دوو هەفتەی رابردوودا (ناوەڕاستی شوباتی ۲۰۱۱ لە لیبیا)، پێوەندیی عەقید (قەزافی) بە ئەفریقیاوە تەنیا خزمەتی دووبارە داگیرساندنەوەی رەگەزپەرستیی رەگدرێژی کردووە لە نێوان عەرەب و ئەفریقییە رەشەکان. هەروەک چەند بەکرێگیراوێک، لە چاد و مالی، بۆی جەنگان، ژیانی ملیۆنان پەناهەندەی ئەفریقی و هەزاران کرێکاری پەنابەری ئەفریقی دەکەوێتە ژێر هەڕەشەی کوشتن تەنێ لەبەرئەوەی بەوانە دەچن بۆ قەزافی شەڕ دەکەن.

فەراری سیڤینزۆر ئەوەش دەڵێ: "کرێکارێکی تورک بە بی بی سی گوت: "ئێمە ۷۰-۸۰ کەسمان هەبوو بۆ کۆمپانیاکەمان لە چاد کاریان دەکرد. بە داس و تەور پارچە پارچە کران، هێرشبەران دەیانگوت: "ئێوە سەرباز دەدەنە قەزافی." سودانییەکانیش دەکوژران. ئێمە بۆ خۆمان ئەوەمان بینی." ئەم مانیفێستۆ دڕندانەی رەگەزپەرستی و توندوتیژی ناکرێ هۆکارێک بێ بۆچی بە ملیۆنان کەس لە سەنیگال بۆ جیبۆتی، لە مەغریبەوە تا ئەفغانستان، لە ئێرانەوە تا یەمەن خەونیان بە رۆژی باشترەوە دەبینی بۆ منداڵەکانیان. بەڵام ئەو راستییەکەی کە ئەم بڵاو کرایەوە، گفتوگۆی لەسەر کرا، رەخنەی لێ گیرا، لکێنرا بە پرسی رزگاریخوازی، هەموو ئەمانە لایەنی گرینگی بەهاری عەرەبین.

توندوتیژیی رەگەزپەرستی دوایەمین کار و پاشماوەی رەگەزپەرستیی داگیرکاری بوو، کە تەنێ زۆر ئاشنا بوو بەلای رۆمەکان و، پاشان بەلای کۆماری فەرەنسا، لۆجیکی "لەت کە و داگیر کە"، یان "لەت کە و حوکم کە" تەرازوویەک بوو کە دواجار تەواو کرا لەلایەن ماکیاڤیللی لە کتێبەکەی

بەناوی "هونەری جەنگ، ١٥٢٠". تۆماری تاوانکاریی داگیرکاریی ئەوروپی لە ئاسیا و ئەفریقیا تژییە لە نموونە و ستراتیجی ناپاکی. ئەڵمانیا و بەلجیکا، هەردووکیان، تەرازووەکە زۆر بەباشی لە رواندا بەکار دێنن بەهۆی تەعینکردنی کەمینەی توتسی لە پۆستەکانی دەسەڵات. گرووپەیلی توتسی و هوتو لە رووی رەگەزییەوە دروست کرانەوە، دڕندایەتییەک بوو لە ناوجەرگەی جینۆسایدی رواندا بوو. بەریتانییەکان کارێکی هاوشێوەی ئەمەیان کرد لە کاتی داگیرکاریدا کاتێ حوکمی سودانیان کرد و لە پشتی لەتکردنی باکور و باشووردا بوون، کە لە بەرابەردا ئەمە شەڕی ناوخۆی سودانی لێ کەوتەوە. مێژووی داگیرکاریی وڵاتانی تری ئەفریقی نموونەی هاوشێوەی لەتکردنی تێدایە، بەهەمان شێوە مێژووی ئاسیا، هەر دوور نەڕۆین، ئەوە هیندستان کاتێ بەریتانییەکان نەک هەر تەنیا دەستیان وەردا لە سیستمی کۆمەڵایەتی و چینایەتی بۆ سوود و مەرامی داگیرکارییانەیان، بگرە ئاگری دوژمنایەتیی نێوان موسڵمان و هیندۆسەکانیان خۆش کرد، کە دواجار بووە هۆی لەتکردنێکی کارەساتباری هیندستان و پاکستان بە درێژاییی هێڵە ئاینییەکانیان.

ئەوە ئێمی سیزار بوو کە لە کتێبەکەی بەناوی "قسەیەک لەسەر کۆلۆنیالیزم، ١٩٥٥"دا بەشێوەیەکی سیستماتیکی بیری لە لینکی نێوان رەگەزپەرستی و کۆلۆنیالیزمدا کردەوە و هەردوویان بەیەکەوە گرێ دا بۆ سەرهەڵدانی فاشیزم و نازیسم لە ناوجەرگەی ئەوروپا. داگیرکاری و رەگەزپەرستی دوو هۆکاری یەککگر بوون بۆ کارکردنی سەرمایەداری، سیزار وا دەڵێ، هەروەها نیشانەیەک بوون بۆ "دووڕوویی" سەرمایەداری و رۆژئاوا. ئەو شتەی پێی دەگوترێ ئەرکی مەدەنییانە دەمامکێک بوو بۆ قۆستنەوەی سیستماتیکییانە، بووە هۆی بەکارهێنانی توندوتیژی، رک و رەگەزپەرستی، ئەمەش شەڕانگێزییەکی جیهانیی دروست کرد. سیزار پێشنیاز دەکا کەوا داگیرکاری مرۆڤی کردە ئامێر و کەرەستەی خاوی بەرهەم. فرەنسییەکان لە

ئەفریقیا، بەریتانییەکان لە ئاسیا، ئیسپانییەکان لە ئەمەریکای لاتین، دواتریش ئەمەریکا لە تەواوی جیهان، هەموویان لەو کارەدا بەشدار بوون: کاری بەشتکردنی مرۆڤ. ئەوەی دەکرێ و دەگوترێ لەلایەن سەرمایەداری بۆ لەتکردن و بڵاوکردنەوەی رەگەزپەرستییە، ئەگینا گاڵتەکردنە بە رەگەزپەرستی لەسەر بنچینەی ئەوەی کەوا داگیر کراوە.

لەودیو گەیشتن بە ناپاکیی کۆلۆنیالی و ئیمپریالی، عەرەبەکان و موسڵمانان چارەنووسیان وابوو خۆیان لەگەڵ مێژوودا نوێ بکەنەوە. شۆڕشەکانی ئەمڕۆ توخمگەلی رەگەزپەرستیی عەرەبچییەتی ناهێڵن، هی تورکچییەتی و چوارچێوەی هاوشێوەی ئەمانە، ئێمە دەگەڕێینەوە ئەو شوێنەی کە دووسەت ساڵ پێش ئێستە لێی بووین. هەروەها هەموو قوربانییە پاڵەوانییەکان بەهەدەر چوون و بێهوودە بوون. بەڵام، ئەوەی نوێی عەرەب، ئێرانی و ئەفغانی ئێستە بەزمانێکی تەواو جیاواز قسە دەکەن. هاریکاریی سنووربڕی بەهاری عەرەبی هەوێنی راپەڕینەکە بووە و هەر بەخۆشکردنی ئاگری ئەو راپەڕینە دەمێنێتەوە لەو چەند ساڵەی دابێ. بۆ نموونە، لە کاردانەوەیان بۆ هەستی دژە عەرەب لە بزووتنەوەی سەوز، چالاکوانان چەند وتارێکیان نووسی لەبارەی حەنزەڵەی کارەکتەری هونەرمەندی فەڵەستینی ناجی عەلییەوە، هێندەی پێ نەچوو پاڵەوانی کارتۆنی فەڵەستینی بەخۆ و لەچێکی سەوز دەرکەوت و وەگەر خۆپێشاندەران کەوت بوو لە تاران، هەروەها لەو رۆژەی موبارەک لە ئۆفیسەکەی رۆیشت، یەکەم گەنجی میسری دیمانە کرا لەلایەن بی بی سی هاریکاریی خۆی دەربڕی بۆ هاوشانە ئێرانییەکانی، هەروەها گوتی ئێستە نۆرەی ئێرانە، ئەم هەڵوێستە پشتگیریی لێ کرا لەلایەن وائیل غەنوم، چالاکوانی گەنجی میسری سەر ئینتەرنێت، کە، پەڕێیەکی سەوزی لە قۆڵی خۆی بەستبوو لە گردبوونەوەکانی لە گۆڕەپانی تەحریر. ئەو گوتی خۆشحاڵ بووە بەوەی ئێرانییەکان ئەمەیان بە هاریکاری زانیوە بۆ پرسەکەی خۆیان.

له بناخـەی ئابووری بۆ ئارەزووی سیـاسییـان، راپەڕینگەلی شـۆڕشگێڕی سکێچی سـەرەتایی ئەتڵەسێکی تەواو نوێی ئەگەرەکانی مرۆیی بوو، لەودیو دەستی توندوتیژیی رەگەزپەرستی، تێوەگلانی جێندەر و لەتکردنی چینەکان.

رەگەزپەرستی لە گۆشەگیریدا کار ناکا. لە بنەوە گرێ دراوە بە جێندەر و چین. پێگەی جێندەری لە بۆچوونی رەگەزپەرستی و داگیرکاری باش شرۆڤە کراوە لـە دیراسە نایابەکەی ئاشیس ناندی بەناوی "دوژمنی ناومخۆ: دۆڕان و چاکبوونەوەی خود لەژێر سایەی داگیرکاری، ١٩٨٩" کە تێیدا ئەوە پێشان دەدا چۆن داگیرکەران بەشێوەیەکی کاریگەر دزە دەکەنە ناو بیر و ویژدانی ژێردەسـتـە و تێکیـان دەدەن. ئەو دەڵێ: "ئابووریی سـیـاسیـی داگیـرکـاری بێگومـان گـرینگە، بـەڵام، دڕندایـەتی و دوژمنـایەتیی داگـیـرکـاری تەواو وەدەردەکەوێ لە دەروونزانی، تا ئەو رادەیـەی کە بەشێوەیەک دێتە دەربڕین بۆ وەسـفکردنـی بیـری ژێردەسـتـە، کـە خـۆیـان بەسـیـاسی کـراون لەوەتەی هـاتنی داگـیـرکـاریی مـۆدێرنیـزم بۆ نێـو دیمەنـی جـیـهـانی، ناو بـازنەی دەروونزانـیی سـیـاسی." ئەم گـۆڕینی ویژدان و هۆشـیـارییـە بێگومـان دەوەسـتێـتە سـەر بنەمـا مـادییـەکانی دەسـەڵات، بەهۆیانەوە داگیـرکـەر و داگیـرکـراو خـۆیـان بەگرێدراوی یەکـتـری دەزانن. ناندی بـەوردی باسـی ئەو شێوازە دەکا بەهۆیەوە لە کەیسی هیندستاندا رووی دا:

> ئەو گۆڕانەی لە هۆشیاری رووی دا دەکرێ بەکورتی بە زاراوەی سێ چـەمکدا بێـتـە دەربڕین کـە بوونە چەقی داگـیـرکـردنی هیندسـتان: جـەوهـەری نێرینەیی (پوروساتڤا)، جـەوهـەری مێینە (ناریتڤا) و جەوهـەری نێرەموکی (کلیباتڤا).

بەپشتبـەستن بە پێکهاتەگەلی کۆمـەڵایەتی پێش داگیرکاریی سـەربازیی ئەوروپی، باڵادەسـتیی جێندەری بەلۆکالی کـرا، لـەنێو شیـرازەی ئـەخـلاقی هۆشیـاریی داگیـرکراودا نووسرایەوە. ناندی بە وردی بـاسـی ئەوە دەکا چۆن داڕشـتـنەوەی کولـتـووری ئێرانی لـە راسـتـیدا لەلایەن کـۆمـەڵێک نـووسـەری

پێشەنگی هیندی نمایش کرا کە وێڵبوون بەدوای دووبارە هەڵسەنگاندنی نەریتگەلی هیندو لە رێی هەڵکردنی لەگەڵ چەمکەیلی مۆدێرن، ئاساییبوون بەرامبەر نائاساییبوون، پێنەگەیشتوو، سەرەتایی و منداڵانە. ئەم نووسەرانە:

هەوڵیان دا چەمکی نێرینە و مێیینەی رۆئاوا بخەنە ناو بۆچوونی جیهانیی هیندی، لەگەڵ رەهەندی گەورە و منداڵ، بۆ دروستکردنی بوونێکی رۆئاوایی لەنێو هیندستان بەشێوەیەک کە سروشتی بێ، وەک ئەوە وا بێ رۆئاوا بەراستی هاتبێتە ناو هیندستان. بەلای گەلێ هیندییەوە، ئەمە لایەنی زۆر بەهاداری کولتووری هیندی بوو.

باڵادەستیی داگیرکاری یەکسەر کرا بەپرسی رەگەزپەرستی و جێندەری، کە تەواو پشت دەبەستن بە مەرجەیلی تازەی ئەم سەردەمە، کە دووبارە بەکار دەهێنرێنەوە بۆ سوودی باڵادەستیی داگیرکاری. هەر تەواو لەو سۆنگەوەیە، سیفەتگەلی لۆکال و نەریتگەلی داگیرکەر دانوویان پێکەوە دەکوڵێ، کەوا بەهاری عەرەبی یەکێ لە گۆڕانە هەرە بنەڕەتییەکانی خۆی بینی: واتە، گۆڕان لە تێڕوانین لە بۆچوونی جیهانی لەمەڕ ئافرەتی موسڵمان و عەرەب.

## جێندەر

ئەگەر دەتوانی، وێنەی ئافرەتی موسڵمان بێنەوە یادت کە لەلایەن ئەمەریکا و ئەورووپا وەک ئیسلامۆفۆبیا دروست کرا و هەروەها چۆن کەسانی خۆیان قسەیان لەسەر دەکردن: بێ کەڵک، نەرم و فێرکراو، لەنێو ئاینێکی داپڵۆسێنەردا داخراون، بێبەش کراون لە فەزای گشتی. رەوانەی شوێنە شاراوەکان کراون تا رۆمانی "لۆلیتا" بخوێننەوە لە تاران لە کاتێکدا چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد لەلایەن مارێنزی ئەمەریکی بێنە رزگارکردن،

هەروەها ئەو بێ میشکییەی کە وای کرد ئەو وێنەیە ببێتە پڕفرۆشترین کاری نیشتمانیی جۆرج دەبلیو بوش لە ئەمەریکای باکور و هی تۆنی بلێر و سیلڤیۆ بەرلسکۆنی لە ئەوروپا. دەڵێن دوایە بەشدارییان لە گردبوونەوەی نهێنی کردووە کاتێ پێوەندییان کرد بە نارەزاییگەلی سیاسی. بەهەموو شێوەیەک لەنێو قەفەس پێشان دران، بێهیوایانە لەودیو شیشەکانەوە تەماشای دەرەوەیان دەکرد، هەروەها ئەمە هەمان شێوەیە لەلایەن سکۆلەران و وەشانکارانی دیراسەیلی ئافرەتان و وەشانکارانی بیرەوەریی ساختەی شازادەکانی عەرەب و کوشتن لەسەر شەرەف. هەتا کاتێ بە ملیۆن لە ئێران دەهاتنە دەرەوە بۆ بەشداریکردن لە گردبوونەوەی گشتی، هێشتا هەندێک هەبوون لەنێو عەرەبان، ئێرانییان و شەپی ئەمەریکا باکور گاڵتەیان بە جلیان دەکردن، بە چاویلکە و لەچکیان، پرستی ئەوەیان نەبوو کەوا خوشکانیان خەریک بوو پێوەندییان پێوە بکەن لەوسەری جیهانی موسڵمانان و عەرەبان تا ئەوسەری.

ئێستە وێنەگەلی ئەو ئافرەتانە بێنە بەرچاوت کە گاڵتە بە شتە سەیرەکان دەکەن، بە شتی بیانی و ناوەخۆیی، سووکایەتی بە ستەمکاری ناوەخۆ و سەپێنراو دەکەن، لە نزیکەوە سەیریان بکە. نیوەیان رێیان پێ نادرێ ئازادانە جلی خۆیان هەڵبژێرن لەوسەری ئەوروپاوە تا ئەوسەری، بەتایبەتی ئەوانەی حیجاب هەڵدەبژێرن و لە فەرەنسا، ئەڵمانیا یان هۆڵەندا دەژین، رەگەزپەرستێکی هەسیتار و بکوژانی خەڵکی ئەوروپی وەک ئاندرێ بەهرینگ بریڤیک تووڕە دەکەن. ئەم ئافرەتانە مافی هاووڵاتیبوونیان لە ئەوروپا پێ نادرێ و بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە بەرەی پێشەوەی شۆڕشگەلی مێژوویین لە جیهانی موسڵمان و عەرەبان. ئەمە تەنێ بەسە پێمان بڵێ ئەمرۆ جیهان لە کوێوەیە، بەرەو کوێش دەڕوا. ناومی وۆڵف، چالاکوانی سیاسی و رەخنەگری کۆمەڵایەتیی ئەمەریکایی لە وتارێکی بۆ جەزیرە دەڵێ: "زۆر بیر و بۆچوونی چەسپاوی رۆژئاوا هەیە لەبارەی وڵاتانی موسڵمانانەوە،

ئاخۆ ئەمانە لەبارەی ئافرەتانی موسڵمانیشن: بەرائەت لە چاویان دەباری، لەچکبەسەر، چەوسێنراو، تا سەر ئێسک بێدەنگ، رەفتاری سەیری رەنگدانەوەی خەیاڵیان، لەودیو رۆڵی جێندەرییەوە داخراون." پاشان بەشێوەیەکی رەوانبێژی دەپرسێ: "باشە ئەو ئافرەتانە لە کوێ بوون لە تونس و میسر؟ وەڵامەکەی ئەمەیە:

لە هەردوو وڵاتدا، خۆپێشاندەرانی ئافرەت هیچ شتێک نەبوون وەک ئەوەی رۆژئاوا بیریانی لێ دەکردەوە: لە بەرەی پێشەوە و ناوەڕاستدا بوون، لە هەواڵ، لە فەیسبووک، تەنانەت لە سەرکردایەتیشدا بوون. لە گۆڕەپانی تەحریری میسر، ئارەزوومەندانی ئافرەتان، هەندێکیان منداڵیشیان پێ بوو، دڵسۆزانە کاریان کرد بۆ هاوکاریکردنی خۆپێشاندانەکان، لە تەناهی، گەیاندن و پەناگە یارمەتییان پێشکێش دەکرد. گەلێ لایەن ژمارەیەکی ئێجگار زۆر ئافرەت و منداڵیان لە خۆپێشاندانە بەئاشتییەکان تۆمار کرد و زۆریش پێی سەرسام بوون.

ناومی وۆڵف ئەوەش دەڵێ کەوا لە ماوەی راپەڕینگەلی شۆڕشگێری ئافرەت چەقی کارەکە بوون و:

نەک هەر تەنیا هاوکار، بگرە رۆڵی سەرەکییان هەبوو لە بزووتنەوەی نارەزایییەکان، لەوانەی شەستەکان تا گردبوونەوەکانی قوتابیان لە شانشینی یەکگرتوو. ئافرەتی میسریش رووداوەکانی رێک خست، ستراتیجی بۆ دانا و گەیاندی. بلۆگەرانی وەک لەیلا زەهرا مورتەزا ژیانی خۆیان خستە مەترسیی گەورە تا بەنوێترین زانیاری رۆژانە لەبارەی دیمەنەکانی گۆڕەپانی تەحریر و شوێنەکانی ترەوە بەجیهان

بڵێن. زۆر شت لە جیهانی موسڵمان و عەرەبان روویان دا و لە دنیا کەس باسی نەکرد و کەسیش نەیزانی. شت و گۆڕانی هەرە گەورە لەنێو ئەمانەدا بوونی ئافرەت بوو بە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە هێزی کار و خوێندنی باڵا. هەروەک وۆلف دەڵێ:

گەورەترین گۆڕان پەروەردەییە. دوو نەوە پێشتر، تەنێ کەمینەیەکی بچووکی کچانی بژاردە دەچوونە زانکۆ و بڕوانامەیان وەردەگرت. ئەمڕۆکە، ئافرەت نیوەی قوتابیانی زانکۆکانی میسر پێک دێنن. رادەهێنرێن لەسەر بەکارهێنانی دەسەڵات بە شێوەیەک کەوا داپیرەکانیان زۆر بە کەمی خەیاڵیشیان بۆی چووە: بڵاوکردنەوەی رۆژنامە، وەک ئەوەی سەنعا سەیف کردی، بەرەنگاربوونەوەی سیستمی حکوومەت بۆ خلاسکردنی شتی بێ مانا، کامین بۆ پێگەی قوتابیان لە پۆستی بەرزدا، بۆ رێکخراوگەلی قوتابیان و بەڕێوەبردنی کۆبوونەوەگەل.

لەسەر بچنینەی ئەو سەرنجانە و گۆڕانەکان لە رەوشی ئافرەتان و دەسکەوتەکانیان، ئەوەی بینیمان گۆڕانێکی مێژوویی بوو کەوا وا لە ناومی وۆلف دەکا بەراوردی بکا لەگەڵ گۆڕانە سەرەکییەکانی تری مێژوو:

کاتێ فەڕەنسا دەستی کرد بە یاخیبوون لە ١٧٨٩، ماری وۆلستنکراف، کە گیرابوو لە کاتی بینینی، مانیفێستۆی خۆی نووسی بۆ ئازادیخوازیی ئافرەتان. دوای ئەوەی ئافرەتانی رۆشنبیر لە ئەمەریکا هاوکار بوون لە شەڕی هەڵوەشاندنەوەی کۆیلایەتی، دەنگدانی ئافرەتانیان خستە سەر کارنامەکانیان. دوای ئەوەی لە شەستەکان پێیان گوترا کەوا پێگەی لە بزووتنەوە روو لە کزییە، هەستان بە وەشاندنی شەپۆلی دووەمی فێمینیزم، بزووتنەوەیەک بوو لە ئاکامی بەهرەی نوێ و تووڕەبوونی ئافرەتانەوە بوو لەدایک.

ئەنجامەکەی:

لەبەرئەوەی فێمینیزم درێژکراوە و تەواوکەری لۆکالانەی دیموکراسییە، دیکتاتۆرەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕووبەڕووی حاڵەتێک دەبنەوە تێیدا تەقریبەن مەحاڵە وا لەو ئافرەتە چاوکراوانە بکەیت بوەستن لە شەڕ لە پێناو ئازادی، بۆ خۆیان و بۆ کۆمەڵگەیان.

ئافرەت هەروا بە ئاسانی نەهاتنە سەر شەقام و بەدیار نەکەوتن. ئەو شەڕەی لەسەر تیرۆر، لەسەر بنچینەی تەواوی مێژووی ئۆریەنتالیزم بوو، وێنەیەکی خراپی دروست کرد بۆ ئافرەتانی جیهانی موسڵمان و عەرەبان، چاوەڕێیان دەکرد لەلایەن سوپای ئەمەریکا بێنە رزگارکردن، وەک چۆن لە عێراق و ئەفغانستان هاتنە رزگارکردن، ئەمە کێشەی ئەوان نەبوو. ئەمە ناپاکیی ئەو پڕوپاگەندانەیە کەوا زوڕنایان بۆ لێ دەدرێ لەلایەن هەلخواز و چەلاوخۆرەکان. عەرەب و موسڵمان ژیانیان کەوتە مەترسییەوە بۆ ئازادییان بە شێوەیەک کەوا جیهان خۆی بۆ ئەمە ئامادە نەکردبوو ببینێ. بێگومان باجێکی قورسیان دا بۆ کارگەلی قارەمانانەیان. هەروەک ئیلیزابێس فلۆک لە کتێبەکەی بەناوی "ئافرەت لە بەهاری عەرەبی: دیوەکەی تری مێژوو"دا دەڵێ:

زۆر شت نووسراوە لەبارەی ئەو ئافرەتانەی خۆپێشاندانیان کردووە، رێک خستووە، بلۆگیان کردووە، مانیان گرتووە لە تەواوی جیهانی عەرەبیدا. رۆژنامەیەکی ئۆپۆزیسیۆن لە لیبیا بەم دواییانە سەردێری یەکێ لە چیرۆکەکانی لەبارەی رۆڵی ئافرەتانەوە بوو کە لە راپەڕینەکاندا بینییان. ئەمە سەردێرەکەیە: "ئەو موسڵمانە، دایکە، سەربازە، خۆپێشاندەرە، رۆژنامەوانە، خۆبەخشە، هاوولاتییە." بەڵام بەشەکی تری چیرۆکەکە باسی

ئەو ئازارانە دەکــا ئـافــرەت بـەرگــەی گــرتـوون وەک گــرتـن، بەزۆرگایین و کەمیی بەرزنرخاندنی رۆڵیان لە خۆپێشاندانەکان.

ئافرەت هەر تەنیا لە بەرەی پێشـەوەی راپەڕینگەلی شـۆڕشگێڕی نەبوون. بگرە قـوربانیی یـەکەم و هـەرە گـرینگ بـوون، یەکەم نیشـانەی داپڵـۆسـینی درندانەی ئـەوانە بـوون کــە لە دەســەڵاتدا بوون و دژی راپـەڕین کــردیـان. دووبارە گـردبوونەوە: بۆ نمـوونە، لە ســووریا، زۆرەگێ و پەلامـارەیلی تر بۆ سـەر ئافرەت زیادی کردووە لە مـاوەی چەند مـانگی رابردوودا. ئەمـەش واتە هەڵکشـانی توندوتیـژی لەلایەن حکوومـەت و هاوپەیمـانانی. زۆرەگـێکردنی ئافرەت وەک تاکتیکی چەوسـاندنەوە و سـەرکوتکردن هـەر تەنیا لە سـووریا رووی نەدا: لە لیبیا، چیرۆکی هاوشـێوەی ئەو زۆرەگێییە وەک چەکێک بەکار هات و رۆڵی خـۆی بینـی. لێکۆڵینەوەیەک لەلایەن دادگەی نێودەوڵەتیی تاوان لە سـەرەتای حوزەیران بەڵگەی دۆزیـەوە کەوا مـوعەممەر قـەزافی سـەرۆکی لیبیا فەرمانی کرد بە زۆرەگێی بەکۆمەڵ.

ئەم رۆڵە شـۆڕشگێڕانەی ئافرەتان شـتێک نەبوو تـازە، یان پێشـتـر رووی نەدابێ. لە وتارێکی نایابدا بەناوی "نیشـتمـان"، جوان کۆڵ و شـاهـین کۆڵ لە سیاقێکی مێژووییدا دەڵێن:

با لە تونسـەوە دەست پێ بکەین، راسـتییـەکـەی، ئافرەت لە تونس هـەردەم لە بەرەی پێـشـەوەی بزووتنـەوەیەلی نارەزایی و گـۆڕانـی کـۆمـەڵایەتیدا بوون لەوەتەی شـالاوەکەی لە پێنـاو سـەربەخـۆیـی لە جنگی فـەڕەنسـا لە کـۆتاییی چلەکان. ئافرەتی تونسـی رێژەی خوێندەوارییان بەرزە (سەتا ٧١)، واتە یەک لەسـەر پێنجی مووچەخـۆرانی وڵات پێک دێـنن، هـەروەهـا سـەتا ٤٣ی نزیکەی نیــو ملیــۆن ئەندامـگەلی هـەژدە یەکــەتیی لۆکــال پێـک دێنن. زۆربـەی ئەو یەکــەتیــیــانـەی ئافــرەتان کـــار لەم بوارانەدا دەکــەن: پەروەردە، چنین، تەندروسـتـی، خزمـەتگوزاریی شـار و پیشـەسـازیی گەشـتـەوەری. یەکـەتیی

گشتیی کرێکارانی تونس (ناوە فرەنسییەکەی: UGTT) بەردەوام لە ململانەدا بووە لەگەڵ پیاوی هەرە بەهێزی تونس، زینەلعابدین بن عەلی، بۆیە بەم شێوەیە پلە و فایلەکەی لەسەر شەقام لەلایەن خۆپێشاندەران بەگۆڕێوە کرا. ئەمڕۆکە، UGTT بەردەوام لە پاڵەپەستۆخستنە سەر ئەو حکوومەتەی دامەزرا دوا فرینی بن عەلی، بۆ ئەوەی حکوومەتێک بێ تژی بێ لە چاکسازی و وەها بچێتە پێشەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، رەخنەیەکی زۆر لە بوونی ئافرەتدا گیرا لەنێو بزووتنەوەکە: لە ١٥ی نیساندا، عەلی عەبدوڵلا سالحی سەرۆکی هەتاهەتاییی یەمەن گوتی ئافرەت بەشێوەیەکی نابەجێ لە شوێنە گشتییەکان لەگەڵ پیاوان تێکەڵ دەبن، بەتایبەتی لە خۆپێشاندانەکان، پاشان لە پایەتەخت دەرکەوتن، سەنعا، دواتر لە شارەکانی وەک تەیز و عەدن. ئەم کاردانەوەیە وەڵامی ئەو بوونە گەورەیەی ئافرەتان بوو لە فەزای گشتیدا. بەژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە سەرانسەری وڵاتدا دەرکەوتن، تەنانەت لە دەرەوەی شارەکانیش، رۆژ دوای رۆژ، سەرۆکیان تۆمەتبار دەکرد بە لەکەدارکردنی شەرەفیان تەنێ لەبەرئەوەی ئازایانە رەفتاریان کردووە.

ئافرەت تەنیا لە خۆپێشاندانەکان دەرکەوتن، لەگەڵ ئەندامانی خێزانیان، تەنانەت منداڵەکانیشیان هێنابوو لەگەڵ خۆیاندا.

لە سووریا... ئافرەت هێز و ئازایەتیی خۆیان پێشان دا، لە خۆپێشاندانی بەهێز دەرکەوتن، هەندێ جار پیاویان هەر لەگەڵدا نەبوو، تەنێ منداڵەکانیان لەگەڵدا بوو. لە نزیک شارۆکەی بایدە، بۆ نموونە، بە هەزاران ئافرەت هاواریان دەکرد "کەس ناتوانێ سووکمان بکا!" بە درێژاییی شەقامەکە دەرۆیشتن کە تژی بوو لە دارودەستەی دەوڵەت، هەر لەوێ پۆلیسی نهێنیی سەرۆک بەشار ئەسەد کەسوکارە پیاوەکانی ئەو ئافرەتانەی دەسگیر کرد.

هەروەها گردبوونەوەی تەنیا لە ئافرەت لە شوێنی تریشدا زۆر بەرچاو بوون: لە بۆنەی تردا، ئافرەتی سووری ڕێپێوانەی ئافرەتانەیان کردووە بۆ داوای دیموکراسی و گۆڕان لە سیاسەتی ڕێژیمدا. ئەم ئافرەتە شۆڕشگێڕانە بێگومان هەردەم پێشوازییان لێ نەکرا لەلایەن پیاوانی شۆڕشگێڕ:

هێزەیلی پیاوسالاری وەک گرووپەیلی توندڕۆی موسڵمان و پیاوانی ئاینی سوورن لەسەر ئەوەی مافەیلی ئافرەت نابێ فراوان بکرێ لەو چالاکییە سیاسییانەدا. وەک ڕەشەبایەک، کاتێ ٢٠٠ ئافرەتی میانڕۆ لە گۆڕەپانی تەحریر لە ٨ی مارسدا دەرکەوتن بۆ یادی ڕۆژی جیهانیی ئافرەتان، چەندان پیاوی ئاینیی سەربازی هێرشیان کردنە سەر و بەسەریاندا نەڕاندن کە دەبێ بچنەوە ماڵێ و ئوتو بکەن.

کۆڵ و کۆڵ بەرهنگاری ئەو بیرۆکەیە دەبنەوە کەوا ڕاپەڕینگەل دەبنە هۆی خراپترکردنی مافەیلی ئافرەتان. دەڵێن:

بەهاری عەرەبی ماوەی چالاکی و گۆڕانی ئافرەتی سەلماند، ڕۆڵی فێمینیستەکانی سەرەتای بزووتنەوەی میسریی ١٩١٩ەمان بیر دەخەنەوە بۆ سەربەخۆیی لە چنگی بەریتانیا، یان پێگەی گرینگی ئافرەت لە شۆڕشی جەزائیر. ژمارەی زۆری ئافرەتی چالاکوانی سیاسی لەم زنجیرە ڕاپەڕینەدا هێشتا کەمە لە چاو دەرکەوتنیان لە ڕاپەڕینەکانی پێشوودا. واتە ئەم توخمەی ئافرەت لە بەهاری عەرەبی کەوا قسەیان کەمە لە ڕۆژئاوا پێشنیازی ئەوە دەکا کەوا شتەکانی پێش سەردەمی داگیرکاری، ئاین، توندڕۆیی، نەوت و ئیسرائیل، ئێمەیان کوێر کردووە بەرامبەر بەو هێزە گەورە کۆمەڵایەتییانەی کەوا ژیانی ٣٠٠

ملیۆن کەس دەگۆڕن.

هەر بۆ دڵنیابوون، نایەکسانییەکی زۆر بەردەوامە:

> بەهاری عەرەبی لەبارەی یەکسانیی جێندەرییەوە نەبوو. ئافرەتانی هەموو ئەو وڵاتانەی بەشێکن لە بەهارەکە وا دەڵێن. بەڵام گەلێکیان ئاگەدارن بەوەی وێ دەچێ هەوڵ و کۆششیان بخرێتە ژێرپێ، لەوانەیە ئەو پیاوانەی دڵخۆش بوون ئافرەت ببین لەسەر شەقام هاوار بکەن بۆ ئازادی، رەنگە پێیان خۆش نەبێ هەمان ئەو ئافرەتانە لەگەڵیان لە پەرلەمان، حکوومەت و ژوورگەلی بزنسدا ببینن.

بەڵام ئێستە مەیدانی شەڕ هی ئەوانە، هێڵگەلی شەڕیش کێشراون. ئەحدەف سوەیف، رۆمان‌نووسی دیاری ئەنگلۆ-میسری و وتارنووسی سیاسی و کولتووری، بووە دەنگێکی پێشەنگ و رەوان لە ماوەی شۆڕشی میسریدا. بەردەوام بۆ رۆژنامەی "گاردیەن" دەینووسی، سەردانی میسری کرد و بوو بەهێزێک لە گۆڕەپانی تەحریر، بەهەمان شێوەی نوحا رەزوان، مامۆستای عەرەبی و ئەدەبی بەراورد لە زانکۆی کالیفۆرنیا، داڤیس. رەزوان، دایکی دوو منداڵی بچووک، مۆڵەتی وەرگرت لە کالیفۆرنیا و دەستی هەڵگرت لە ئەرکەیلی و چووە قاهیرە، بۆ ئەوەی خۆی لەوێ لە ناوەڕاستی گۆڕەپانی تەحریر بێ، تا شۆڕشەکە تەواو بوو. لەو ماوەیە بۆ رۆژنامەی پێشەنگی شارەکەی بەناوی "دیموکراسی ناو" نووسی. دوای نووسینێکی، هێزەیلی تەناهیی موبارەک دڕندانە پەلاماریان دا. وەک خوشکانیان لە ئێران دوو ساڵ لەمەوبەر، ئافرەتی میسری و عەرەبان ناهێڵن نکووڵی لە مافەکانیان بکرێ.

ئەو خۆشییەی هەستی پێ کرا لەلایەن ئەکادیمی، رۆژنامەوان و چالاکوانانی ئەمەریکی و ئەوروپی کاتێ بینییان ئافرەتی موسڵمان و عەرەب

بە لێشاو ڕژانە سەر شەقام و داوای ئازادیگەلی مەدەنییان کرد، بە تەواوی ئەوە ڕوون دەکاتەوە بۆچی ئەمان حەپەسان چونکە هەردەم ئافرەتی موسڵمان و عەرەبیان لە میدیا بینیوە لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا کە چۆن لاواز و بێهێز پیشان دەدران. بەڵام نابێ ئێستە ڕێ بەو خۆشییەیان بدەین، نابێ وایان لێ بکەین لە کێشە سەرەکییەکەدا دابڕێن و بەهارەکە چەواشە بکەن، ئەوەی ئەوان دەیبینن ئەوەیە ئافرەتی موسڵمان و عەرەب خەبات دەکەن بۆ گۆڕینی مێژووی نیشتمانی و هەرێمییان. ئەو ئافرەتانەی گۆڕەپانی تەحریر و مەیدانی ئازادی، بریکاری چالاکیی ڕووداوگەلی مێژوویی جیهانن، لە هیچەوە پەیدا نەبوون. ئەمان چەندان دەیە و سەدەیە دەنگ و ڕووی فەزای گشتین. کاری بێوچان و ئازایان پێویست بووە تا ئەم ئافرەت و کچانە توانییان ئازایەتیی خۆیان دەربخەن، خەیاڵی خۆیان، لە سەروو هەمووشیانەوە جەربەزەییی خۆیان دەربخەن و بێنە سەر شەقام و داوای مافەیلی خۆیان بکەن. ئەمە تراجیدیای ئەمەریکای باکور و ئەورووپای ڕۆژئاوایە کەوا وەک شتگەلێکی ئۆریەنتاڵ لەم ئافرەتانە تێ دەگەن، لە تەک ئەو مامۆستایەی ئەدەبی ئینگلیزی کە باسی "لۆلیتا"یان بۆ دەکا لە تاران، واتە کاتێ تەواو دەبن لە ئارەزووە سێکسییەکانیان لە گەرماوێکی نزیکیان... ئەم قسە و بۆچوونانە دووانەی لادەری گەندەڵ و کولتووری شەڕئامێزە کەوا ئەو قەناعەتە دروست دەکا کات دێ بۆ ناردنی مارینزیان بۆ ئازادکردنی موسڵمانان لە چنگی ستەمکارانیان.

هەر بۆ دڵنیابوون، دروستکردنی وێنەیەی خراپ و نابەجێی ئافرەتی موسڵمان و عەرەب سنووردار نەکراوە بە ماوەی دژایەتیی سیاسی لەلایەن ئەمەریکا یان هاوپەیمانانی ئەورووپی کاتێ شەڕ بەرپا دەکەن لەسەر خاکی موسڵمانان. بۆ نموونە کارێکی ئێجگار شەڕانگێزانە بوو لە بواری زەمالاتی بواری دیراسەی ئافرەت پێش سەرهەڵدانی فێمینیزمی پۆستکۆلۆنیال و سنووربڕ. چاندرا تالپێید مۆهانتی، تیۆریستی فێمینیستی ناسراو لە

وتارێکی نایابدا بەناوی "لەژێر چاوی ڕۆژئاوا: زەماڵەی فێمینیستی و گفتوگۆ کۆلۆنیالەکان، ١٩٨٦"، بێدەنگییەکەی شکاند لەبارەی کارکردن لەسەر ئەم بۆچوونە کۆلۆنیالە و خەوشی لەم جۆرە زەماڵانەدا دەرخست. لە وتارە پێشەنگەکەیدا، مۆهانتی بەشێوەیەکی سیستماتیکی باسی ئەو ڕێگە تایبەتییانە دەکا بەهۆیانەوە "ئافرەت" وەک یەکەیەکی شرۆڤەکاری بەکار دەهێنرێ بۆ گفتوگۆی فێمینیستی ڕۆژئاوا لەبارەی ئافرەتانی جیهانی سێیەمەوە، ئەمەش پێکهاتەی "ئافرەتانی جیهانی سێیەم" ڕوون دەکاتەوە و بە بوونەوەرێکی لاواز و بێدەسەڵات پێشانیان دەدا، کە زۆرجار وەک قوربانییەکی نادیاری سیستمی کۆمەڵایەتی و ئابووری دێنە وەسفکردن. بێگومان پرسەکە سنووردار نەکراوە بۆ فێمینیزمی ڕۆژئاوایی و سەیری ئافرەتانی جیهانی سێیەم دەکا، گەلێ سکۆلەری جیهانی سێیەم ئەم زاراوانەیان لە کارەکانیاندا فرە پات کردووەتەوە. کەواتە، ئافرەتێکی سکۆلەر یان چالاکوانێکی جیهانی سێیەم بین مانای ئەوە نییە تۆ بەدەری لەنێو چوارچێوە داگیرکارییەکە. لە ڕاستیدا، لەوانەیە هاوکاریی داگیرکاری بکەی و بیانچەسپێنی.

لە دژی ئەم باکگراوندە هەم لە ڕووی باڵادەستیی گشتی و زانکۆکاندا، ڕاستییەک هەیە کەوا سکۆلەر و چالاکوانی پێشکەوتوو ئێستە ئەم وێنانە ڕاست دەکەنەوە، لەسەر بنچینەی ئەو بەڵگە ڕاستییانەی کە خۆیان دەیبینن، بەڵام ئەمە نابێ ئاوەکە لیتاوی بکەن و وامان لێ بکەن لە واقیع دوور کەوینەوە کەوا نەوەی دواتری پێشەنگی مافەیلی ئافرەتان، مێژوونووسانی کۆمەڵایەتی، تیۆریستی خەیاڵی و ڕێکخەرانی کۆمەڵگە، بیرمەندانی گشتی، چالاکوانانی سیاسی، سەرانی شۆڕشگێڕ، شاعیر، فیلمساز و هونەرمەندان ڕێیان خۆش کردووە بۆ کچەکانیان بچنە ناو گۆڕەپانی تەحریر و مەیدانی ئازادی. پێدا پێدا دروستکردنی هۆشیارییەکی گشتی (زاراوەی دورخیم بەکار دێنم) ئێستە لە ئارادایە، ئەمە ئاژانسێکی مێژوویی پێویست

دروست دەکا کە زیندوو و چالاکە لەنێو ناخی هەر ئافرەت و کچێکی گۆڕەپانەکان، ئەمە متمانەیەکی وا دروست دەکا کە ئازایانە لە دژی ستەمکارانی وڵات و ناو ماڵ دەوەستنەوە، لە دژی ئەو ئازارانەی چەشتییان لە سەردەمی داگیرکاریدا، بیئۆمێدیی دروستکردنی وڵاتی پۆستکۆلۆنیال، لە سەرووی هەمووشیانەوە، ئەو پیاوسالارییەی کە هەموویانی بە لاوازی پەروەردە کرد و پێشان دا.

ئێمە پێویستە تێڕوانینمان لە میدیای جیهانیدا بگۆڕین کە لەژێر کاریگەریی دەسەڵاتی داگیرکاراندا دایە، بیگوازینەوە بۆ رەوتی لۆکاڵ و هەرێمیی بەرهەمی مەعریفی جێگرەوە، تێیدا شۆڕشگێڕان و هونەرمەندان چەندان نەوەیە وەک یەک سەرقاڵن. لە کتێبە کلاسیکییەکەیدا بەناوی "ئافرەتانی جەزائیری لە ئاپارتمانەکانیاندا، ٢٠٠٢"دا، رۆماننووس و فیلمسازی جەزائیری ئاسیا جەبار لە نووسینێکی پەخشانئامێزدا باسی وردەکاریی نەهامەت و ئازارەکانی ئافرەت دەکا لە سەردەمی خەباتی دژە داگیرکار و ئازادبوون لە پۆستکۆلۆنیال. زۆر بەوردی بایەخ دەدا بەپرسگەل و تێڕوانینی بێدەنگی و نادیاریی ئافرەت. ئەوە پێشان دەدا چۆن شەڕی جەزائیر بۆ رزگاربوون (١٩٥٤-٦٢) تەنیا رزگاربوونی پیاوان بووە. دەڵێ ئافرەت رۆڵێکی چالاکی هەبووە لە کاتی شەڕەکەدا، ئەوەش پێشان دەدا چۆن ئەم رۆڵە تەنیا پێوەرێکی کاتی بووە، لەبەرئەوەی دوای شەڕەکە بازنەیەکی نوێی چەوساندنەوەی ئافرەتی دەستی پێ کرد. بۆ ئاشکراکردنی ئەو خەباتانە، ئێمە وامان پێ گوتراوە: "من زیندانێکی بێدەنگم. نزیکەی وەک ئافرەتانی ئەوڕۆکەی جەزائیر، دەیانبینی دێن و دەچن بێ ئەوەی لەچکیان لەسەر بێ، بەڵام، بێ لە ترسی دۆخ و حاڵەتی کتوپڕ، ئەوان دووچاری لەچکی تر بوونە، نادیارن بەڵام زۆر هەستیان پێ دەکرێ".. لە دژایەتیکردنی ئەو بێدەنگییە سەپێنراوە، جەبار دەڵێ:

بۆ ئافرەتی عەرەب تەنیا یەک رێگە دەبینم بۆ کردنەوەی هەموو

قفلەكان: قسە بكەن، قسە، بێ وەستان، قسە بكەن لەبارەی دوێنێ و ئەمڕۆ، قسە لەبارەی خۆتانەوە بكەن، باس لە هەموو پرسێكی ئافرەتان بكەن، باسی پرسی نەریتی، باسی پرس و پرۆژەگەلی نیشتەجێبون. قسە لە نێوەخۆماندا بكەن و تەماشا كەن. تەماشای دەرەوە بكەن، تەماشای ئەودیو دیوارگەلی زیندانەكان بكەن!... ئافرەت بن دەنگ و تێڕوانینتان هەبێ... نەک دەنگی ئەو ئافرەتانەی لەنێو زیندان و ئاوازە شیرینەكانیاندا دێنە خنكاندن.... دەنگێک بن قەت پێشتر نەبیسترابن، دەنگی هەنسكەكان، خراپەكاریی بەرامبەرتان، دەنگی خەمی ئەو ئافرەتانەی لەنێو چوار دیواردا بەند كراون... دەنگێک كەوا لەنێو گۆڕە كراوەكاندا دەست بەگەڕان دەكا.

ئەمە ئەم وێنەیە پێویست بوو بێتە گۆڕان. وێنەی ئافرەت "وەک ئۆریەنتاڵ" ئێستە بە چەندان ڕێی جیاواز دێتە تێگەیشتن و وەرگرتن، جا چ لەلای باوک، مێرد، یان لەوان بەكێشەتر برا و كوڕ. ئافرەت دەمێک پێشی گۆڕەپانی تەحریر و مەیدانی ئازادی دەستیان كردبوو بە گۆڕینی ئەو وێنەیە. مێژووی ئەو گۆڕانە دەبێ بەدواداچوونی بۆ بكرێ هەم لەسەر ئاستی ناوەخۆی و ئاستی هەرێمیش، ئەو مێژووەی ئافرەت تێیدا جەنگی بەرپا كرد، نەک هەر تەنێ بۆ گۆڕینی وێنەگەلی چەوسێنراو یان ئافرەتی شۆڕشگێڕ كە دەسەڵاتی نوێنەرایەتیكردنی پێشان دا.

نەوە دوای نەوە، لە هەردوو سەردەمی كۆلۆنیال و پۆستكۆلۆنیالدا، ئافرەت چووەتە ناو فەزای گشتی و گۆڕیتی. بەئەنجامدانی ئەم كارەش، ڕۆڵی جێندەری هەبووە كە بەردەوام دژایەتیی كراوە. دەستەی سیاسیی ڕژێمی باڵادەستیی دەسەڵات و مەعریفە هاتووەتە بەرەنگاركردنەوە لە ڕێی سووكایەتیكرن بە دەستەی جێندەرییەوە، واتە فەرمانكردن بەسەر چی و لە كوێ بێتە كردن. هەروەک یودیت بوتلەر دەڵێ، دەستەی جێندەری هەرگیز

"قەوارەیەکی بێدەنگ نەبوو. راستیی "جێندەری" دەستەی مرۆ لە رووی کۆمەڵایەتی، دەروونی، کولتووری و سیاسی دروست دەکرێ لە رێی دووبارەکردنەوەی "بیرۆکەی تێگەیشتراو" کە خێرا ئەرکەکەی وەک کارێکی سروشتی دێتە وەرگرتن. بوتلەر پرسیارێک دروست دەکا لەوەی "سروشتی" لە پێناو چی، لە پێناو دەرخستنی "بنەڕەتیی دروستکردن" کە ئێستە کار دەکا لە بواری رەگەز، جێندەر و پێگەی ویستراوی پێکهاتەگەلی دەسەڵات. مەترسیی سیاسیی گەورە هەن لە دەستنیشانکردنی "بنەڕەت و هۆکار" بۆ ناسنامەی ئەوانەی کە لە راستیدا کاریگەری حاڵەتگەل، پراکتیزە و مشتومڕەکانیان لەسەرە لەلایەن چەندان روو و سۆنگەوە. رەهەندێکی شۆڕشگێڕی هەیە لە بیرۆکەگەلی یودیت بوتلەر کە لێرەدا دەبێ قسەی لەسەر بکرێ لەبارەی ئەو فەزا گشتییەی ئافرەت داگیری کردووە بۆ گۆڕینی رۆڵی جێندەری. جێندەر واتە نمایشکردن، نەک وجوود.

جێندەر برێتییە لە ستایلی جەستەی دووبارەبووەوە، کۆمەڵێک کاری دووبارە لەنێو چوارچێوەیەکی دژوار کە بەپێی تێپەڕبوونی کات چوارچێوەکە ئەستوور دەبێ بۆ بەرهەمهێنانی دەرکەوتنێکی بەرچاو، واتە بەرهەمێکی سروشتی بوون. لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی لەبارەی جێندەرەوە، ئەگەر سەرکەوتوو بێ، دەرکەوتنی رێژەییی جێندەر لەبار دەبا بۆ نێو کاری بنیاتنەر، هەروەها ئەو کارانە دیاری دەکا کە لە چوارچێوەیەکی ئیجباریدا ئەنجام دەدرێن لەلایەن هێزەیلی جۆرەوجۆری دەرکەوتنی کۆمەڵایەتیی جێندەری.

## چینایەتی و کرێکار

پرسی چینایەتی، کرێکار و کۆچ چیی تر تەنێ نیشتمانی نییە، یان تەنانەت تەنێ خەمێکی سنووربڕین بێ. چووەتە نێو قالبێکی نێودەوڵەتی و کیشوەربڕ. چەندان وڵات و کولتوور هەن لەگەڵ کرێکارانی یاسای و

نایاسـاییـدا دەژیـن و بێ ئەوان هـەڵناکـەن. لە ئەنجـامـدا، ڕەهـەندگـەلی چینایەتیی بەهاری عـەرەبی ڕاپەڕینگەلی شـۆڕشگێـڕی دەبەسـتنەوە بە پرسگەلی دڕکـاویی کـۆچی کـرێکار و ڕەگـەزپەرسـتی، کـە مـانیـفێسـتـۆ جۆرەوجۆرەکانیان لەم کاتانەی دواییدا کوشـتنی بە کۆمـەڵ دەگرێتـەوە لە نەرویج، خـۆپێشـاندانە ئاژاوەئامـێزەکان لە بەریتـانیـا لە هـاوینی ٢٠١١ و لە فـرەنسـا لە پایزی ٢٠٠٥، هـەروەهـا ڕەنگدانـەوەی فـرە کـولتـووری و ترسـی ئیسلام لە ئەوروپای ڕۆژئاوا، ئەمەریکای باکور و ئوسترالیا.

لەنێـو باڵادەسـتـیی بەهاری عـەرەبیـدا، کرێکار وەک هـێزێک ئامـادە بوو، بەڵام هێـزێکی پێناسـەکـراو نەبوو بۆ ڕاپەڕینگـەلی شـۆڕشگێڕی، بـە هـەمـان شـێـوەش ئافـرەت بـوونی هـەبوو بەڵام مـافـەیلی ئافـرەت پێنـاسـەی گـردبوونەوەیلـی بەکـۆمـەڵیـان هـەڵنەگـرتبـوو. ئەمـە مـانای ئەوە نیـیـە کـەوا پرسگەلی کـرێکار و هۆیەلـی ئابووری (یان ڕاسـتـتـر داواگـەل بۆ مـافـەیلی ئافـرەت) بـەشـێک نەبوون بـۆ ئەم بزووتنەوانە. چینی هۆشـیـاری کـرێکار بەتەواوی دەتوانێ گردبوونـەوە و خـۆپێشـاندان سـاز بکا و ئێستـەش داوای تەواوی دەسکەوتەکانیان دەکەن. مانگرتنگەلی کرێکاران پرسی گرینگ بوون بۆ سـەرکەوتنی شۆڕشی میـسری، گرینگ بوون وەک کردەگەلی مەدەنی کە گوێیـان بە دەوڵەت نەدا. لە ڕاسـتیـدا، مـانگرتنی کرێکاران کە لە سـویس لە ٨ی شـوبـاتی ٢٠١١دا وەک کلیلێک وابـوو، تەنانەت زۆر یەکلاکـەرەوەش بوو، پاڵەپەسـتـۆی خسـتـە سـەر ڕژێمی حوسـنی موبـارەک. بەڵام دەمـێک پێش سـەرهەڵدانی بەهاری عـەرەبی، پرسگەلی کـرێکاران بەرچاو و کـاریگەر بوون لە جیهانی موسڵمان و عەرەبان. هەروەک مامۆستا ئەحمەد کەننا، سکۆلەرە لە ڕۆژهەڵاتی نـاوەڕاسـتی مـۆدێرن، دەڵێ: پێش ئـەو یاخـیـبـوونانـە، ئەوانی تر هـاتن، مـیانڕۆیانەتر لە مەبەسـتەکـانیـان و بێگومـان کـەمـتر کـەوتنە بەرچاوی مـیدیا. بۆ مـاوەی چەندان سـاڵ، کرێکاران، زیـاتر ئەوانەی خـەڵکی ئاسـیـای باشوور، دەڕژانە سـەر شـەقام لە ئیماراتی عەرەبیی یەککگرتوو. ئەو دەڵێ:

گرینگە ئاماژە بەوە بدەین ئەو شۆڕشانە، لە کاتێکدا زۆرجار لەلایەن بازرگانان، تەکنۆکرات یان قوتابیان رابەرایەتی دەکرێن، زۆرجارانیش خۆیان تێیدا بەشدارن، زیاتر بە بەشداریی کرێکاران سەردەکەوێ. بۆ نموونە کرێکارانی سعوودی هەستانەوە لە دژی سیاسەتگەلی ستایلی جیم کرۆ ئارامکۆ لە سالآنی چلەکان و پەنجاکان. لەم مانگانەی دواییدا، کرێکارانی عومانی لە سەلالا و سوور بە لێشاو راپەڕین لە دژی مووچەی کەم، بەرزبوونەوەی نرخ و دەرکردن لە کار، کە رژێمی قەبوس بن سوڵتانیان تۆمەتبار کرد بەوەی کار دەدەن بە موسکاتی و بیانییان. رژێمەکە... وەڵامی ئەو ناڕەزاییانەیان دایەوە بەفیشەکی دەنگی و گازی فرمێسکهێن، لەگەڵ کوشتنی کوڕێکی پازدە ساڵان.

بوونی "کرێکارانی بیانی" لە وڵاتانی کەنداو کوشندەیە بۆ تەواوی ناوچەکە: کرێکاران لە ئاسیا و ئەفریقیا دێن بۆ گەڕان بەدوای کارێکی کاتی، کارێک دەکەن تژی لە ناخۆشی و کۆیلەئاسا بۆ وڵاتانی دەوڵەمەند بە نەوت. بەڵام، لە کاتێکدا ئەو کرێکارانە خراونەتە پەراوێز و قۆستراونەتەوە، بە هیچ شێوەیەک بێدەنگ نین لەبارەی مووچەی کۆیلایەتییان و خەیاڵیان. لەبەرئەوەی هیچ لینکێکی راستەوخۆ نییە لە نێوان ئەم جووڵە کوشندەیەی کرێکار و سەرهەڵدانی بەهاری عەرەبی، پێوەندییەکی سیستماتیکی هەیە لە نێوان هەردووک. وەک کەننا بەم شێوەیە باسی دەکا:

دانی پێدا نرا، لە کاتێکدا کردەی بەکۆمەڵ لە میسر و تونس و وڵاتانی تری بەهاری عەرەبی ناڕەزاییی سیاسین، کردەگەلی ئیمارات مانگرتنی کرێکارانن. نابێ ئەم دووە تێکەڵ بکەین: مەترسیی هەریەک لەو جۆرە خۆپێشاندانە جیاوازە. کرێکارانی بیانیی ئیمارات هاووڵاتییانی وڵاتێکی ترن و دواجار دەگەڕێنە

وڵاتی خۆیان. بەڵام لە کاتێکدا بیانییان، کرێکار بن یان چینی مامناوەند، لە ئیمارات خۆیان بە بەشێک لە کۆمەڵگەکە حسێب ناکەن، خۆپێشاندانیان بە هەندێ ڕێگە یەک دەگرنەوە لەگەڵ ئەوانەی بەهاری عەرەبی... کردەی کرێکارانی بەهاری عەرەبی و کەنداو، بەشێوەیەکی گشتی، لەبارەی شکۆمەندی و دادوەرییەوە: هەردووکیان بەرەنگاری سیستمی وڵاتێک دەبنەوە کە یەک خێزان تێیدا جڵەوی شتەکانی بەدەستەوەیە، هەروەها هەردووکیان زۆر بە توندی لەلایەن ئەو وڵاتانەوە سەرکوت دەکرێن. بەڵام، کردەی کرێکارانی کەنداو پشتگوێ خرا. بۆچی؟

ئەم پرسیارە تەواو ڕەوایەی کەننا وەڵامێکە بۆ بیرۆکەی "ژیانی ڕووت"ی جۆرجیۆ ئەگامبێن یان هۆمۆ ساسەر:

بۆ نموونە، لە دوبەی، کرێکاران یان ئەوەتا لە کامپی کرێکاران لە دەوروبەری شاردا دەژین یانیش لەنێو خانوو لەنێو شارەکاندا، واتە بێگومان حاڵەتێکی کاتی و نافەرمییان هەیە بۆ هەر شتێک پێوەندیی بە هاووڵاتیبوونەوە یان مافەیلی ئابووری هەبێ. کاری هەرەمەکی بێبەشیان دەکا لە ژیانی مرۆییانە و دووبارە دایان دەڕێژێتەوە، چونکە مانەوەیان لە کەنداو، وەک ژیانێکی ڕووت وایە.

لەوێوە دەگاتە ئەم ئەنجامە کەوا:

هەم لە ڕووی مەعریفی هەمیش شوێنەوە، وێ دەچێ، کرێکاری بیانی لە کۆمەڵگەی هاوچەرخی کەنداودا سنووری سەروەری پێک دێنن، ئەمەش شێوەیەک پێوەستە بە هاووڵاتییان و کرێکارانی بیانی کە ڕۆڵیان هەیە لە سەروەربووندا.

پرسی "سەروەریی نیشتمانی" سەبارەت بەم کۆچە بەلێشاوەی کرێکار لە

راستیدا دەبێتە پرسێکی تەواو لاوەکی بۆ وەلاتانی پرسی کۆمەڵایەتی و کولتووری کەوا کرێکارانی کۆچەر بەرگەی دەگرن، هەروەها پێوەرە درندانەییەکانی ئەو چەوساندنەوەی تووشی دەبن. لەگەڵ ئەوەشدا لەنێو ئەم کارە گشتییەی کۆچی سنووربڕی کرێکاران، دیمەی نیشتمانی بێگومان هێشتا هەر گرینگە، هەرچەندە لە رووی سنووربڕییەوە کارێکە پڕ کێشە. لە رۆژی جیهانیی کرێکارانی ۲۰۱۱، جیهان بۆ یەکەم جار گردبوونەوەی یەکەتییەکانی کار لە گۆڕەپانی تەحریر بینی لە دوای رووخانی موبارەک و سەرهەڵدانی میسری نوێ.

ئالای سوور دوێنێ دەهاتنە شەکانەوە کاتێ هەزاران میسری یادی رۆژی جیهانیی کرێکارانیان کردەوە لە گۆڕەپانی تەحریر لە قاهیرە. کرێکاران لە کارگەی جیاجیای میسر، هەروەها فیدراسیۆنی سەربەخۆی تازە دامەزراوی یەکەتییەکانی کار لە میسر لەگەڵ چەندان پارتی چەپ گرد بوونەوە بۆ دەربڕینی خۆشی بۆ ئازادییە نوێیەکەیان. ئەحمەد بوراری، وەزیری کار و کۆچ لە میسر، مانگی رابردوو رای گەیاند کەوا کرێکارانی میسر مافیان دەبێ بۆ دامەزراندنی یەکەتیی سەربەخۆی کار. ئەمە ئاماژەکەیە بە ئاستێکی تازەی ئازادیی رێکخراوەییی میسر بە درێژاییی مێژووی خەباتی کرێکاران.

ئاستەنگەیلی رژد لە بەردەم رێی کرێکارانی میسرییە. هەندێ شۆڕشگێڕ ترسان لە کۆمیونیزم. هەندێکی تر بەپەرۆش بوون. نوها وەجدی، قوتابیی بەشی دەرمانسازییە، گوتی "من زیاتر لای باڵی چەپم. من لێرەم تا بەخۆم بڵێم پارتە سیاسییەکان چین بۆ ئەوەی بتوانم بڕیار بدەم کام پارت باشە تا پێوەندی بکەم." پارتەیلی سۆشیالیست زۆر بەخێرایی دەردەکەوتن. لە کاتێکدا پارتی دیموکراتی کرێکاران بەڵێن دەدا بە نیشتمانکردنەوەی بەشی گەورەی پیشەسازیی تایبەت، ئەوانی تر داوای رۆڵی سنووورداری کەرتی

تایبەت دەكەن لە پێشخستن و گەشەسەندندا. تەوەقوعات زۆر بەرز بوو. یەكێ لە داوا هەرە گرینگەكان بریتییە لە زیادكردنی مووچەی مانگانە، ئێستە مووچەی ئاسایی ٤٠٠ پاوندی میسرییە (نزیكەی ٧٠ دۆلارە) تا ١٢٠٠ پاوندی میسری (واتە ٢٠٠ دۆلار). مووچە دەبێ بەپێی بەرزیی نرخ زیاد بكرێ، ئەوان وا دەڵێن. كولتوورێكی سیاسیی نوێ پێک هات. لە كاتێكدا رادیكاڵیبوونی ملیۆنان میسری لە كاتی شۆرش هەلێكی نوێیە بۆ چەپ بجووڵێ، هەروەها خەبات دەكا بۆ بەستنەوەی لایەنە گەورەكانی خۆپێشاندەران كەوا قووڵ ماونەتەوە لەنێو رێكخراوەیلی بە متمانەی سیاسی. قسەكان خۆشیئامێز بوون:

ئەمرۆ، ئێمە لەگەڵ هەموو جیهان یادی یەكی ئایار دەكەینەوە، رۆژی جیهانیی كرێكاران، چەندان دەیەیە ئەمە سیمبولی هاریكاریی كرێكارانە لە جیهان، هەروەها وەبیرخەرەوەی خەباتیانە. ئەم رۆژە دان بەوەدا دەنێ كە ئەوە كرێكارانە ژیان دروست دەكەن، دەستەكانیانە كۆمەڵگە دروست دەكا، هەر قوربانیی ئەوانە كە هێڵی رێی نەوەكانی داهاتوو دەكێشێت.

ئەوەی لەم دەربڕینی هیوا و داوایانە جیاواز بوو رەهەندی نوێی ئەگەرەكان و ئەو راستییەش بوو كەوا رێژیمی چەوسێنەر شاردبوویەوە.

ئەم رۆژە (رۆژی یەكی ئایار) كاریگەرییەكەی زیاتر بوو بەو راستییەی كەوا موبارەک بەوە فێر بووبوو گۆرەپانی تەحریر بەكار بێنێ بۆ بۆنە و یادەكانی خۆی. ٨٠٠ كەس ژیانیان لەدەست دا لە شۆرشی ٢٥ی جانیوەری و چەندان دایک وێنەی منداڵانیان لە باوەشدا بوو و مردن. پۆستەر و مۆتاجی هەجو دانراون بۆ یادكردنەوەی شۆرشەكە. كارە دڕندانەییەكانی موبارەک بێ بەزەییانە ئیدانە كرا لەو ساتە جەماوەرییانەدا.

ئەم دیمەنە نیشتمانییانە هی خەڵکی ناوەخۆ بوو بۆ گۆڕانی تری مێژوویی کە بەتەواوی سنوورگەلی نێوان هێزی کاری ناوەخۆ و بیانیی لێڵ کرد. ئەوەی ئەحمەد کەننا لە ناوچەی کەنداوی فارس نەخشەی بۆ دادەنێ هەڵوێستێکی جیهانییە، کە بەباشترین شێوە وەسف کرا لەلایەن ئابووریناسی سیاسی بەهزاد یاغمایان:

له کاتێکدا بە ملیۆن کەس لە جیهان یادی ڕاپەڕینگەلی جەماوەری لە ئەفریقیای باکور دەکەنەوە، ئەورووپا بە ترس و گومانەوە تەماشای ئەمە دەکا. ڕووخانی دیکتاتۆرانی ئەفریقیا ئەورووپا بێبەش دەکا لە هاوپەیمانی گرینگی شەڕ لە دژی کۆچی نایاسایی. بۆشاییی سیاسی و ناسەقامگیریی کۆمەڵایەتی و ئابووری کە بەدوای ئەمەدا دێ شەپۆلێکی نوێ بۆ کۆچی بێهیوایی دروست دەکا کەوا خەڵک پێ لە جەرگی دەنێ و دەریا دەبڕێ بۆ گەیشتن بە کەنارەکانی ئەورووپا. ئەمە تەنگژەی کۆچ لە ئەورووپا قووڵتر دەکا لە کاتێکدا لەم چەند ساڵەی دواییدا بەردەوام هەوڵ دراوە بۆ چارەسەرکردنی. ئەورووپا بە بەکارهێنانی هێزێکی زۆر وەڵام دەداتەوە. تەنگژەیەکی نوێی مرۆیی بەڕێوەیە.

یاغمایان نیگەرانە لە ئاکامەیلی هەرێمی و سنووربڕی بەهاری عەرەبی و مانای چی دەبێ بۆ لێشاوی کرێکار لە باکورەوە بۆ ئەورووپا.

وێرانە بە شەڕ و هەژاری، بە هەزاران ئەفریقی سەبسەهارا نیشتمانیان جێ هێشتووە، ساڵانە لە گەشتێکی تژی لە ئازار و درێژ بەرەو باکور سەریان هەڵدەگرن. دوای ئەوە دەگەنە مەغریب، تونس یان لیبیا، ماوەیەک دەمێننەوە تا ماندوویان دەحەسێتەوە، ئەوجا پارە دەدەن بە قاچاخچی، سواری بەلەمی

بچووک و نیوچە شکاو دەبن بەرەو ئیتاڵیا یان ئیسپانیا دەکەونە ڕێ.

ئەم هەڵسەنگاندنە بەهاری عەرەبی ڕاست داوێتە ناوەڕاستی درامای کرێکار لە نێوان ئەفریقیا و ئەوروپا. کارێکی گەمژانەیە وابزانین بەهاری عەرەبی لە ڕووی ڕەگەزپەرستیی جوگرافی ئەم دیاردەی سنووربڕییە نێودەوڵەتییە پشتگوێ دەخا. لە ڕێککەوتنێکی دووانە لەگەڵ زەینەلعابدین بن عەلی، یاغمایان دەڵێ: "ئیتاڵیا بەڵێنی هاوکاریی دارایی داوە لە بەرامبەر یارمەتیدانی بۆ نەهێشتنی کۆچی ترانزێتی ئەفریقی و تونسی، چونکە لە ئیتاڵیاوە بەرەو ئەوروپا دەڕۆن. ڕووخانی بن عەلی کۆتایی بەم ڕێککەوتنە هێنا. کۆنترۆڵی سنوور لە دەست دەرچوو لە تونس، پێنج هەزار تونسی لە بەندەری لامپەدوسا گەیشتنە ئیتاڵیا. ئەم دیاردەیە هەر تەنیا تونسی نەگرتووەتەوە.

لە ڕێککەوتنی ٢٠٠٢ی نێوان ئیسپانیا و مەغریب، دەسەڵاتدارانی مەغریبی بەڵێنی هاوکاریی تەواویان دا لە کۆنترۆڵکردنی کۆچ لە بەرامبەریشدا ٣٩٠ ملیۆن دۆلار وەک هاوکاری وەردەگرن. دوو ساڵ دواتر لە سێپتێمبەری ٢٠٠٥، سەربازانی مەغریبی و پاسەوانانی ئیسپانی تەقەیان لە سەتان ئەفریقی کرد کە هەوڵیان دەدا بچنە ناو پێگە سەلامەتەکانی سوتا و مێلیلا. تەقەکان ١١ی کۆچبەریان کوشت و چەندانی تریشیان بریندار کرد.

لە مەغریبەوە بۆ تونس، چەقی کۆچی کرێکاران لیبیا بوو:

بەرچاوترین ڕێککەوتنی دووانەیی لەگەڵ دیکتاتۆرانی ئەفریقیای باکور "پەیمانی هاوڕێیەتی" بوو کە لە نێوان ئیتاڵیا و لیبیادا لە ٣٠ی ئابی ٢٠٠٨دا مۆر کرا. هەردوو وڵات بەڵێنی زیادکردنی

هاریکارییان دا له شەڕکردن له دژی تیرۆریزم، تاوانی ڕێکخراو، قاچاخی تلیاک و کۆچی نایاسایی. موعەممەر قەزافی رازی بوو کۆچبەرانی ئەفریقی له سنووری خۆیدا بهێڵێتەوه و نەپەڕنەوه بۆ ئیتاڵیا، هەروەها ئەوانەشی له ئاوه نێودەوڵەتییەکاندا دێنه گیران بگەڕێنرێنەوه لیبیا. نرخی ئەم خزمەتگوزارییه بای پێنج ملیار دۆلار وەبەرهێنانی ئیتاڵی بوو، هەروەها شەش پاترۆڵی کەشتی بۆ چاودێریکردنی ڕێگه ئاوییەکانی نێوان ئەفریقیا و ئەوروپا.

شەپۆلی کۆچی کرێکار له باکورەوه بۆ ئەوروپا میسری بەهێزیشی گرتەوه. هەرچەنده به ژمارەیەکی زۆر کەمتر، میسرییەکان نیشتمانی خۆیان جێ دەهێشت بۆ ئیتاڵیا. کەواته، کرێکارانی میسری خەریکی یادکردنەوەی یەکی ئایار بوون لە گۆڕەپانی تەحریر، کرێکارانی بێ نیشتمان، ئەوانەی گۆڕەپانێکیان نییه وەک تەحریر و بەو ناوه، که نزیکەی ۲۰۰ ملیۆن کەس دەبن، به جیهاندا دەسووڕانەوه له گەڕان بەدوای کارێکدا: کرێکارانی ئەفریقی له باکورەوه دەچوونه جیهانی عەرەبی و لەوێشەوه بۆ ئەوروپا، لەگەڵ خۆشیاندا چەند کرێکارێکی عەرەبیشیان دەبرد. جیهانی عەرەبی و ئەفریقیا بەهۆی کۆچی کرێکارانەوه هێنده لێک نزیک بوونەوه هەرگیز وا نەبوون پێشتر. بێگومان چەندان ڕێ و لێشاو هەن، وەک له ئاسیای باشوورەوه، بەتایبەتی له ڕێی فلیپین و تایلەند. کرێکارانی سێکس له ئەوروپای ڕۆژهەڵات، هاوکات، بەرەو باشوور دەچن بۆ وڵاتانی کەنداوی فارس بۆ کارێکی کاتی. بەهاری عەرەبی ئا بەمجۆره زیاتر دەچێته ناو پرسی کۆچی کرێکاران:

بەڵام ڕووخانی قەزافی دەبێته تەقینەوەیەکی بەهێز بۆ سیاسەتی ئێستەی کۆچ له ئەوروپا. لەدەستدانی چەکی بەکرێگیراوی ئەوروپا بۆ شەڕ له دژی کۆچی نایاسایی دەبێته هۆی

ڕووبەڕووبوونەوەی کراوە و زیاتر لە نێوان پاسەوانانی چەکداری ئەورووپی و کۆچەری ئەفریقی لەنێو دەریاکاندا. ئەورووپا تا کوێ دەڕوا بۆ وەستاندنی ئەفریقییەکان تا نەگەنە سنوورەکانی؟

ئەو ڕووداوانەی پێش هاتن خێرا قسەکانی بەهزاد یاغمایانیان دووپات کردەوە: "نزیکەی هەزار کۆچەری ئەفریقیای باکور بە دەیان بەلەم، تەنێ بە شەو و ڕۆژێک، خۆیان گەیاندە دوورگەی لامپەدوسای ئیتاڵی،" بی بی سی لە سەرەتای ئاداری ٢٠١١دا وای گوت، "ئەوانی تریش، لەوبەر کەناری تونس، دەیانەوێ بپەڕنەوە. دەڵێن زۆربەی کۆچەران لە تونسەوە دێن بەهۆی ناسەقامگیریی ئەوێ و دراوسێکەی لیبیا. ئاشکرا بوو بۆ کوێ دەچوون:

چەندان هەزار گەیشتوونەتە دوورگەی سیسلی لەوەتەی ناوەڕاستی شوبات. ئیتاڵیا داوای یارمەتیی لە یەکەتیی ئەورووپا کرد چونکە ئەویش خەمی ئەو لێشاوە گەورەی کۆچیەتی کە لە وڵاتانی ئەفریقیای باکورەوە سەر هەڵدەگرن. پێشی ئەم لێشاوی کۆچە، زیاتر لە شەش هەزار تونسی گەیشتبوونە لامپەدوسا، ئەمە بەپێی ڕاپۆرتەکان.

ئەم کۆچەی کرێکاران سنووری وڵاتان دەبڕێ، لە وڵاتانی ژێردەستەی ئەورووپا لە ئاسیا و ئەفریقیاوە دێن بەرەو پایەتەختەکانی ئەورووپا (بە گوتە بەناوبانگەکەی مالکۆلم ئێسک کە دەڵێ "مریشک هاتنەوە ماڵێ بۆ کرکەوتن."، هەروەها لەسەر ڕێیان سەردانێکی بەهاری عەرەبی دەکەن، تەنانەت هەندێکیان بەنێو گۆڕەپانی تەحریردا دەچن و هەندێ شۆڕشگێڕی میسری وەگەڕ خۆیان دەدەن. بەپێی ڕێکخراوی نێودەوڵەتیی کۆچ، نزیکەی ٢١٤ ملیۆن کۆچەر لە جیهاندا دەسووڕێنەوە. واتە سەتا ٣,١ی دانیشتوانی جیهان. ئەم ژمارەیە دانیشتووی پێنج وڵاتی گەورە لە جیهاندا پێک دێنێت. نزیکەی سەتا ٤٩ی ئەو کۆچەرانە ئافرەتن. ئەم کۆچی کرێکارانە پێناسەی

دۆخێکی جیهانی دەکا کەوا پۆستکۆلۆنیالیتی وەک سەرابێکە، تێیدا، بێ لە دوو سەدە لە مەعریفە، دەسەڵات و بەرهەمی ئایدیۆلۆجی، ئێستە رەچە خراپەکانی بەدیار دەکەوێ و چی بووە و چی نەبووە.

کۆتایی پۆستکۆلۆنیالیزم وەک سیستمێکی ئایدیۆلۆجی کەوا کۆلۆنیالیزم لە پاشە خۆی بەجێ هێشت مانای کۆتاییهاتنیشە بە دووانەی هاودژی یەکتری کە دروستیان کرد و پشتگیریشیان کرد: "رۆژئاوا و ئەوانی تر." هەر تەنیا رۆژئاوا نییە بگرە بنەڕەتەکانیەتیشی لە بیرۆکەی ئەورووپا کە وا کۆتایی پێ دێ. ئەورووپا، وەک بیرۆکە و وەک ناسنامەش، کۆتایی پێ دێ، ئەمەش شتێکی باشە: ئەورووپییەکان لە ئەورووپا ئازاد دەکرێن، موسڵمانەکانیش وا ئازاد دەکرێن لەوەی لەنێو "ئەوانی تر"دا بوو. ئەورووپا، وەک فرانتز فانۆن دەڵێ، داهێنانی جیهانی سێیەم بوو. ئێستە جیهانی سێیەم راپەڕیوە، ئەویش خۆی خۆی تێک دەدا.

## خوا مەزنترینە، ئازادیش مەزنە

ساندی تۆلان، مامۆستای گەیاندن و رۆژنامەوانییە، وتارێکی بۆ جەزیرە نووسی لە کۆتایی تەمووزی ٢٠١١، تێیدا باسی ساتێکی هەستیار دەکا لە گۆڕەپانی تەحریر ئەو دەمەی ئیسلامی و عەلمانییەکان تووشی رووبەڕووبوونەوەیەکی مێژوویی بوون لە گۆڕەپانە. مەمدوح هەمزە، ئەندازیارێکی مەدەنیی میسرییە، بزنسمان و دەمێکیشە رەخنە لە حکوومەت دەگرێ... لەسەر کورسییەکی پلاستیکیدا دادەنیشت لە بەردەمی کافتریایەکی گۆڕەپانی تەحریر، فووی لە بۆرییەکی ئاوی دەکرد... لەگەڵ کادیرە شۆڕشگێرە گەنجەکانی، بۆ ئەوان بووبوو بە جۆرە باوکێکی زۆرداری بەسوود. بۆمان ئاشکرا دەبێ کەوا یەکێکی نەناسراو بەکرێ دەگیرێ بۆ کوشتنی هەمزە، بەڵام بکوژەکە رای خۆی دەگۆڕێ، لەبەرئەوەی کەیفی بە سەردەمی شۆڕش کردووە. بەڵام هەمزە ئاگەدار کرایەوە بەشداری نەکا لە

گردبوونەوەیەک کە بۆ هەینیی پاشتر، واتە ٢٩ی تەمووزی ٢٠١١دا، دانرابوو. دوای ئەوە وائیل غەنوم هات، ئەو شۆڕشی میدیای کۆمەڵایەتیی دروست کرد، بەخۆی و هاوەڵانی، هات سڵاوێک لە هەمزە بکا. پیاوە پیرەکەی قایل کردبێ لەگەڵ ئیسلامییەکان رێک کەوێ. بەڵام غەنوم سوور بوو لەسەر ئەوەی گفتوگۆکەیان لەسەر هیچ کامێرایەکی پەیامنێران تۆمار نەکرێ. شەوێکی ئاوس بوو. شتەکان دەبرژان. تۆلان بەم شێوەیە بەردەوام دەبێ:

سەعات دووی شەو چووینەوە ناو شار بۆ ئەوەی بۆ چەند سەعاتێک بخەوین. هەرکە سواری تەکسی بووین، سەلەفییە ریشدارەکان، کە بە تەواوی وڵاتدا پرژا بوون، تاکە فایلێکیان بەسەر گۆڕەپانەکەدا وەردەکرد: لیشاوێکی جل سپی و جامانە خڕ، بەشێکە لە شانۆی پلان بۆ دانراوی ئیسلامییەکان. ئەوان هاتبوون ئەمشەو لە گۆڕەپان بمێننەوە، ئامادەن بە ئاڵا و دروشمەکانیان، لەگەڵ هەڵاتنی رۆژ لە قاهیرە چەند سەعاتێکی، ئەوانیش ئامادەن.

لافیتە و دروشم هەبوون: ئاڵای سوور و سپی، رەش و سپی، هەروەها ئاڵای دەسکاریکراوی میسری کە یەک پەیامی هەڵگرتبوو: جگە لە ئەڵڵا هیچ خوایەکی تر نییە. چەند لافیتەیەکی تر داوای جێبەجێکردنی یاسای شەریعەیان دەکرد. شۆڕشگێڕی ئیسلامیی میسری بوون، بەشی خۆیان بەتەواوی وەرگرت لە گۆڕەپانی تەحریر، هەرچەندە وێ دەچوو رێککەوتنێکیان لەگەڵ هاوشانە عەلمانییەکانیان شکاندبێ. ئەوان بۆیان نەبوو دروشمی وا بریقەدار بەکار بێنن. عەلمانییەکان دڵیان بەمە هێشا. لێرە و لەوێ، پۆستەری بن لادن بەرز کرایەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، دەنگەیلی عەلمانی ئێجگار زۆر دەبیسترا: لە

تەک دروشمگەل بۆ دروستکردنی وڵاتێکی ئیسلامی، هاواری دیموکراسی، ئازادی، دادوەری کۆمەڵایەتی و لێپرسینەوە هەبوو. دروشمی "ئیسلامییە، ئیسلامییە" لەلایەک، دروشمی "یەکگرتنی موسڵمان و مەسیحی" لەلایەک، سەرکۆنەکردنی موبارەک، هاوکاریی ئەمەریکا و داگیرکاریی ئیسرائیل لەلایەکی ترەوە. هێشتا، هێزی ئاشکرا و گەورە لە گۆڕەپانی ئیسلامی بوو.

ئێستە کاتی نوێژی هەینی بوو. دەریایەک لە مرۆڤایەتی لە خوار ئێمەوە دەڕژا: بە سەتان هەزار میسر، هەموویان پێکڕا، راپەڕین، پێکڕا رکوعیان برد، دواتر سوجدە و سەریان نا بەزەوی. هێندە بەهێز بوو هەر زێنەت بوو تەماشای بکەی، زۆر جوان بوو. کە دەیانگوت "الله و اکبر"، دەنگیان بەهێز بوو. وەک شەپۆلێک پاشەکشەی دەکرد، رێیان دەدا بە کۆرسێکی گەورەی تر کە هاواریان دەکرد: گۆڕان، ئازادی، دادوەریی کۆمەڵایەتی..." ئەمە لە بەرامبەر "الله و اکبر". ئەم دوو شتە تێکەڵ بووبوون: الله اکبر، وەک شەپۆلێک دەهات، شەپۆلەکەی تر ئەمە بوو: گۆڕان، ئازادی، دادوەریی کۆمەڵایەتی. الله اکبر... گۆڕان، ئازادی، دادوەریی کۆمەڵایەتی... الله اکبر... گۆڕان...

میسرییەکان لە ماڵ بوون. شۆڕشگێڕە میسرییەکان، دانوستاندنیان لەبارەی دیموکراسییەوە دەکرد لە گۆڕەپانی تەحریری ئازادکراویان، ئەندازیاری مێژوویان دادەنا، ماسولکەی دیموکراسیی گەلێکیان بەهێز دەکرد کەوا رێی خۆی دەدیتەوە، هەرچەندە هەمووی لەسەر بنچینەی ترسگەلی تارمایی بوو، بە رووی هێرشی پرسەیلی راستەقینە: رەگەز، چینایەتی و جێندەر. ئەوەی ئەم وڵاتانە دەرووخێنێ سیستەمی کۆنی ستەمکاریی نەبوو، بندەستیی ئیمپریالییەکان بوون، لە دۆخێکدا بوون کە چیی تر لەژێر دەستی داگیرکاران و مێژوویاندا نەبوو، یان چیی تر لەژێر

کاریگەریی پۆستکۆلۆنیالیتیدا نەبوون کەوا هەموو میتافۆرەکانی شەکەت کردبوو. لە نیوەی شەوێ، میسرییەکان دەگەڕان، بۆ میتافۆری نوێ، بۆ جیهانێکی عەرەبی کە خۆی دەبینێتەوە.

لەودیو نیگەرانیی بەرگەگیراوی ئیسلامیزم بەرامبەر بە نیگەرانیی عەلمانیەت، ئافرەت هەن لە جیهانی موسڵمان و عەرەبان خەمی هەرە گەورەیان ئەوەیە یاسای شەریعە بەزۆر بێتە سەپاندن. بەلای هەندێ ئافرەتی تریشەوە شەریعە سەپاندن نییە بگرە بەرەکەتە. لە هەمان کاتدا، کۆچی کرێکار سنوورە نیشتمانییەکان دەبڕێ و سیاسەتێکی رەگەزپەرستی لەخۆ دەگرێ بۆ نیشانەگرتن لە کرێکارانی کۆچەر. بەجێندەریکردنی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان جێگیر دەکرێ یان بەرەنگاری دەکرێتەوە لەلایەن هاتنی مێژوویی ئافرەتان بۆ نێو هێزی کار، ئەمەش واتە فراوانکردن و داگیرکردنی فەزای گشتی، کە گۆڕەپانی تەحریر سیمبولەکەیەتی. وەک ئەنجامێکی بەهاری عەرەبی، پێناسەیەکی باشتری ئەو فەزا گشتییە دروست دەکرێ، هەم لە رووی شوێن، هەم لە رووی چەمکیشەوە. سنوورگەلی نیشتمانی دەمێننەوە، بەڵام هێزەیلی هاودژی کار و سەرمایە دواجار پشتگیری لە کۆچی کرێکاران دەکەن لە دەرەوە و ناوەوەی جیهانی عەرەبی. پێوەندییەکانی جێندەر، چین و رەگەز کاریگەری ئەم راستییەیان لەسەر دەبێ، بەهۆی بەهاری عەرەبی و هەروەها راستییەکە لەنێو فەزای گشتیی نوێوە هەڵدەقوڵێ. هیچ گفتوگۆیەک سەبارەت بە سەپاندن یان لە ئامێزگرتنی شەریعە، هیچ سیاسەتێکی رەگەزپەرستی و، هیچ پێکهاتەیەکی چینایەتی بەدەر نابێ لە کاریگەریی فراوانبوونی ئەو فەزا گشتییە. بەهاری عەرەبی مەنجەڵێکە بۆ لەخۆگرتنی ئەو فەزایە.

## نۆیەم

## لیبیا : مەنجەڵ و سیاسەتی فەزا

لە سەرەتای ئابی ۲۰۱۱، لە یەکێ لە نووسینەکانی لەبارەی بەهاری عەرەبییەوە، مەڕوان بیشارە، گەورە شرۆڤەکاری جەزیرە، هەوڵی دا خۆگرتنی سەربازیی ڕێژیمی شەڕانگێز لە سووریا، لیبیا و یەمەن شی بکاتەوە، بە بەراوردێکی ڕێژمیی لەگەڵ ڕووخانی ڕێژیمگەلی تونس و میسر. ئەمجارە شیکردنەوەی بە زاراوەی سروشت و ئەرکی سەربازی بوو لەو ڕێژیمانەدا.

> قۆناخگەلی گواستنەوە لە میسر و تونس پێشبینییان قووت کردەوە بۆ گۆڕانی خێرا لە شوێنەیلی تریش، بەڵام کاتێ بەهاری عەرەبی گۆڕا و بوو بەماوینێکی گەرم، بووە هۆی بێئومێدی و گومان. لە ڕاستیدا، سەرەتای بەهاری عەرەبی بەهەموو پێوەرێک نموونەیی بوو، ئەو دەمەی بووە هۆی ڕووخانی دیکتاتۆریەتێکی ٥٤ ساڵەی تونس و میسر لە ماوەی تەنێ چەند هەفتەیەکدا. لە کاتێکدا دەزگەی سەربازی پشتگیریسی دیکتاتۆرەکانی گرت لە میسر و تونس، دۆخەکە لە لیبیا، یەمەن و سووریا ئاڵۆزکاو دەبێ بەهۆی ئەو ڕاستییەی کە میلیشیای ڕێژیمگەل، هێزەیلی تایبەتی و پاسەوانی کۆماری باشتر ڕێک خرابوون، باشتر چەکدار و پڕ پارە بوو، بۆیە کۆنترۆڵ و هێزی زیاتر هەبوو لەنێو سوپاگەلی نیشتمانیدا.

بەڵام جیاوازە ئاشکراکە مانای سەرکەوتنی ئەو ڕێژیمگەل نەبوو.

بەپێچەوانەوە، ئەو ڕێژیمگەل گۆڕیان بۆ خۆیان هەڵدەکەنی: لیبیا، سووریا و یەمەن دووچاری تەنگژەیەکی ئابووریی قورس دەبن، گەمارۆی ئابووری و بێبەش لە هەموو خزمەتگوزارییەک. سنوورێک هەیە بۆ پارە و سەرچاوەگەلیان. بەواتایەکی تر، لەژێر پاڵەپەستۆی جەماوەری ئەو ڕێژیمانە لە ئاستیان کەم کرایەوە و بوون بە وڵاتی گارسۆنی، دیکتاتۆریەتی سەربازی، بێهیوا، تۆقیو، لەودیو واقیع و مەترسیدار. تەنانەت بە هیچ شێوەیەک شەرعیەتیان نەمابوو. هەروەک ماکس وێبەر دەڵێ "هەموو وڵاتێک بە زەبری هێز دادەمەزرێ (لیدوانی لیۆن تۆرتسکی لە برێست لیتۆڤۆسک وەردەگرم)، وەک لە وتارە بەناوبانگەکەیدا بەناوی "سیاسەت وەک پیشە، ١٩١٩"دا باسی کردووە. بەڵام ئەو هێزە دەوەستێتە سەر دوو شت: پاساوی ناوەخۆ و ناوەندگەلی دەرەکی. ناوەندگەلی دەرەکی برێتین لە ناوەندگەلی زەبروزەنگ لە خزمەتی وڵات، کار دەکا لەسەر "توندوتیژیی شەرعی"، بەڵام پاساوی ناوەخۆ شتێکە هاووڵاتییانی کۆمارێک دەبێ پێی قایل بن، هەروەها ڕێژیمگەلی حوکمڕانی سووریا و ئێران (کە دوژمنی ئەمەریکا و هاوپەیمانانین لە ناوچەکە) و یەمەن و لیبیا (شوێنگەلی حەوانەی ئەو هێزانە و بەرژەوەندییەکانیانن) ئاشکرایە کە هەموو پاساوێکی ناوەخۆییان لەدەست داوە سەبارەت بە گەلی خۆیان.

ئەوەی ئامێری سەربازیی رووتی ئەو وڵاتە نارەوایانە تووشی بوون فەزای فراوانبووی گشتی بوو کە زۆر هۆشیار و چاوکراوە بوو. هەرکە گەل وێرا لە دژی دیکتاتۆرەکان هەستێ، وەک لە کەیسی لیبیا، یەمەن و سووریادا، بیشارە دەڵێ، واتە ئەو ڕێژیمانە ڕێز و حورمەت، باڵادەستی و توانیان لەدەست داوە بۆ چاندنی ترس یان فەرمانکردن بە دڵسۆزی. ئەمە دەوەستێتە سەر گەل، واتە بابەتگەلی ستەمکاری (پۆستکۆلۆنیالیتی)، دەبنە هەوێنی ئەوەی هاووڵاتییانی کۆمارێک ڕاپەڕن و خۆیان بێن فەزای گشتی فراوان بکەن، هەڵبژێرن و دیاری بکەن. هەروەها ئەو درۆ گەورەیەش سپی

دەکاتەوە کەوا ئەو رژێمگەلی حوکمڕانە بەشێکن لە بەرەنگاربوونەوەی ئیسرائیل و ئیمپریالیزمی ئەمەریکی لە ناوچەکە. بەهیچ شێوەیەک بەرەنگاری بالادەستیی ئەمان نابنەوە. بگرە ئەوانە بوونەتە هەوێن و هەوارگەی ئەم بالادەستییە. لەدەستدانی شەرعیەت لەلایەن ولاتانی وەک سووریا و ئێران واتە ئەمەریکا، ئیسرائیل و سعوودیە هەگبەیان وەگۆڕێ وەربوو و ئیمپریالیزمیان شەرمەزار بوو کە تا ئێستەش لە ناوچەکەدا پیادەی دەکەن. بەلام، لە بەرەی پێشەوەی شەرعیەتی شەڕەکان ولاتانی پۆستکۆلۆنیالی گەندەڵ خۆیانن. هەرکە هێز بەکار دەهێنرێ و ناتوانرێ مالی بکرێ یان خۆپێشاندەران بێدەنگ بکا، بگرە بە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر دەیانهێنێتە دەرەوە، ئەوا دەسەلاتی رژێم لەناو دەچێ.

هەرکە ژمارەی خەڵک زیاد دەکا لەسەر شەقامەکان، ئەوا زیاتر هۆشیار و چاوکراوە دەبن و زیاتر متمانەیان بەخۆیان دەبێ، رژێمیش زیاتر شەرعیەتی لەدەست دەدا. ئەم دیالێکتیکە کاریگەرییەکی راستەوخۆی هەیە لەسەر شەرعیەتیی ئەخلاقی، ئاسایی و سیاسیی ولات: ئەم جۆرە توندوتیژییە ئەمری واقیعی حکوومەت پێشان دەدا وەک دەسەلاتێکی ستەمکار و هەنگاونان بەرەو قۆناخی گواستنەوە تا دەست بکا بەتوخمێکی تری خراپی دەوڵەت. هەر بەتەواوی یەکێکە لە کارەکانی گوێڕایەڵنەبوونی مەدەنی، تێیدا ولات تەنازول دەکا، کەوا شیرازەی کۆمەلایەتیی سەرهەڵدانی کولتووری سیاسی بەڕادان دەدرێ و دەچنرێ. گرینگە ئەوەمان لە بیر بێ کەوا بناخەی ئەو کۆمەڵگە مەدەنییەی داهاتوو و قەزا گشتییە کە پێویستە وا لە دروستبووندایە لەو رۆژە قارەمانانەی کاتێ هاوولاتییانی کۆماری داهاتوو هەستان لە دژی ولاتی ناشەرعی. هەواڵە خۆشەکە ئەوەیە وێڕای ئەو توندوتیژییە نابەجێیە، شاری فرە کولتوور، دەستەگەلی شارۆکەکان و هاوئاهەنگی ناوچەیی وا دادەمەزرێن بۆ یارمەتیدانی بەرگەگرتن لەو ولاتانەدا. ئەم جۆرە هاریکارییە مەدەنییانە باشترین گرێنتێن بۆ چوونە پێش

و مسۆگەرکردنی داهاتوویەکی جەماوەری و بەدەر لە ململانە. کۆمەڵگە و کولتووری سیاسی دەبوایە ئامادە بن بۆ دەستپێکردنی ئەو هاریکارییە مەدەنییانە کەوا بەم خێراییە پێش دێن.

بەڵام ئێستەش هەڕەشەی توندوتیژی دووسەرەیە، هەروەک بیشارە دەڵێ:

> ئاستەنگەکە چیی تر سنووردار نییە بە لادانی ئەو ڕێژیمگەلە ئێکسپایەر و خوێناوییە، بگرە ئێستە هەوڵ بۆ مسۆگەرکردنی ئەوە دەدرێ قۆناخەکەی گواستنەوە هێندە نەبا و زۆری تێ نەچێ. ئاستەنگی بەردەم عەرەبان بریتییە لە پێناسەکردنی ململانەیان لە ڕێی خۆپێشاندانی ئاشتییانە، نابێ بهێڵن بخرێنە ناو ململانەی خوێناوی بەهۆیەوە خەڵک خراتر بن. ئەگەر بتوانم بە کلێشەیەکی شرۆڤەکاری کۆتاییی پێ بێنم، دەڵێم گۆڕان دەبێ پێناسە بکرێ بەهۆی پاڵنەر بۆ قوربانی، نەک تاڵیی شەڕ، پێناسە بکرێ بەهۆی خەونی داهاتوویەکی ئاشتییانە و خۆش، نەک بەهۆی مۆتەکەگەلی رابردوویەکی توندوتیژ.

قۆناخی گواستنەوە خوێناوی بووە لە سووریا، یەمەن، لە سەرووی هەمووشیانەوە لیبیا، تێیدا هەڕەشە گەمژە و بێ ماناکانی قەزافی لە دژی گەلەکەی پاساوێکی دا بۆ خێرا دەرکردنی بڕیاری ١٩٧٣ی یو ئێن، کە ڕێ دەدا بە بەکارهێنانی هێزی ئاسمانی بۆ پاراستنی هاووڵاتییان. هەموو ئەمانە واتە دڕندایەتی، تیرۆری ڕێژیمگەل، هەروەها پێشاندانی هێز نیشانەی بێهێزییە، نەک بەهێزی.

کەیسی تایبەتی لیبیا و چۆنیەتیی پێدانی پاساو بە ئەمەریکا و هاوپەیمانە ئەورووپی و ناوچەییەکانی هێزی سەربازی بەکار بێنن بووە هۆی شەڕێکی قورس لە نێوان وڵاتی ناشەرعی و فراوانبوونی فەزای گشتی کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. ئەم پێشڤەچوونە سەرەتاییەی دژە شۆڕش

(ئیمپریالیزمی درندانە و رووت بەناوی دەسوەردان لە پێناو کاری مرۆیی دێ پێگەی خۆی لەنێو راپەڕینگەلی دیموکراتی گەل قایم دەکا) لە راستیدا دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئاست و شکۆمەندیی ئەو دەسەڵاتە سەربازییەی ئێستە هێرش دەکاتە سەر لیبیا، وێش دەچێ هەمان شت دووبارە بکرێتەوە لە دژی سووریا و ئێران. بەواتایەکی تر، ئەمەریکا و هاوپەیمانانی ناتۆی نەک هەر تەنیا ئامێری سەربازی تێک دەدەن کە خۆیان بە لیبیایان فرۆشتبوو پێشتر، بگرە بەرمنگاری دەسومردانی لۆجیکی سەربازی دەبنەوە لە راپەڕینگەلی دیموکراتی، بەم شێوەیە ئەو هێزە سەربازییە شەڕانگێزە بە هێزێکی ناتوندوتیژ و گوێڕایەڵی مەدەنی لە قەڵەم دەدرێ.

ئەم داگیرکردنە سیستماتیکییەی فەزای گشتی پشت ئەستوورە بە ستەمکاری داگیرکاری و پۆستکۆلۆنیالی کەوا ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیمپراتۆری عوسمانی. بۆ نموونە، بەشار ئەسەد لەوەتەی نۆڤێمبەری ۲۰۰۰، ئەو دەمەی باوکی مرد، جڵەوی دەسەڵاتی گرتووەتە دەست. حافز ئەسەد خۆیشی لە ۱۹۷۰ هاتە سەر حوکم کاتێ سەرۆک نوورەدین ئەتاسی لەناوبرد و دەستوپێوەندەکانی گرت. ئەم ناماقووڵییانەی پۆستکۆلۆنیال دەگەڕێتەوە بۆ ۱۹۲۰، کاتێ لە دوای کارەساتی کۆنفرانسی سان ریمۆ، سووریا و لبنان بوونە ژێردەستەی فرەنسا. هەر لە ۱۹۲۵-۲٦دا، راپەڕینێکی ناشنالیستی گەورە رووی دا لە دژی فرەنسا، کە دواجار لە ۱۹٤٦ رۆیشت، هەروەها لە ۱۹٤۷دا پێکهاتەگەلی وڵاتی پۆستکۆلۆنیالی پێکهاتبوو لە کودەتای سەربازی یەک لەدوای یەک تا ۱۹۵۸ کاتێ سووریا و میسر دەستیان لەناو دەستی یەک نا بۆ پێکهێنانی کۆماری یەکگرتووی عەرەبی (UAR). ئەمە سەری نەگرت و لە ماوەی دوو ساڵدا پارتی بەعسی سووریایی یەکەتییەکەی شکاند. دەسەڵاتی گرتە دەست تا شەڕی عەرەب - ئیسرائیل لە ۱۹٦۷، تێیدا سووریا بەرزاییەکانی گۆلانی بە ئیسرائیل دۆڕاند، دوای ئەوە حافز ئەسەد دەسەڵاتی گرتە دەست. بەم شێوەیە سووریا

هەرگیز ئەزموونی شتێکی نەکردووە بەناوی فەزای دیموکراتی. دیارە کە خۆپێشاندان و قوربانییەکانی ئەمڕۆ زادە و بەری ئەو توندوتیژییەن. پێگەکانی ئەو فەزا گشتییە زۆر پشت ئەستوورن بەوەی لە لیبیادا روو دەدەن. هێزەیلی دژە شۆڕش کە دەتوانن ببنە هەڕەشەیەکی کوشندە بۆ راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی لە مەنجەڵی لیبیادا کۆ بوونەوە، تێیدا هێزەیلی ئەمەریکا و ناتۆ لای یاخییانی لیبیاییان گرت. پەیدابوونی تەشتی دەریای ناوەڕاست وەک شانۆیەکی نوێ بۆ ئۆپەراسیۆنەکانی ناتۆ پێویستییەکی تایبەت ئاشکرا دەکا بۆ دووبارە پێشاندانی ماسولکەی سەربازی تا نەک هەر تەنیا ئاکامەیلی رادیکالی شۆڕشەکان کۆنترۆڵ بکەن بگرە ئاکامی دیموگرافی و ئابووریشی بخەنە ژێر باڵی خۆیان.

ئەوەی ئێمە لە ناوچەکەدا دەیبینین، لە بزووتنەوەی سەوزی ۲۰۰۹ تا بەهاری عەرەبیی ۲۰۱۱ و ئەولاتریش، بانگەشەیەکی سیستماتیکی و فراوانە، خۆپێشاندانی گەورە یەک لە دوای یەکی فەزای گشتی کەوا سەردەمی پۆستکۆلۆنیالی بە بەتاڵی بەجێی هێشتن. ئەم راپەڕینگەلەی گوێزەرانە کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر یەک هەیە، جێی خۆیان دەکەنەوە. گرینگ نییە وڵاتەکان چی دەکەن، فەزای گشتیی فراوانبوو بواری ئۆپەراسیۆنەکانی رێژیمگەلی حوکمڕان سنووردار دەکەن.

## فرۆشتنی دەریا لە پێناو مانەوە لە دەسەڵات

لە "پایزی پیاوسالار"ی گابریێل گارسیا مارکیز (۱۹۷۵)دا، یەکێ لە شتە سەیرەکانی جەنەراڵی گەردوون ئەوەیە دەریای کاریبی بەو ئەمەریکییانە دەفرۆشێ کە دێوەزمەکەیان لە دەسەڵات پاراستووە.

جەنابی هێژا، رێژیمەکەت بە هیوا یان تەوافوق یان تیرۆر درێژەی نەکێشا، بگرە بەهۆی وەهمی خراپی کۆن و کپییەکی بێدەنگ بوو. جەنابی هێژا دەچییە دەرەوە و سەر شەقام و لە

دەموچاوەکاندا راستی دەبینی. جەنابی هێزا ئێمە وا گەیشتینە لووتکە، یان ئەوەتا مارێنز دەنیشێتەوە یان ئێمە دەریا دەگرین، هیچ ڕێیەکی تر نییە، جەنابی هێزا، هیچ ڕێیەکی تر نەبوو...
دەریای کاریبیان لە نیساندا برد، ئەندازیارانی دەریایی باڵوێز ئێوینگ کاریبیان کردە دەیان پارچە و بردیان لە شوێنێکی دوور، دوور لە لافاو و هاریکاین و کازیوە سووره خوێناوییەکانی ئەریزۆنا بیرۆێن، بەهەموو شتێکەوە بردیان، بەڕێز جەنەراڵ، ئەوەی لە ناویدا بوو بردیان.

باشە بۆچی جەنەراڵەکانی گەردوون، رۆهەلات و رۆئاوا، باشوور و باکور، قەت ئەو رۆمانانە ناخوێننەوە بۆیان نووسراوە؟ ئەمە کارەساتە. وەک جەنەراڵەکەی ناو "پایزی پیاوسالار"، سەرۆک و براگەورەی شۆڕشی لیبیایی، موعەممەر قەزافی، دەریای ناوەڕاستی دەفرۆشت بە ئەمەریکییەکان هاوپەیمانانی ئەوروپییان، ئەگەر بیتوانیبا وای دەکرد تەنیا بۆ ئەوەی لە دەسەلات بمێنێتەوە. کێشەی قەزافی ئەوە بوو ئەوان چیی تر ناکرن، بەلانی کەم لەوی ناکرن. ریالیزمێکی سیحراوی لە بەردەمی مێژووە. ئێمە پێی رادەگەین. کۆمەڵگەی جیهانی، کۆمەڵگەی راستەقینەی جیهان، نەک ئەو چینە دیپلۆماسییەی کە کۆدەکەی UNSGە (ئەنجوومەنی تەنیاییی نەتەوە یەکگرتووەکان) فڕێ دراوەتە نێو زەلکاوێک و پەلکێش کراوەتە نێو رارایییەکی ئەخلاقی: لە نێوان ئەو شتە دەبێ یەکێ هەڵبژێرێ: لێ گەڕێن ستەمکارە دڕندەکە نەتەوەیەک لەناوبەرێ یانیش بوەستن و ببنە دووڕووی ئەو راستییەی کەوا ئەمەریکا و هاوپەیمانە ئەوروپییەکانی هەیانە تا شوێنێک بۆ خۆیان دەدۆزنەوە لە رووداوگەلی ئەفریقیای باکور و ئەولاتریش. بەلام ئەم رارایییە ئیختیارێکی هەڵەیە: وەلامەکە ئەوەیە هیچیان هەڵنابژێرن.

بەهۆی پاڵنان بە ئەمەریکا تا بچێتە ناو شەڕێکی تر لە دژی وڵات-نەتەوەییەکی سەروەر، قەزافی پێگەیەکی سەربازیی داوەتە ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی لە ناوچەکە و کاریگەری هەیە لەسەر توانەوەی دەسەڵاتی وڵات و سەروەریی نیشتمانی لە لیبیا. بەم کارە، هەروەها سوپاس بۆ شۆڕشەکان کەوا ئێستە کیشوەر دەبڕن، ئێمە نەگەڕاینەوە سەردەمی لاڤیتا نودای جۆرجیۆ ئگامبن، بگرە چووینە ناو ئەسسەبیەی ئیبن خەلدون. ئێمە دەستەوسان نەوەستاین لە بەردەمی ئەو کارانەی تیرە و پۆستمۆدێرن کە تژین لە توندوتیژی. ئێمە لە پرۆسەی چاوکرانەوەداین، هۆشیاری بۆ پابەندبوون و ناسنامە کە دەتوانێ حوکم بەسەر ئەو دڕندایەتییە بدەن، دڕندایەتیی قەزافی و هەموو ئەوانەی یەکەم جار چەکیان پێ دەفرۆشت و ئێستەش دەیانەوێ چەکەکانی تێک بشکێنن. ئێمە ئەمە دەکەین بەهۆی ئاژانسی مێژوویی، هونەری سیاسی و لە سەروو هەمووشیانەوە ڕێی ڕاستی ئەخلاقی.

بینین لەنێو ئەو دەوەنە چڕەی ئەم ڕووداوگەلە کارێکی وەها ئاسان نییە، بەڵام دەبێ بتوانین ببینین. ڕۆشنبیرانی پێشەنگی عەرەب هەوڵیان دا هاوسەنگییەک بنوێنن لە نێوان پشتگیری بۆ ڕاپەڕینگەلی لیبیایی و پشتگیری یان نەرمی بنوێنن بەرامبەر بە کردەی ئەمەریکا. دوو ساڵ پێش ڕاپەڕینگەلی لیبیایی، ئەگەر سەرۆک ئۆباما پەشیمان نەبێ لە ناوهێنانی نەدا ئاقا سوڵتان، ئەو ئافرەتە گەنجەی کە خوێنی سارد کرایەوە و کوژرا لەلایەن هێزمیلی تەناهیی کۆماری ئیسلامی لە ڕۆژی ڕاپەڕینی بزووتنەوەی سەوز، گەلێک لە باڵی چەپ خێرا ئەو ناوهێنانەیان خوێندەوە وەک ئاماژەیەک بەوەی کە بزووتنەوەکە لە ڕاستیدا کاری سی ئای ئەیە و سعوودیە پارەکەی دەدا. ئێستە هەمان خەڵک هەست بە شەرمەزاری دەکەن کاتێ سەرۆک ئۆباما دەسەڵاتی سەربازیی خۆی بەکار هێنا (شان بەشانی دەسەڵاتی یەکەتیی ئەورووپا و ناتۆ) بۆ بۆردمانکردنی سوپای قەزافی بۆ

پشتگیریی راپەڕینی دیموکراتی لە لیبیا. شەرمەزارییەکی پێشووتر ئەو ڕاستییە بوو کەوا سوپای میسری بوو بە ناوەندێک لە سەرکەوتنی شۆڕشی میسری. ئەو پارەیەی سی ئای ئەی تەرخانی کردبوو بۆ گۆڕینی ڕژێم لە کۆماری ئیسلامی هیچ نەبوو بە بەراورد لەگەڵ وەبەرهێنانی ئەمەریکا لە ڕاهێنانی سوپای میسری بۆ چاودێریکردن و پاراستنی پرۆژەگەلی ئیمپریالی لە ناوچەکەدا. بەڵام ئاخۆ کام لەم دوو کەیسە شەرعیەت، ڕاستگۆیی و بنکردایەتیی بنەڕەتیی شۆڕشی میسری یان ڕاپەڕینی لیبیاییی تێک دا؟ وەڵام ئەوەیە: هەر زۆر کەم. شۆڕشی میسری نموونەیەکە بۆ تەواوی جیهانی عەرەبی، هەروەها ئەو جیهانەش دەیتوانی تەنێ پشتگیریی هاوشێوە دەربڕێ بۆ ڕاپەڕینی لیبیایی لە دژی ستەمکاری ناوخۆ و باڵادەستیی بیانی، بێ گوێدانە کردەیلی توخمگەلی ئیمپریالی ئەمەریکا و یەکەتیی ئەورووپا کە دەیانەوێ بیشێوێنن. تاکە شەرمەزاری کە مایەوە چەند ڕێیەک بوو بۆ چەپەکان بۆ درککردن بەسنوورەکانی خەیاڵی ئەخلاقی و سیاسیی خۆی.

بۆ ئەوەی دادوەرانە قسە بکەین، چەپ تاکە بلۆکی بیرمەندان و چالاکوانان نەبووە لە کێشەی مەزهەبیدا، لەگەڵ یان دژی کردەی ئەمەریکا بێ لە لیبیا. گرووپێک کە نزیکەی هەموویان سکۆلەری ئەمەریک و کارمەندەیلی سینک-تانکن نامەیەکی کراوەیان نووسی بۆ سەرۆک ئۆباما پەلەیان لێ کرد دان بە حکوومەتی نیشتمانیی هاوپەیمان لە لیبیا بنێ، پڕ چەک و پشتگیریی بکا. هیچ جۆرە نامەیەکی وەها لەلایەن هیچ یەکێ لەو تاکانە نەنووسراوە داوا لە سەرۆکی ئەمەریکا بکا دان بە حەماس دابنێ، پڕ چەک و پشتگیری بکا، بۆ نموونە، یان حزبوڵڵا، بۆ بەرەنگاربوونەوەی دڕندایەتییەکانی ئیسرائیل. هاوکات، شێخ یوسف قەرەزاوی گوتی ڕاپەڕینی دیموکراتی لە بەحرێن هەر تەنیا مەزهەبی نییە، ئەمەش ئاماژکەیەکی ڕوونە کەوا پەڕپووتی ئەخلاقی و سیاسی هەر تەنیا سیفەتی عەلمانیەتی چەپ یان

راست نەبوو و ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە کات و ساردکردنەوە و تۆزاویکردنی ئیسلامیزم.

لە مەنجەڵی لیبیادا هەموو بەزی سیاسەتی بێهیوایی دەتوایەوە. ئەوەی هەمــوو ئەم هەڵوێستـانـە لەسـەر لیـبیـا و ئەوانی تریش پێشـانی دەدەن راستـیـیـەکی بنەڕەتییـە، وەک مـەڕوان بیـشـارە باسی کـردووە، لەبارەی "تەنازول"ی دەسـەڵاتی شـەرعـیی وڵاتـان کـەوا هیـچـیـان نەبوو جگە لە توندوتیژی بەرامبەر بە هاووڵاتییانیان، هەروەها ئەمە بووە هۆی کرانەوەی فەزای گشتی کـە تێیدا باس لە ئازادی و سـەربەخـۆیی کرا. لە مـەنجـەڵی لیبـیـاییدا، ئەمـەریکا، ناتۆ، قەزافی و یاخـیـیـەکان وەک یـەک دەسـووتان بۆ بەکارهـێنانی دەسـەڵاتی سـەربازییان، هەریـەکە لۆجیکی ئەوی تری بە درۆ دەخستەوە. دەنگ و دەسـەڵاتی خەڵک سەرکەوت، هەتا کاتێ دەنگیان کپ کرا لەلایەن نەڕەی فڕۆکەکان و دەنگی چەک.

سـەرکۆنەکردنی بە بەرنامەی توندوتیژی، جا لەلایەن قەزافی، سارکۆزی یان ئۆبامـاوە بێ، هەڵوێسـتێکی ئەخـلاقییـە، نەک پێشنیـازێکی سـیـاسی. هاریکاریی بێ مــەرج بۆ ویسـتی دیموکـراتی گـەلێک کـەوا ژیانی خـۆیان کردووەتە قوربانی، لە تارانەوە بۆ سـووریا، بۆ لیـبیـا و ئەولاتریش، هەرگیـز نابێ بکرێتە موڵکی هەر لایەنێکی سیاسی، یانیش ڕێ بدرێ ئەمـەریکا، یان زایۆنییە فرەنسییەکان بە باشترین شێوە بیرفێنن. لە کارە بەناوبانگەکەی بەناوی "بنچینـەی کاری مـیتـافـیزیکی ئەخلاق، ١٧٨٥"، ئیمـانوێل کـانت پێـشنیـاز دەکـا ئێـمـە یان نابێ هیـچ کارێک بکەین یانیش دەبێ ویسـتمـان هەبێ تا کارێئێمە ببێتە یاسایەکی گەردوونی. ئەمە یاسایـیەکی ئەخلاقییە، نەک هاوسـەنگییـەکی سیـاسی، مـەندوبێکە بەهـۆیەوە خـەیاڵێکی ئەخـلاقی دەتوانێ کـۆمــەڵگەیەکی هاووڵاتی و هاووڵاتیـبــوون پێک بهـێنێ، نەک پێشـنیازێکی سیاسی بەهۆیەوە لەوانەیە سیاسـەتێک دروست بێ، یانیش لە غـیابیـدا، سـەقـەت بێ. وڵاتان پێشنیـازی ئەخـلاقی نین، بگرە سیـستـمی

سیاسین. بۆیە ولاتان نزیکەی بە هەمان شێوە کار دەکەن وەک چۆن ماکس وێبەر لە سەرەتای سەدەی بیست پێناسەیان دەکا وەک سیستەمێکی سیاسی کە توندوتیژیی رەوا قۆرخ دەکا. وێبەر هەردەم ئەو شەرعیەتییەی بەجیا رەچاو کردووە: سیاسەتێک لەوانەیە ئەو شەرعیەتە بدا یان بیکشێتەوە لە ئامێرێکی ولات. لێکۆڵینەوە لە ولات، ستەمکارێکی وەک لیبیا یان دیموکراسییەکی وەک ئەمەریکا، بە شەرعییەت گرێبەستێکی سیاسییە دەوەستێتە سەر ئیختیاری ئەخلاقی، کوشتنی هاوولاتییانی خۆت یان داگیرکردنی ولاتێکی تری خاوەن سەروەری دڕندایەتییەکی سیاسییە و ئەو گرێبەستە ئەخلاقییە هەڵدەواسێ، لە کاتێکدا ولات شەرعیەتی خۆی لەدەست دەدا. ئێمە وەک هاوولاتی، وەک گەل، نابێ هەرگیز ویستێکی سیاسیمان هەبێ تا فەرمان بە هێرشی سەربازی بکەین یان بۆردمانکردن بکەین، چونکە ئەمەیان دەبێتە نرخێکی زۆر گرانی ئاژانسی ئەخلاقیمان بۆ وەبەرهێنان یان کشاندنەوەی شەرعیەت لە ئامێری ولات کە دانراوە بۆ نوێنەرایەتیکردنی ویستی ئەخلاقیمان. ئێمەی گەل هەرگیز راوێژیمان پێ نەکرا ئەو دەمەی بای ملیۆنان دۆلار چەک فرۆشرا بە قەزافی لەلایەن ئەمەریکا و بەریتانیا. هەروەها ئێمەی گەل هەرگیز پرسمان پێ نەکرا ئەو دەمەی بڕیاری ١٩٧٣ی ئەنجوومەنی تەناهیی یو ئێن پەسند کرا. کەوایە بۆچی ئێمەی گەل بخرێینە ئەو هەڵوێستەی داگیرکردنی لیبیا بەسەرکردایەتیی ئەمەریکا پەسند یان سەرکۆنە بکەین؟ ئێمە هەرگیز لەو ئاستەدا نین و نەبووینە تا بڕیار بدەین. بەلام هەردەم لەو ئاستەداین و هەرواش دەمێنینەوە بۆ بەرگەگرتنی شایەتیدان، حوکمدان و کارکردن بەپێی دۆخەکە، هەروەها ئەوەی ئێمە دەیبینین لە کیشوەرێکەوە بۆ یەکێکی تر پێش هەموو شتێ یەکەم یاخیبوونی ئەخلاقییە، بۆیە پێدادەگرین لەسەر ئەوەی ئەو ناوەی لێ بنێین، داوایەکە بۆ شکۆمەندی.

دەستگرتن بە بنچینەمانەوە وەک بریکاری ئەخلاقی، بۆ ئێمەی گەل،

لیبیایی، فرەنسی، بەریتانی، ئەمەریکی و... هتد، ئەمەریکا و هاوپەیمانە ئەوروپییەکانی، تەنانەت قەزافیش، دۆڕاوی یارییەکەن، یان دەبن، زوو یا درەنگ دەدۆڕێنن. ویستی دیموکراتییانەی گەلی لیبیایی هەر سەرکەوتوو دەبێ و بەسەر هەموو ئەمانەدا زاڵ دەبێ. تاکە پرسیار ئەوەیە چۆن ئەمە دەکرێ. قەزافی ئەم راپەڕینە دیموکراتییەی لە خوێن وەردا، ئەمە رێی پێ نادرێ شێوە وەرگرێ لە ئیختیارەکانی سەردەمی دوای قەزافی. گەلی لیبیایی، زاراوەیەکی گشتییە و ناکرێ کەم بکرێتەوە بۆ ئاستی یاخییەکان کە چەکیان هەڵگرتووە بگرە دەبێ بە داهاتوویەکی مەدەنی و دیموکراتییانە سەیر بکرێن، دەبێ بیر لە دروستکردنی دامەزراوەگەل بکەنەوە، لە جیهانێک کە تەواو جیاوازە لەو دوکتۆرەی دیموکراسی کە لە قوتابخانەی لەندەن بۆ ئابووری هێنراوە بۆ سەیفولئیسلامی قەزافی، ئەو پیاوەی کە دەبێتە پاشا.

کلێشە و پێکهاتە کۆنەکانی هاریکاری یان ئۆپۆزیسیۆن چیی تر مانایان نەماوە. نە هاریکاریی کوێرانە بۆ پێکهێنانی دامەزراوەی باشی دیموکراسی، نە لێکترازاندنی ئۆپۆزیسیۆن بۆ ئیمپریالیزم بۆ نێو راپەڕینگەلی دیموکراتی گوماناوی، بەشێک لەو رەوش و سیاقە پێک دێنن، ئەم بەشە برێتییە لەو ساتە مێژووییەی شۆڕش کە دەمێکە چاوەڕێمان دەکرد.

ئێمە دەبێ چاوێکمان لە دیارییەکە بێ، ئەویش ویستی دیموکراتی گەلە، رادەپەڕن بۆ داواکردنی دامەزراوەی باشی ئازادیی مەدەنی و دادوەریی کۆمەڵایەتی. یو ئێن وەک چەکێکی دیپلۆماسیی ئەمەریکا و هاوپەیمانە ئەوروپییەکانی و تۆقینە ئیمپریالییەکان کار دەکا، هەروەها بەهیچ خەیاڵێک نوێنەرایەتیی ویستی گەل ناکەن لە سەرانسەری جیهان. ئەمەریکا هیچ دەسەڵاتێکی ئەخلاقیی نییە تا لای راپەڕینگەلی دیموکراتی بگرێ، هەروەها ناتۆ سەرکۆنەی کوشتارەکەی قەزافیی کردووە بۆ خەڵکی خۆی بۆ ئەوەی هەر لە دەریای ناوەڕاستدا بمێنێتەوە و بیکاتە شانۆیەک بۆ

ئۆپەراسیۆنەکانی خۆی.

ڕاپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی واقیعن، شەرعیەتیان تەواوە و هیچ قسەیان لەسەر نییە. نابێ لە ئاستیان کەم بکرێتەوە بەهۆی لەدەستدانی ئۆتۆنۆمییان، واتە شەرعیەتیان لەدەست دا بەهۆی هەوڵگەلی دووڕووان و هەلپەرستان بەهۆی دەسەڵاتگەلی سەربازی بۆ لە باوەشگرتنی یان کپکردنی. ئەوەی میسرییەکان دەستیان کەوتووە لە گۆڕەپانی تەحریر بیرۆکەی خودی دیموکراسی نوێ دەکاتەوە. هەروەک جۆرجیۆ ئاگەمبن لەبارەی ئەورووپای هاوچەرخەوە دەڵێ:

ئەمرۆ ئێمە پشتگیریی زەبەلاحی و باڵادەستیی حکوومەت و ئابووری دەکەین، ئەوە گرینگترە لە هەر شتێک ئێوە پێی دەڵێن سەروەریی جەماوەری، ئەمە دەربڕینێکە ئێستە هەموو ماناکان لەخۆ دەگرێ. وڵاتانی دیموکراسیی رۆژئاوا باجی کەلەپوورێکی فەلسەفی دەدەن چونکە بۆ ماوەیەکی درێژ خۆیان ئەزیەت نەدا لە نزیکەوە سەیرێکی بکەن.

هەروەها دەڵێ: بیرکردنەوە لە حکوومەت وەک دەسەڵاتێکی سادەی جێبەجێکار هەڵەیە و یەکێکە لە هەڵە هەرە کوشندەکان کرابێ لە مێژووی سیاسەتی رۆژئاوا. گۆڕەپانی تەحریر ئەمڕۆکە پێگەیەکی سیمبولی دووبارە بیرکردنەوەیە لە تەواوی فەلسەفەی سیاسی کە خۆشحاڵانە دەتوانێ زاڵ بێ بەسەر کارەساتی بێ مانای "رۆژئاوا"ی تژی لە کۆد چونکە ئەو حکوومەت پێناسە دەکاتەوە بەزاراوەی زۆر نزیکتر لە سەروەریی جەماوەری، تەنانەت پێش ئەوەی وەربگێڕدرێتە سەر دامەزراوەگەلی ئازادیگەلی مەدەنی. وێ دەچێ نە حکوومەت و نە ئابوورییش (پرسە کاریگەرەکان لە چەمکی شۆڕشی هەننا ئارندت) لە راستیدا مەرامی سەرەکیی ئەو شۆڕشانە نین، کە لەوانەیە لە باتیان ویستی سیاسیی گەل بن، بەدامەزراوەییکردنی کۆمەڵایەتییە و، بەچەمککردنی فەلسەفی و تیۆری.

## دروستکردنی بزووتنەوەی مافەیلی مەدەنیی سنووربڕ

لەوەتەی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی سەوز لە ئێران لە حوزەیرانی ٢٠٠٩، من ناوم لێ ناوە "بزووتنەوەی مافەیلی مەدەنی". ئەم ناولێنانە دەکەوێتە ژێر کاریگەریی دوو هەلومەرج: یەکیان، ئەم پرسیارمیە "کوانێ دەنگم؟"، کە دەگەڕێتەوە پێش سەردەمی کۆماری ئیسلامی، ئەم پرسیارە هەر دەمێنێتەوە، دووەمیان، ئەوەیە یان کۆماری ئیسلامی ئەم بزووتنەوەی مافەیلی مەدەنییە دەحەوێنێتەوە و دەژی یانیش وا ناکا و رای دەماڵی. هێزی شۆڕشگێڕیی بزووتنەوەی سەوز دەکەوێتە ناو داواکردنی ئازادیگەلی مەدەنی و دەستەبەرکردنیان، ئەمەش خاڵی لەتکردنی ئەمەریکییە لە نێوان شۆڕشگەلی فرەنسی و ئەمەریکی. بوون یان وێرانبوونی کۆماری ئیسلامی نیشانەی بزووتنەوەکە دەخوێنێتەوە کە "گۆڕینی رێژیم"ە، پارێزکاری نوێ و لیبرالەکانی ئەمەریکا، ئەوانەی کاریگەریی کۆماری ئیسلامییان لەسەرە، ئەوانیش مەبەستەکە بەگۆڕینی رێژیم دەخوێننەوە، یەکیان لەبەر سەرسامی و پشتگیریی ئێرانە، ئەوی تریان لەسەر گاڵتە و سووکایەتیکردنە بە ئێران. "گۆڕینی رێژیم" لەو کاتە بەدواوە، زاراوەیەکی کۆدی سیاسییە لە گوتاری نوێی واشنتۆندا، هاوکات زاراوەیەک کۆماری ئیسلامییش کەیفی پێ دێ، چونکە بەکاری دێنێ بۆ داماڵینی متمانەی بزووتنەوەی سەوز و دەیبەستێتەوە بە ئەمەریکا و ئیسرائیل. بەڵام لە ناخیدا، بزووتنەوەی سەوز هەر بزووتنەوەی مافەیلی مەدەنی دەمێنێتەوە، کە باڵە چاکسازی و شۆڕشگێڕییەکانی یان ئەوەتا هێزێکی میانڕۆیانەتر یان رادیکالانەتری پێ دەدەن.

ئەمە هەڵسەنگاندنی من بوو بۆ بزووتنەوەی سەوز پێش سەرهەڵدانی بەهاری عەرەبی، کە ئەویش لە سەرەتای حوزەیرانی ٢٠١١دا گوتم دەکرێ بە بەشێک لە وەڵامی بزووتنەوەی سەوز بێتە تەماشاکردن، ئێستەش هەر

هەمان قسە دەکەم. بەهاری عەرەبی جوگرافیای خەیاڵی ناوچەکە دەگۆڕێ لە ڕێگەی نزیکترکردنەوەی هەموو ئاسۆکانی بزووتنەوەکە و پێدا پێدا شۆڕشگەلی ئێرانی-عەرەبی، سونە-شیعە، ناشنالیست-سۆشیالیست، لەتبوونی عەلمانی-ئیسلامی دوور بخاتەوە لە ڕەگەزپەرستی. جەزیرە لینکێکی گرینگی گەیاندنە لەنێو وڵاتانی عەرەبی و بەرەی سەرەکییە لەم ڕاپەڕینگەلە شۆڕشگێڕانە، ئەمە شتێکە نکوڵیی لێ ناکرێ. ئێران وڵاتێکە بە عەرەبی قسە ناکا (بێ لە هەندێ بەشی بچووکی باشووری ئێران)، بۆیە بەر کاریگەریی جەزیرە ناکەوێ. کەناڵی جەزیرەی ئینگلیزی زۆر گرینگە لە بەگەردوونیکردنی ڕاپەڕینگەلی دیموکراتی ناوچەیی.

شۆڕشەکان گەردوونین، لە وڵاتێکەوە دەپەڕنەوە بۆ وڵاتێکی تر و دەشگەڕێنەوە، حکوومەتەکان لە بنڕا هەڵدەتەکێن و دەگۆڕێن، بۆیە پێگەی نوێی خۆیان دەبێ، سووکایەتی دەکەن بە حوکمڕانی جێگیر (لە ڕاستیدا بەهاری عەرەبی بیرۆکەی بنەڕەتی حوکمڕانی بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕی ئەرک و پێکهاتەی بۆ دروست دەکا)، ئەمەش جێگرەوە بۆ بەرهەمی مەعریفە پێویست دەکا، واتە، ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز چیی تر ئەو ڕۆژنامەیە نییە تاکە سەرچاوەی تۆمار و متمانە بێ. دژایەتیی نهێنی (نموونە، بەڵگەنامەکانی فەڵەستین لەلایەن ویکیلیکس بڵاو کرایەوە)، دژایەتیی زانیاریی هەڵە، دژایەتیی شاردنەوەی شتەکان لە ڕێی پڕوپاگەندەوە ئێستە بووە کارێکی گرینگ بۆ خوێندنەوەی واقیع. ئەم هەموو پرسیارە هەر تەنیا بەرهەم نین، بگرە پەرتبوونی زانیارییەکەیە. ئەو ڕێژیمەی گرێ دراوە بەو سیاسەتە وا ئێستە دەگۆڕێ، بەهۆی گۆڕینی ئەو جیهانانەی ئێمە تێیاندا دەژین، ئەمەش تەنیا لە ڕێی بەرهەنگاربوونەوەی دەسەڵات نییە. گەردوونیبوونی ئەم ڕاپەڕینگەلە شۆڕشگێڕانەیە، لە ئاکامدا، ڕەچەی خۆی دروست دەکا بەهۆی فراوانبوونی فەزای گشتی بەشێوەیەکی سیستماتیکی و بەردەوام، ئەمەش گرینگە بۆ پیادەکردنی ئازادیگەلی مەدەنی.

زاراوەی "بزووتنەوەی مافەیلی مەدەنی" پێویستی بەهەندێ سیفەت هەیە، لەبەرئەوەی زاراوەکە زۆر شووراوەتەوە لە ماوەی نیو سەدەی رابردوودا و هەروەها زیاتر خراوەتە پاڵ چینێکی مامناوەندیی خۆشحاڵ. هەروەک تۆماس ف. جاکسن خستوویەتە روو لە کتێبە گرینگەکەی بەناوی "مافەیلی مەدەنی بۆ مافەیلی مرۆیی: مارتن لوسەر کینگ جونیەر و، خەبات لە پێناو دادوەریی ئابووری، ۲۰۰٦" بزووتنەوەی مافەیلی مەدەنیی ئەمەریکی، کە مارتن لوسەر کینگ ئەخلاقی و سیاسی رابەری بوو، زۆر رادیکالتر بوو لە داواکارییەکانی بۆ دادوەریی ئابووری، ستایش بۆ دیموکراسیی کۆمەلایەتیی ولاتانی سکاندەناڤی و، رەخنەی رادیکالی لە سەرمایەداریی ئەمەریکی. ئەگەر بێتو لەگەڵ تۆماس جاکسن بەنێو سەرهەڵدانی بزووتنەوەی مافەیلی مەدەنیی ئەمەریکادا بچین، دەبینین چۆن لە رێی پێشڤەچوونی ئەم رووداوە گەورانەی وەک مۆنتینیگرۆ، ئەلبانیا، بێمینگهام و رێپێوانەکانی واشنتۆن، تێگەیشتنێکی رادیکالانەتر بۆ ئەم رووداوە گەورانە پەیدا بوونە. لە کەیسی ئەم راپەرینگەلە شۆرشگێرییانەی ئێستە لە گەلێ شوێنی ئاسیا و ئەفریقیا، ئێمە بزووتنەوەیەکی سنووربڕی مافەیلی مەدەنی دەبینین، بزووتنەوەیەک تژی لە داواکاری بۆ گرێنتیی دامەزراوەیی دادوەریی ئابووری، شتێکە ئەم ولاتانەی پڕ کردووە لە ماوەی نیو سەدەی رابردوودا لە ماوەی سەردەمی پۆستکۆلۆنیالدا.

من پێشنیازم کردووە باڵی ئێرانی راپەرینگەلی دیموکراتی لە ناوچەکان بەشێوەیەکی دیالێکتیکی بەرادیکالی کراوە. ئەم پێگەیە سەری لەوانە شێواندووە کە هاوسۆزن لەگەڵ خوێندنەوەکەم و ئەوانەش کە دژین. بزووتنەوەی سەوز بەرادیکالی کرابوو وەک وەلامێک بۆ بەهاری عەرەبی، کە تێیدا داوا بۆ ئازادیگەلی مەدەنیی بە پەلەتر و باشتر خرانە روو، بۆیە دەبوایە لەسەر بنچینەیەکی رێکخراوەیی دەست پێ بکا و کرێکار، ئافرەت و رێکخراوگەلی خۆبەخشانەی ئافرەتان و قوتابیانیش بگرێتەوە. راپەرینگەلی

دیموکراتی کاریگەرییەکی گشتگیرییان هەبوو، کاریگەرییەکی سنووربڕ کە کاریان لە هەموو ڕووداوگەلی نیشتمانی کرد. کەواتە مەبەستم لە "بەرادیکالیکردن" واتە داوای ئازادیگەلی مەدەنی، سەربەخۆبوونی یەکەتییەکانی کاریش دەگرێتەوە، ڕێکخراوگەلی مافەیلی ئافرەتان، ئەنجوومەنگەلی قوتابیان، هەموو ئەمانە بەرادیکالی کرابوون، ئەمە زۆر پێویست و بەپەلە بوو بۆ بزووتنەوەی سەوز بۆ کێڵانی پێوەندییەکی چالاک لەگەڵ بەهاری عەرەبی، هەروەها بۆ هەردوو بزووتنەوە بۆ قووڵکردنەوەی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانیان بۆ نێو کەرتگەلی تایبەتیتر.

بەرادیکالیکردنی ڕاپەڕینگەلی دیموکراتی مانای ئەوە نییە بزووتنەوەکان پەنا ببەن بۆ کاری توندوتیژیی کوێرانەی نابەجێ، کە ڕێژیمگەلی حوکمڕان دڕندانە سەرکوتیان دەکا، ئەمە بەرسڤێکە ئێمە لە ئێران، سووریا، بەحرێن و لیبیا بینیمان. ئەمانە کاتی بێهیواییێن، لە ئەوروپا، لە ئەمەریکای باکور و لە جیهانی موسڵمان و عەرەبان. پێویستە ئێمە رادیکالانە جارێکی تر بیر بکەینەوە ئەمە مانای چی دەبێ، هەروەها بە چ میکانیزمگەلێکی تایبەت، جیهانێکی دادوەرانەتر و هاوسەنگتر بنیات بنێین. بەرەنگاری بەردەوامی خەڵکی بێ چەک، ئەو جۆرەی ئێمە لە سووریا بینیمان بەتایبەتی لەوەتەی ئاداری ۲۰۱۱، هەرچەندە توندوتیژ نەبوو بەڵام داواکان رادیکالی بوون، لە چاکسازیی دەستووری تێپەڕیان کرد بۆ ڕووخانی ڕێژیم، ئەمە ڕێ خۆش دەکا کەوا داهاتووی دیموکرات لە ڕێی کێڵانی بازنەی گشتی و گفتوگۆی مەدەنییانەوە دەبێ. هەرچەند توندوتیژیی کوێرانە خەوشدار و بێ کاریگەر بێ، ئەوا گوێڕایەڵنەبوونی ناتوندوتیژیی مەدەنی هەرگیز سەرکەوتوو نابێ تا بزووتنەوەکان دەست نەکەن بە تێکەڵبوون لەگەڵ خەڵکی ئاسایی و پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی کرێکاران، ئافرەتان و بزووتنەوەگەلی قوتابیان. جووڵاندنی ئەو پێکهاتانە هۆیەلی سەرەکین کەوا دەتوانن سەرکەوتنی ڕاپەڕینگەلی شۆڕشگێڕانە مسۆگەر بکەن. ڕووخاندنی دیکتاتۆرێک لێرە و

لادانی شێخێک لەوێ یەکسان نابێ بە دیموکراسی یان دادوەری. ئەوەی پێویستە ئەمانەن: بەرگەگرتن، خەڵکی گشتی و دەزگە خۆبەخشەکان کەوا داوای ئازادیگەلی مەدەنی و مافەیلی دیموکراتی دەکەن، بەزاراوەی تایبەت و ورد داوای دەکەن و بەدەستی دێنن. پێکهاتەی ئەو دەزگایانە هەر تەنیا دەسکەوتگەلی دیموکراتی ناپارێزن بگرە زاراوەکانی تێکەڵبوون بەچوارچێوەی گەورەتری سەربازیی ئەمەریکا و هاوپەیمانە ناوچەییەکانی دەگۆڕێ. سیفەتی ناتوندوتیژیی ئەم جۆرە پێکهاتانە ئەمەریکا و هاوپەیمانە ناوچەییەکان و هێزەکانی هاوشێوەیان رووت دەکاتەوە لە ناوەندی چەوساندنەوە یان بەلاڕێبردنی راپەڕینگەلی دیموکراتی.

سیفەتی ناتوندوتیژی و لەقکردنی بنچینەی راپەڕینگەلی دیموکراتی و بناخەکانی فەزای گشتی کە ئێستە وا دەست پێ دەکەن ئاکامیان دەبێ لەوپەڕی خلاسبوونی گەندەڵی و رووخانی رژێمگەل. پێگەی تازە پەیدابووی بازنەی گشتی و ناساندنی ئازادیگەلی مەدەنیی تەواوی بنکە سەربازییەکانی ئەمەریکا بێ مانا و پووچ دەکەن. ئەمە هەر تەنیا راست نییە بۆ فیرقەی کەشتیگەلی پێنجەمی ئەمەریکا لە بەحرێن، بگرە تەواوی ئۆپەراسیۆنە گەورە سەربازییەکانی ئەمەریکا لە ئەفغانستان و عێراق، گەورەترین بنکەی سەربازیی ئەمەریکا لە ناوچەکە، ئیسرائیل. تەواوی تۆڕی بنکەکان لە دیێگۆ گارسیا لەنێو زەریای هیندی، لە دەوری دەریای عەرەبی، کەنداوی فارس، بەدرێژاییی رێگە بۆ کەنارەکانی باکوری ئەفریقیا و تا سەرەوەی ئیسرائیل و پاشانیش بۆ باکوری ئاسیای ناوەڕاست و ناوچەی قەوقاس، بەکورتی، بنکەی ئیمپراتۆری ئەمەریکی بەتەواوی، هەمووی ئێستە لەژێر پرسیاردایە. بنکەکان ئێستە لەژێر مەترسیدان نەک لەبەر تاڵیبان لە ئەفغانستان یان قاعیدە لێرە و لەوێ، بگرە لەبەر شکۆمەندی و ئاکامەکانی گۆڕەپانی تەحریر و مەیدانی ئازادییە، لەوێ ویستی دیموکراتی ناتوندوتیژیی گەلان رووبەڕووی دووانەی ستەمکار و حوکمڕانەکان دەبنەوە.

ململانەی قارەمانانەی نێوان گەلی سووریا و دیکتاتۆریەتی بەشار ئەسەد بێنە بەرچاوت. سووریاییـیەکان راپەڕین لە دژی سەرکوتکردنی دڕندانەی راپەڕینگەلی ناتوندوتیژ و دیموکراتییان بەدەستی هێزی سەربازی هەفتە دوای هەفتە، مانگ دوای مانگ، کە بە هەزاران دەمرن و بە سەتان هەزاریش دەگیرێن، هەروەها تەنگژەیەکی گەورەی مرۆیی لەسەر سنووری سووریا و تورکیا. ئەوەی لە سووریا بەزێنراوە بە دەستی رووتی گەل هەر تەنیا دیکتاتۆریەتی ئەسەد نییە، بگرە لۆجیکی توندوتیژیی هێزی سەربازیی ئیسرائیلی و ئەمەریکی لە ناوچەکەدا.

## دەیەم

# یاخیبوونی دواخراو

لە وتارێکیدا بۆ جەزیرە لە سەرەتای سێپتێمبەری ٢٠١١ بەناونیشانی "وردەکاریی ئاڵۆزی لەتبوونی شیعە-سونە لە بەحرێن"، پسپۆڕ لە کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست شیرین سادقی سەرنج لەبارەی ڕووداوگەلی کراوە لە بەحرێن دوور دەخاتەوە لە گفتوگۆی سەرەکی لەبارەی لەتبوونی مەزهەبی و بردنی بەرەو مێژووی کۆلۆنیالی و ئیمپریالی و لەقکردنی پێگەی وڵاتە بچووکەکەی عەرەب و ئارەزووەکانی بۆ پێوەندیکردن بە بەهاری عەرەبییەوە. بەحرێن، وەک گەلێ وڵاتانی تر لە ناوچەکە و جیهان، سادقی دەڵێ، قوربانییەکی تری داڕشتنەوەی نەخشە بوو لەلایەن بەریتانیا، بەرژەوەندییەکانی بزنسی ئەمەریکی و هەروەها تێکەڵبوونی ئەو هێزانە. ئەم قسە پڕ مانایە ڕاستییەکە پاشماوەی داگیرکاری و مێژوویەکی تژی لە دڕندایەتی دەگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی ئەو مێژووەی داگیرکاری ئێستە بووەتە مێژووی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا. چەندان سەدەیە، بەریتانیا پشتگیریی هۆزی سونەی خەلیفەی کردووە، خێزانێکە بنەڕەتەکەی هی نیوچە دوورگەی سعوودیە، هەروەک حوکمڕانانی بەحرێن، خۆیان دەخەنە نێو هەر ماڵباتێکی خەلیفە کە خۆیان لە ئێران وەدوور دەگرن، یان گەورەترن لە بەرژەوەندییەکانی گەلی بەحرێنی و لە سەرووی بەرژەوەندیی بزنس و دەسەڵاتدا بن. بەواتایەکی تر، لەنگەرگرتنی بەرژەوەندییەکانی داگیرکاری تێکەڵ دەبێ بە فراوانبوونی ئیمپریالی ئەمەریکی، ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبوونی جیۆپۆلەتیکی ڕاستەقینە لە ناوچەکە، ئەمەش بەشێوەیەکی

سیستماتیکی ڕژێمگەلی حوکمڕان دوور دەخاتەوە لە گەلی خۆیان و دەیانخاتە ناو ڕەوتی داگیرکاریانەی خۆیان بۆ خزمەتی کۆمپانیا نەوتییەکان و بەرژەوەندییەکانی تریش.

هەروەک سادقی باسی دەکا، ڕژێمی حوکمڕان لە بەحرێن بەهەموو شێوەیەک هەموو داواکارییەکی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا و بەریتانیای داگیرکاریان جێبەجێ کردووە چونکە ئەو دوو داگیرکارە پاڵپشتیی دەسەلاتی ئەوێ دەکەن:

چەندان نەوەیە، حکوومەتی خەلیفە کاری سەرەتا و یەکەمی ئەوە بووە بەشێکی زۆری لە دانیشتوانی بەحرێنی سەرکوت کردووە و قەدەغە بووە بۆیان لە حکوومەت و هێزی سەربازی دەنگیان هەبێ، بۆ ئەوەی بسەلمێنێ کەوا خەلیفەی ژێردەستە هەر لە سەرەتاوە خزمەتی مەرامێکی کردووە و دەیکا. بەحرێنی ئەسڵی، ئەوانەی باو و باپیرانیان ئێرانییە، یان ئەوانەی شیعەن و لە حکوومەت قەدەغە کراون، بێ لە چەند وەزیرێکی چاورەش، هەموو ئەمانە بێبەش کراون لە خزمەتی سەربازی و هێزەیلی تەناهی. هەروەها جیاکارییان بەرامبەر دەکرێ لە کایەی پەروەردە و دەرفەتەکانی دامەزراندن، هەموو ئەمانە لە وڵاتێکدا دژی چینێک دەکرێ کە زۆرینەن.

ئەمە حوکمڕانیی مەزهەبی نییە. حوکمڕانیی خێڵەکییە درێژەی پێ دەدرێ لە بەرژەوەندیی ماڵباتی حوکمڕان کە خزمەتی ئیمپراتۆر دەکا. زۆرینەی حوکمکراو شیعەن. بەلام ئەگەر بێتو خەڵکی مەریخیش بن، ئەوا سروشتی ڕژێمەکە هەروەک ئێستە دەبێ کە هەیە. لە ئەنجامدا، بەحرێن، کە وڵاتێکی زۆر بچووکە، مایکرۆسۆمێکە لە تەواوی ناوچەکەدا، تێیدا تاکە جێگرەوە بۆ وەلاتانی ڕژێمگەلی گەندەڵ هەر چانسی سیستمێکی ئاینی ئیسلامی بووە.

بەڵام ئەمە جێگرەوەیەکی راستەقینە نەبوو، هەر ئەمەشە هێزی لۆجیک و مێژوویی بەهاری عەرەبی.

قسەکانی سادقی قورسایی مێژووی ژێردەستەیی دەخەنە روو لە کاتێکدا موسڵمان و عەرەبەکان وا کۆتایی ئیمپریالیزمی ئەمەریکا دەبینن. کاتێ فیشەکی ئەمەریکی بە چەکی هێزەیلی تەناهیی بیانی دێتە تەقاندن بۆ سەر جەستەی بەحرێنی و بەرزیش دێتە نرخاندن لەلایەن حوکمڕانانی بیانی، واقیعی تاڵی سیاسەتی داگیرکاری و ژێردەستەیی سەدەی بیست و یەک روونتر دەکا. ئەوەی دەبێ لە مێشکدا بمێنێتەوە هەر تەنیا سێبەری ژێردەستەیی نییە بگرە واقیعی ئیمپریالیزمی پۆستمۆدێرنە: لەبەرئەوەی زۆربەی دوورگەکە خەبات دەکا لە دژی جیاکاری لەبەرئەوەی شیعە یان سونە یان هەردووک، تەواوی باشووری بەحرێن بنکەیەکی سەربازیی ئەمەریکییە کە تێیدا گەنجانی تۆقێنراوی ویلایەتی ئەلاباما و ئایۆوا بەنێو شەقامەکاندا دێن و دەچن تا چیلی بخۆن یان هەمبەرگرێک لە فەدرەکەرس بخۆن. ئەوانیش سەربازن لە یارییەکدا کەوا هیچ سوودی بۆ خەڵکی ئاسایی نییە. بەهۆی راستی و بەڵگە مێژووییەکان، شیرین سادقی دەگاتە ئەم قەناعەتە:

> ئەو لەتبوونە مەزهەبییەی بەحرێن کارێکە بۆ سادەکردنەوە و قۆرخکردنی لەتبوونێکی گەورەتر: واتە حکوومەتێکی ژێردەستە لە بەحرێن لەژێر باڵی ئەو لەتبوونە جێگیر کراوە کە هیچ پێوەندییەک یان سۆزێکی نییە بۆ گەلی بەحرێن.

هیچ لەو ژیری و بیرتیژییە بوونی نابێ ئەگەر بێتو خۆمان تەلبەند بکەین بەو شتانەی لە نیویۆرک تایمز بڵاو دەکرێنەوە، کە تێیدا، لەسەر هەمان پرسی بەحرێن و ئەولاتریش، سەید وەلی رەزا ناسر جارێکی تر پف دەدرێ و دێ باسی لەتبوونی مەزهەبی دەکا. ناسر دووبارە باسی ئەو بیرۆکەیە

دەکا کە کاتی خۆی لە لووتکەی کارە دڕندانەکانی ئەمەریکا لە عێراق باسی کردبوو: کەوا سعوودی و ئێرانییەکان کێبەرکێیان لەسەر دەسەڵات، یەکیان نوێنەرایەتیی زۆرینەی سونەی موسڵمان و ئەوی تریان زۆرینەی شیعەی موسڵمان دەکا. ناسر دەیەوێ ترس و تۆقین بڵاو بکاتەوە:

دیمەنی ململانەیلی خوێناوی، کوشتن و بۆردمانگەل، پاکتاوی مەزهەبی و تەنگژەی پەنابەران لە بەیرووتەوە تا مەنامە، بوونەتە هۆی ناسەقامگیری و خۆشکردنی ئاگری ڕکابەریی ناوچەیی، ئەمانە هەمووی کۆتا بە هیواکانی بەهاری عەرەبی دێنن. دەنگەیلی رادیکالی لە هەردوولا قازانج دەکەن. لە بەحرێن، لبنان، سووریا و عێراق، ئەمە دەمێکە رووی داوە.

لێرەدا ناسر بەئاشکرا لۆمەی مەزهەبچییەتیی موسڵمانان دەکا بۆ هەر ئەگەرێکی توندوتیژی لە داهاتوو، وەک چۆن دڵڕەقانە هەمان کەیسی لە عێراقدا دروست کرد. وشەیەک نییە لەبارەی بنکەی سەربازیی ئەمەریکییەوە، یان لەبارەی دەسوەردانی سعوودی لە بەحرێن بۆ سەرکوتکردنی راپەڕینی شۆڕشگێڕی، کە دەستی پێ کرد و خالی بوو لە هەر لەتبوونی مەزهەبی. وشەیەکی نییە لەبارەی کۆمەڵگەی مەدەنی و رەوتی ئەخلاقی ویستی دیموکراتییەوە. ئەوەی لە باتیان بۆمان دێ تەنیا شیعە و سونەیە، کە تەواو یەک دەگرنەوە لەگەڵ ئەوانەی پێش سەردەمی ژێردەستەیی ناسر لە کاتی سەردەمی ئیمپریالیزمی بەریتانی.

ئەو گورزەی کە ئەم جۆرە شرۆڤەکارەی سیاسەت و سەربازی دەیوەشێنن بۆ بەهاری عەرەبی لە باتیی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا، یەکسانکردنی دیموکراسی بە ئامانجە ئیمپریالییەکانی ئەمەریکا، سنووردار ناکرێ بەهۆڵەکانی دەسەڵاتی ئەمەریکا کە ناسر زۆرجاران خزمەتیان دەکا. ئەمە یەکسەر لە هەموو میدیاکانی ئەورووپا ئاڵوگۆڕ کرا، یەکسەر کردیان بە چەک

و بە ڕووی بەهاری عەرەبییاندا تەقاند. لێرەدا شەڕێک هەیە لە ڕووی گێڕانەوەی شتەکان: چۆنیەتیی خوێندنەوەی بەهاری عەرەبی، چۆن تێکەڵی بکەی لەگەڵ بالادەستییەکان. بێگومان پرسی سەرمایەداری پرسێکە دەستی لێ هەڵناگیرێ. بۆیە چرنووکی سەرمایەداران کار دەکەن. لە وتارێکی گرینگدا، زە ئیکۆنۆمیست هەوڵی دا بەهاری عەرەبی ببەستێتەوە سەرهەڵدانی چینی مامناوەند لەسەر ئاستی جیهان وەک ئامێرێکی سەرمایەداری. تاکە شت لە توندوتیژی مەزهەبی ئەخلاقیی چینی مامناوەند و سەرکەوتنی بۆرژوازییە. کەواتە سەرمایەداری باشی کۆن وەلامێکە بۆ ئاژاوەی موسڵمانان.

زە ئیکۆنۆمیست وەدوو ئەو لیدە کەوت لەبارەی راپەرینی چینی مامناوەندەوە و لەسەری رۆیشت. چینی مامناوەند (وەک رەوتێک بۆ ئابووریی بازاڕی ئازادیی نیولیبرال) ئێستە زاڵ دەبێ بەسەر ئیسلامیزمدا، کە موسڵمانەکان خۆیان کارەکتەری سەرەکیی شانۆکەن. یەکەم جووڵەی مشتومڕی ئیکۆنۆمیست بریتییە لە بەجیهانیکردنی دیاردەکە و توخمی عەرەب و موسڵمان لە رەوتەکەی شۆڕشگێڕی دەهێنا دەرەوە. یاخیبوون لە ولاتی چینیش هەر لە هەوادایە. لە ناوەڕاستی ئاب یەکێ لە هەرە گەورەترین خۆپیشاندان لەوەتەی خۆپیشاندانی گۆڕەپانی تیانێنمین لەسەر شەقامەکانی دالیان رووی دا، شارۆکەیەکی باکوری رۆهەلاتە... راپەرینی جیهانی دواتر دەگاتە دوورترین قوژبنی ئەمەریکای لاتین: ئەو چیرۆکە هەندێ سەدای دایەوە لە بەرازیل، لەوێ دەرکردنی چەندان وەزیری لێ کەوتەوە. نارازیبوونەکە پاشان لە ولاتانی دەوڵەمەندەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ولاتانی هەژار: لە ولاتانی دەوڵەمەندا گەندەڵیی حکوومەت بەشێوەیەکی گشتی هۆکاری سستیی ئابووری بووە، لەگەڵ کێشەگەلی کۆنترۆڵکردنی داراییی گشتی. بەپێچەوانەوە، بازاڕە تازەکان گەشەی خۆیان پاراست، لە کاتێکدا خەرجی گشتی زۆربەی زۆری لەژێر کۆنترۆڵدا بوو. چی ئەم

ئاژاوەیەی دروست کردووە؟ شیکردنەوە بۆ هەڵە سیاسییەکانیان دەبێ لە شوێنی تردا بن. هەرە بەرچاوترینیان ئەوەیە هیندستان و چین، تا رادەیەکیش بازاڕە تازەکانی تریش، بەداوای سیاسیی ورووژێنراودا تێپەڕ دەبن بەهۆی گەشەی ئاستی چینی مامناوەندیان. کەواتە چینی مامناوەند هەستێ یان دابەزێ، هەردووکیان باشن بۆ پرسی سەرمایەداری، بۆیە راپەڕینی جیهانی لە پێناو سەرمایەداریی زیاتر و زیاتر بەناپاساییکردنی دڕندایەتیی نیولیبرال پێی گوترا "ئابووریی بازاڕی ئازاد".

ئەخلاقی چیرۆکەکە ئەوەیە ئەم چینە مامناوەندە داوای ئازادیی سیاسی دەکا بۆ پێوەندیکردن بە گۆڕانە کتوپڕەکانی وۆڵ ستریت، بەڵام ئەمە پێش بزووتنەوەی "ئۆکیوپای وۆڵ ستریت" پێشان درابوو لە ناوچەی دارایی نیویۆرک بەچەندان شێوەی جیاجیا. بەپێی قسەی مارتن راڤالیەنی بانکی جیهانی، ئیکۆنۆمیست بڵاوی کردەوە:

چینگەلی مامناوەند (واتە ئەو کەسانەی لە نێوان ٢ تا ١٢ دۆلار بەدەست دێنن لە رۆژێکدا) ژمارەیان زۆر زیادی کرد لە نێوان ١٩٩٠ تا ٢٠٠٥ لە ئاسیای تازە پێشکەوتوو بووە ١,٥ ملیار. لە ٢٧٧ ملیۆنەوە لە ئەمەریکای لاتین بوون بە ٣٦٢ ملیۆن لە هەمان ماوەدا، هەروەها لە سەبسەهارای ئەفریقیا لە ١١٧ ملیۆنەوە بوونە بە ١٩٧ ملیۆن.

ئەم چینەی مامناوەند دەیەوێ دیموکراسیی ستایلی ئەمەریکا و ئەورووپای هەبێ:

بەڵگەی راپرسی دەڵێ بەهاکانی چینی مامناوەند دیارن. لە رووپێوێک بۆ ١٣ بازاڕی تازە لەلایەن دەزگای پو گلۆباڵ ئاتیتیود لە واشنتۆن دی سی، چینگەلی مامناوەند کێشی زیاتر دەدەن بە رای ئازاد و هەڵبژاردنی ئازاد لە چاو چینی هەژار، کە کەمتر

گرینگی بە پرسی ئازادی دەدەن، زیاتر هەژاریان لا مەبەستە.

کەواتە، بەکورتی، خەڵک یان هەژار و ئیسلامی یانیش چینی مامناوەند و پاڵپشتی دیموکراسی ستایلی ئەمەریکی بوون. ئیکۆنۆمیست دەیەوێ زیاتر بەهاری و عەرەبی و راپەرینگەلی تر روون بکاتەوە، بەڵام هەر بەو زاراوانەی کە خۆیان و ناسر باوەڕیان پێی هەیە: تاکە شیکردنەوەیەک نییە بۆ چالاکیی چینی مامناوەند. لەبەرئەوەی ژمارەیان زیادی کردووە، لە هەر کاتێک بێ ئەمەی ئێستە هەر رووی دەدا. بڵاوبوونەوەی خزمەتگوزاریی بچووکی بلۆگ بێگومان هەندێ جیاوازیی دروست کرد. کەواتە، کاری بلۆگ هۆکارێکە، بەڵام نەک یەکەتییەکانی کار و مانگرتن، نەک خراپیی کاری ئابووری و خراپیی ئەرکەیل. بۆیە چینی مامناوەند و بلۆگ دێنە پێشکێشکردن وەک شیکردنەوەیەک بۆ راپەڕینی سنووربڕ کە ئاگرەکەی داگیرسا لەلایەن سەوزەفرۆشێک کە لەبەر خراپی باری ئابووری ئاگری لە خۆی بەر دا.

ئا بەم شێوەیە خەڵکانێک هەن دەیانەوێ راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی بفرۆشن بەخۆیان و هەر یەکێکیش بیەوێ چیرۆکەکەیان بکڕێ، هەروەها شۆڕشگەلی کراوەیان بەسەردا بسەپێنێ: لەم ساتەدا، چالاکیی چینی مامناوەند بزووتنەوەیەکی نارەزاییە نەک هێزێکی سیاسی لە مانا گشتییەکەی. واتە، ئەوە بزووتنەوەی چینی مامناوەندە دەرکەوتووە و راپەڕیوە لە دژی گەندەڵیی سەرکردەکان و هەژاریی ئیسلامییە هەژارەکان، هەروەها ئەم نەخۆشییە تەواوکارییانەی یەکتر لەلایەن سەرمایەداریی جیهانییەوە دێتە چارەسەرکردن. بۆیە هەوڵ دەدەن بەپێی قسە و زاراوەی خۆیان شتەکانی نێو راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی بگۆڕن و بیلکێنن بە بەرژەوەندییەکانی خۆیان. هەر تەنیا بۆردمانەکانی ناتۆ نین کەوا ئاراستەی مێژووی ئەو شۆڕشانە دەگۆڕن بۆ بەرژەوەندیی خۆیان. شرۆڤەکاران و وتارنووسان چەندان پرسیاریان ورووژاندووە لەبارەی گێڕانەوەی بەهاری عەرەبییەوە بەپێی بەرژەوەندییەکانی نیوجێرسی، واشنتۆن دی سی، پاریس و لەندەن.

کەواتە چۆن بەهاری عەرەبی مامەڵە لەگەڵ هێرشە کتوپڕەکە، شێوازی گێڕانەوەکانی، کردەی سەربازی یەک لە دوای یەک دەکا، چۆن دەتوانێ جەخت لەسەر یەک مانای بکاتەوە، بەرەو کوێ دەچێ و گرینگییەکەی چییە؟ ئەمانە هەمووی وەبەرهێنانی کەمە بەڵام پێشخستنی پیشە بەهەر جۆرێک بێ دەشێ، هەروەها پابەندن بەحەواندنەوەی دەسەڵات. خۆشبەختانە میدیای باڵادەست دەستی کردووە بە بەردانی لای دەسەڵات بۆ ئەوەی هیچ شتێکی تر نەکا جگە لە پێشاندانی واقیع. ئەمە سەردەمی ویکیلیکسە، جەزیرە، رۆژنامەگەلی فەڵەستینی، ئەهرام، جەدەلییە، بلۆگ، فەیسبووک، یوتیوب، تیوتەرە بەخۆیان و توانا بەهێز، داهێنەر، رەخنەیی تەنانەت ئاژاوەگێڕیشیانەوە ئامادەن بۆ ئاشکراکردنی راستییەکانی "برا گەورە".

کەناڵەکان هێندە لێک دوور نین: نیویۆرک تایمز بە یەک کلیک دەبێتە جەزیرە، ئیکۆنۆمیست بە دوو کلیک دەبێتە گاردیەن، هەروەها عەرەب و غەیرە عەرەب بۆ ئەو کەناڵانە دەنووسن رۆشنبیران، رۆژنامەوانان، چالاکوانانی مافەیلی مەدەنی، شۆڕشگێڕەکان، بژاردەیەکی دەزگای سیخوڕی رەخنەیی بەشێوەیەک کە دەربڕینی رەگەزپەرستانەیان هەیە بەناوی "شەقامی عەرەبی"، ئەوەش لە گەورەکانیان فێر بوونە، هەموو ئەمان ناکرێ رەت بکرێنەوە. گۆڕەپانی تەحریر مەرجعی سیمبولییە بۆ فەزای گشتی کە کۆمارێکی ئازادکراوە لەلایەن سەرنشینەکانی. ئەگەر بێتو ئەو رۆژنامانە وایان لە خەڵکی زەنگین و دەسەڵاتدار کردبێ بیانخوێننەوە، ئەوا پاشان گۆڕەپانی تەحریر هاواری کرد: گەل داوای رووخانی رژێم دەکا، رژێمێک کەوا نەک هەر سیاسییە، بگرە رژێمێکە هەموو شتە.

بێگومان ئەم جۆرە تێگەیشتنانە لە ئیسلامیزم و مەزهەبچییەتی وەک ساتێکی پێناسەکراوی بەهاری عەرەبی، هەروەها وەک هەوێنی تۆقین و

نیگەرانییەکانی چینی مامناوەند و پاساوێک بۆ ڕەوتی نیولیبرال. هەروەها ئەمانە لایەنگر و پابەندی خۆیان هەیە لەنێو عەرەب، موسڵمان و شوێنەیلی تر. بەڵام ئاخۆ دەکرێ هەموو ئەمانە بۆ بەهاری عەرەبی لەوێ بن؟ هیچ بەڵگەیەک هەیە بۆ پێچەوانەی ئەمە؟ یەکێ بێگومان دەتوانێ باسی ئاکامەیلی کارەساتباری ئابووریی بازاڕی ئازاد و بەناپاساییکردنی نیولیبرالی بکا، نەک هەر تەنیا لە جیهانی عەرەبی و موسڵمانان یان تەنێ لە ئاسیا و ئەفریقیا، ئەمەریکای لاتینیش بە گشتی بگرە لە ناوجەرگەی ئەورووپا و ئەمەریکای باکوریش،. پەڕپووتی و چەقبەستوویی حکوومەتی ئەورووپی یەک لە دوای یەکیش. بەڵام کێشەکە نە ڕاستییەکانی سەر ئەرزی واقیعە نە گێڕانەوە هەڵەکانە کەوا دێنە بەکارهێنان بۆ چۆنیەتیی خوێندنەوەی ئێمە بۆ جیهان. ئێمە پێویستە چوارچێوەی مەرجەعەکە بگۆڕین، ئامێری شرۆڤەکاری، بیرکردنەوە لە ڕەگ و ڕیشەوە بگۆڕین کە ئێمە بەکاریان دەبەین بۆ ئەو ڕاستییانە و تێگەیشتنمان بۆ بەهاری عەرەبی. ئەوەی شرۆڤەکارانی ئیمپریالی، ڕۆژهەڵاتناسان و ڕۆژنامەوانە گومڕاکان دەیکەین هەر تەنیا پێشاندانی ئەو ڕاستییانە نییە کە لە بەرژەوەندیی خۆیاندایە، بگرە دۆخەکە بەشێوەیەکی ئەوتۆ ئاوەژوو دەکەنەوە، وامان لێ دەکەن بە هەڵە بیر لەو ڕاستییانە بکەینەوە و تێیان بگەین. دەبێ ئەو تەڵەیە لادەین و خوێندنەوەمان لە شوێنێکی تردا بکەین. لە دەقگەلی ڕۆژنامەوانی، ئیمپریالیزمی و ئۆریەنتالیزمیدا دەبینین چۆن "ڕاستی" خراوەتە نێو قاڵبێک و ناتوانێ ئەملا و ئەولا بکا، ئەمە خوێندنەوەیەکە بۆ واقیع لە ڕێی خزمەتکردنی دەسەڵات و بەرژەوەندییەکانی بالادەستیی ئیمپریالی. لەبەرئەوەی ئەو بێ ویژدانە بگۆڕانەی "ڕاستی" پێوەندییان بەدەسەڵاتەوە هەیە، قسەوباس و مشتومڕیان هەر لەسەر دەسەڵاتە، بەڵام لەبەرئەوەی ئێستە لایەنە شاراوەکانی دەسەڵات ئاشکرا کران و لاواز بوونە بەهۆی گۆڕانی مێژوویی و گۆڕەپانی تەحریر و لە ڕێی ویکیلیکسەوە، ئەو ڕاستییەی

تەنازولات کە لە نێوان مەعریفە و دەسەڵاتدا هەیە ئاشکرا کرا، ئەمەش کارێکە هێندە باشە نەبێتەوە. ڕەوتی بڵاوکردنەوەی زانیاریی هەڵە کاریگەریی لەدەست دا و لاوازیی قسەکان چیی تر ناکرێ بێنە شاردنەوە لەودیو سەکۆی دەسەڵات. تەنیا چەند ڕۆژێک دوای ئەوەی ناتۆ دەستی کرد بەقسەی گەورە لەبارەی سەرکەوتنیەوە بەسەر لیبیادا، چەندان بەڵگەنامە دۆزرانەوە لە لیبیا کەوا ئاشکرایان کرد چۆن MI6 و CIA دەستیان تێکەڵ بوو لەگەڵ ڕژێمی قەزافیی بکوژ.

ڕاپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی پشت نابەستێ بەهیچ پێکهاتەیەکی جێگیری ئایدیۆلۆجی و وابەستە نییە بەهیچ پارتێکی سیاسی. ئیسلامیزم، ناشنالیزم و سۆشیالیزم شەکەت بوونە و هەڵواسراون، تەنێ لەبەر ئیمپریالیزم نا کەوا ئەوانەی سڕ کردبوو و خستبوونیە نێو پێکهاتەگەلی نوێی ئیمپریالی. دژایەتیکردنی ئەم ئیمپراتۆرە پێویستی بەشێوازی نوێی بەرەنگاربوونەوە هەیە. هیچ پارتێکی سیاسی بەهەر شێوەیەک بێ ڕێی پێ نەدراوە گەشە و پێش بکەوێ لەژێر سایەی ئەو ڕژێمە ستەمکارانە. ئەو کڵێشە ستانداردەی کە ڕۆژنامەوان، ڕۆهەڵاتناس و شرۆڤەکارانی سیاسەتی ئیمپریالی ئەمەریکا بەهۆیانەوە بەشدارن لەو شۆڕشانە، لە ئاکامدا، خزمەتی سنووردارکردنی شرۆڤەکارییەکان دەکا و دەیانخاتە ناو چوارچێوەیەکی هەڵەی مەرجەعەکان. لە ڕاستیدا شۆڕشەکان ڕەگیان هەیە لە ڕەوت و ڕەچەی قووڵی مرۆڤایەتی لە جیهانی عەرەبیدا، بۆیە پێویستیان بەسەکۆیەکی قووڵی مرۆڤایەتی هەیە وەک چوارچێوە و مەرجەعێکی دروست. ڕۆمانێکی سەنوڵڵا ئیبراهیم، شیعرێکی مەحموود دەروێش، یان فیلمێکی عالیە سلێمان چوارچێوەی زۆر کاریگەرن بۆ گەردوونی سۆزداریی ئەم شۆڕشانە. زاڵبوونی دەقی ئەدەبی بەسەر کاری سیاسیدا، وەک ئەوەی من لێرەدا پێشنیازی دەکەم، ڕەوتێکی گرینگی کاری کۆمەڵایەتییە کەوا زۆر مانا بەچەندان ڕێی جیاواز دەبەخشێ بە شۆڕشەکان. سروشتی ئەو زمانە

سیاسییەی لە هەناوی بەهاری عەرەبییەوە دێتە دەرەوە و ئێمە دەبیستین پەرە بە فرە لایەنی ئەدەبی دەدا کە ناکرێ جێی ببێتەوە لەنێو چوارچێوەی ئایدیۆلۆجی و ئیمپریالی. پێوەندیی نێوان قسەی دەقگەل دەوەستێتە سەر تێکەڵکردنی دەقە ئەدەبییەکان. لە هەر جۆرە دەقێکی وادا، ئەکتەری کۆمەڵایەتی وشەکانی تر دەسازێنێ و لەگەڵ هێزی ناو ناخی خۆی تێکەڵی دەکا. لەبەر ئەو هۆیە، کتێبێکی لەم جۆرە لەلایەن مارا نەعمان بەناوی "فەزای شارستانی لە ئەدەبی هاوچەرخی میسری: پۆرترێتەکانی قاهیرە (٢٠١٠) یان کتێبەکەی نوها رەزوان بەناوی شیعری میسری لە سەردەمی مۆدێرنی عەرەبیدا: خوێندنەوەگەلی نوێ بۆ عامیە (٢٠١١) زۆر گرینگن بۆ تێگەیشتنمان لە شۆڕشی میسری، زۆر گرینگتر لەو گۆشانەی لە نیویۆرک تایمز یان زە ئیکۆنۆمیستدا بڵاو دەکرێنەوە کە هیچیان بەسەر هیچەوە نییە.

هەروەک لەم کتێبەدا پێشنیازم کردووە، رۆتین و بزوێنەرەکە لە پشت راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی بەشێکە لە یاخیبوونی دواخراو کە بوونە هۆی دەرکەوتنی پێدا پێدای جوگرافیای خەیاڵی ئازادیخوازی کە تێیدا بیرۆکەگەلی ئازادی، دادوەریی کۆمەڵایەتی و شکۆی مرۆیی خرانە پێش بۆ خەیاڵی بەکۆمەڵی شۆڕشگێڕەکان، خەیاڵێک دەمێکە هاتووەتە کێڵان لە فۆرمی ئەدەبی و هونەریدا. شاعیران، رۆمانووسان، فیلمسازان، گۆرانیبێژان و گۆرانینووسان: ئەمانە تیۆریستی راستەقینەی بەهاری عەرەبین. بە خوێندنەوەی لافیتەکانی ئەم راپەڕینگەلە، کە پشت دەبەستێ بە یاخیبوونی دواخراو و لەنێو خەیاڵێکی ئەدەبیی قووڵەوە هەڵدەقووڵێ، دەمانخەنە ناوەڕاستی رێیەکی تژی لە خێروبێر، بەڵام بەگومان و نادیار، نادڵنیاییەک بەهۆیەوە رۆژنامەوان، رۆهەڵاتناس و شرۆڤەکاری ئیمپریالی پاشەکشێ دەکەن، بەڵام ئێمەنان بەرەو پێشەوە دەچین. لەم سۆنگەیەوە، ئێمە دەبێ کار لەگەڵ ئەوە بکەین کە دەمبیستین پێش ئەوەی دڵنیا بینەوە

لەوەی بەهاری عەرەبی چۆن قسان دەکا. ئەوەی ئێمە دەبێ بیری لێ بکەینەوە لەم سۆنگەیە نە وتار نە زمانە، بگرە دەستەواژەگەلی وەک "گەل دەیەوێ ڕژێم بڕووخێ، یان گەل داوای ڕووخانی ڕژێم دەکا" یان "ئێران بووەتە گارسۆن، شەرمە بۆ سووخۆران." ئێمە بەهیوایەکی زۆرەوە ئەم دروشمانە دەخوێنینەوە، پابەندین پێیانەوە، ئەمانە زۆر شت بۆ داهاتوو وەبەر دەهێنن.

پرسیاری لێ کرا ئاخۆ شەپۆلی هەنووکەی نارەزایی لە ناوچەکەدا بەڕاستی مانای ئەوەیە گەلانی عەرەبی دیموکراسییان دەوێ، بێرنارد لویس بەنادڵی وەڵامی دایەوە: "دیموکراسی مانای چییە؟ وشەیەک بە زۆر مانا دێتە بەکارهێنان، تەنانەت لە شوێنی جیاجیای ڕۆژئاواشدا. هەروەها چەمکێکی سیاسییە کە هیچ مێژوویەکی نییە، هیچ تۆمارێکی نییە لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا."

> ئێمە، بەتایبەتی لە جیهانی ڕۆژئاوادا، حەز دەکەین بە زاراوەی خۆمان بیر لە دیموکراسی بکەینەوە، کەوا سروشتی و ئاساییە، واتە دیموکراسی لای ئێمە بەمانای هەڵبژاردنەکان دێ بە ستایلی خۆمان. بەلام پێم وایە هەڵەیەکی گەورەیە بەو شێوەیە بیر لە ڕۆهەلاتی ناوەڕاست بکرێتەوە چونکە تەنیا بەرەو ئاکامەیلی کارەساتبارمان دەکا، هەروەک خۆشت لە زۆر شوێن دەیبینی. زۆر بەسادەیی دەڵێم گەلانی عەرەبی ئامادە نین بۆ هەڵبژاردنی ئازاد و دادوەرانە.

باشە کەی "ئەوان" ئامادە دەبن؟ کەی، تەواو، گەورە دەبن و دەبن بە مرۆڤی تەواو؟ باشە گرفت چییە لەگەڵ "ئەوان" (عەرەب، موسڵمان و ئاسیایی) وەها پۆلێنیان دەکەن و بەبێ توانایان دەزانن بۆ دیموکراسی، حوکمی یاسا، شکۆ و ڕێزی خود و شایستەیی؟ ئەمە چ جۆرە خەیاڵێکە

کەوا لە پیاوێک دەکا هێندە بەکەمی بیر لە مرۆی تر بکاتەوە، لە کاتێکدا تەواوی ژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ دیراسەکردنی "ئەوان"؟ وا دانێ ئەوەی بێرنارد دەیڵێ لەسەر موسڵمان و عەرەبان تەواو راستە، ئێ ئەوجا چی؟ کوانێ ئەو عەرەبانەی بەرەو گێرەشێوێنی دەچن، کە بەخۆزگەوە بیر لە وشەیەک دەکەنەوە کە بۆ ئەوان هیچ مێژوویەکی نییە؟ زۆر پێویستە ئەم جۆرە گفتوگۆیانە ئازاد و خالی بکرێنەوە لە کلێشەی ماندوو و بیری بۆگەنی رۆهەلاتناسی. دەبێ هاوکێشەکە ئاوەژوو بکەینەوە: نەک رێ بدەین بەخوێندنەوەی خەیاڵی و بێ بنەما بۆ شۆرشەکان، شۆرشەکان دەبێ فێر بن سروشتی خەیاڵیی ئەم جۆرە قسانە بخوێننەوە.

کەواتە، لە دژی قینەی ئەم خوێندنەوانە، ئێمە چۆنین لە خوێندنەوە و تێگەیشتن لە راپەرینگەلی شۆرشگێری کە لە رووخساردا وێ دەچێ هەر لە خۆیانەوە دروست بووبن؟ مانای ئەم شۆرشانە چین، هەروەها بە چ ئاراستەیەک و بەرەو کوێ دەچن؟ راپەرینگەل بەهۆی پارتەیلی سیاسی نەهاتووەتە جووڵاندن، یان رێک نەخراوە لەلایەن دروشمی شەرئامێزی ئایدیۆلۆجیی ناشنالیزم، ئیسلامیزم یان سۆشیالیزم، هەرچەندە هیچ یەکێ لەو ئایدیۆلۆجییانە بەتەواوی غیاب نییە لە گۆرەپانەکە. لە غیابی ئەم کلێشە ئاشنایانەی سیاسی و ئایدیۆلۆجی، یەک لەو رێیانەی یەکسەر دەست بکەی بە بیرکردنەوە لەو پرسیارانە ئەوەیە تەماشای دەربرینی دروشمگەل بکرێ لە راپەرینگەل و بپرسی چۆن پێوەندییان بە پێگە و سروشتی شۆرشەکانەوە هەیە. یان چۆن ئەو دەربرینانە مانای گۆران دەگەیەنن لە کولتووری سیاسیی ناوچەکە؟ یەکێ لەو ئاستەنگانەی ئێمە دەبێ زاڵ بین بەسەریدا یان بەلایەنی کەم دانوستاندنی لەبارەوە بکەین گێرانەوەگەلی ئەورووپییە لەبارەی کولتوورگەلی عەرەب و موسڵمانانەوە، بیرۆکەگەلی وەک "ململانەی شارستانییەتەکان" و "کۆتاییی مێژوو"، چەند لێکدانەوەیەکن دەیانەوێ بڵێن موسڵمانەکان توانای دیموکراسییان نییە، یان ناتوانن رێز لە حوکمی یاسا

بگرن، ئەمانە هەموو قسەی قۆڕ و بێ مانان دەمێکە بەبەردەوامی دووبارە دەکرێنەوە. راستییەکەی ئەم کارانە، دەمێکە بەباشی کراون، لێرەش ناوەستن. بۆ وروژاندنی خاڵی سفری ئەم رووداوانە، دروشمی دەستەواژەیی کە بیستمان لە ئێران و جیهانی عەرەبی لە ٢٠٠٩ بەولاوە تازەترین و باشترین ئیمزای راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕین، نیشانە و ئاماژکەی ئیدیۆمین کە ئاوسە بە ئەگەر، هەرچەندە هێشتا زۆر زووە بۆ زانینی وردەکارییەکان. ئازایەتی، نادڵنیایی و کاریگەریی ئەو دروشمانە هەموویان پێناسەن نەک هەر تەنیا بۆ سەردەمی دوای ئیسلامی بگرە بۆ سەردەمی درەوشاوەی دوای ئایدیۆلۆجیا . هەروەک ئالان بادو راستی گوتووە، دەمێکە کاتی ئەوە هاتووە واز لە پێناسە و پێشەکیی دیموکراسی بێنین تا لە واقیعی کۆمەڵگەکەمان تێ بگەین. ئەو "ئێمە"یە هی رۆژئاوا، رۆهەڵات، باشوور و باکورە. ئەمە ئەو جیهانە تازە پەیدابوومیەیە کە هەموومان لە خۆ دەگرێ، هیچ کەس لە ئێمە بەتەنێ ناتوانی قۆرخی بکا و بیخوێنێتەوە.

ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکان، وڵاتانی یەکەتیی ئەوروپا و ئیسرائیل وڵاتگەلی دیموکراسین، باشە ناکرێ ئێستە بوێرین بپرسین ئاخۆ ئەم وشە، کە ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی یۆنانییە کۆنەکان، هیچ شەرعیەتی نەماوە و ئێستە وەک رۆتینێکی جیهانی سیاسەت بەکار دێ و هیچی تر؟ لە نێوان ئەو وڵاتانەی پێیان دەگوترێ دیموکراسی (کە ئیمپریالیزمی ئەمەریکی و داگیرکاریی ئیسرائیل باشترین پێناسەیان بۆ هەیە) و ئەوانەشی دیکتاتۆرن (میسری موبارەک و تونسی بن عەلی باشترین نموونەن)، چۆن بتوانین بیر لە گرێبەستێکی نوێ بکەینەوە لە نێوان ئازادیگەلی مەدەنیی گەلان و نەتەوەکان کە هەردووکیان وەلا دەنێ و رێیەکی جیاواز دەگرێتە بەر؟ ئاخۆ ئەم رێیەش ناگەڕێتەوە سەر خاڵی سفری سیاسەت، بۆ میسرییەکان کە لە گۆڕەپانی تەحریر خڕ دەبنەوە، یان بۆ

ئێـرانییـەکـان لە مـەیدانـی ئازادی، کـە یەکـەم دروشـمـی خـۆیان بە ڕووی دەسـەڵاتدا دادا: "کوانێ دەنگمـان؟" یان "گەل داوای ڕووخـانی ڕێژیم دەکا!" هێڵێکی تایبەت هـەیە لە فەلسـەفەی سیاسـی، لە ئەفلاتوونەوە تا بـادو، کە تا دێ تایبـەتمەندیی خۆی بەجیـهانـی دەکا تا ئەو ڕادەیەی دەبێتـە سیاسـەتی ڕۆتینی جیاوازییـەکـان، ئەرک و پێکهاتـە تا دەگاتە ئێسکەیلی شـرۆڤەکاری، لەوێ چیی تر نابێتــە گـرفت ئەگـەر تۆ دەنگ بدەی یان نەدەی، هـەر لەوێش سـیـسـتـمی سـەربـازی دڕندەی وەک وڵاتە یەکگرتووەکـان و داگیـرکـاریی ئیسـرائیل دەبنە نموونەی سـەرەکیی دیموکراسـی، هـەروەها هەر نەتەوەیەک بەرەنگاری سـتـەمکارییـان بێتـەوە بە بەربەری ناوی دەبەن یـانیش پێی دەڵێن توانای دیموکراسیی نییـە. باشـە ئێسـتـە کاتی نەهاتووە بۆ زاڵبوون بەسـەر ئەم بیرکردنەوە نەخۆشـە؟

بیـرکردنـەوە نەخـۆشـەکـە هاودژی خـۆی لـە ئوسـامـە بن لادن، قـاعیـدە و تاڵیباندا چاوەڕێ کرد و دروسـتی کرد، لەسـەر بنچینەی بابەتی توندوتیژیی یاخـیـبوونـی تۆقـانـدنی دووانەی ئیـمـپریالیزم. هـەردوولا (بوش و بن لادن) یەکـتـریان نان دا. هـەردووکـیـانیـان بەزاند، گـۆڕەپانی تـەحریر و مـەیدانی ئازادی و دروشـمـەکـەلیـان دەسـپـێکە بۆ گـرێبـەسـتـێکی نوێکراوەی فـرە لایەنەکان، کەوا لەسـەر لێواری دۆزینەوەی ڕەوتێکی سیاسیی نوێن. وشەکان سـادەن، ڕوونن، لـە هـەناوی دەیان سـاڵی بێدەنگییـەوە دێن، لەگـەڵ هـەسـتی شـاعیـرانـەی خـەڵک تێکەڵ بوونە، وەک بڵـێی دەترسن لەوەی زۆر بڵـێن. ئەم دروشمانە سیمبولی بێدەنگین. یەک هەناسەیان ماوە، تەنیا یەک هـەناسـە بۆ بێدەنگییەکی بوڕکانی. زۆر دوورن لە دڵنیایی، دوورتر لە یەقین، ئایدیۆلۆجیا و قـەناعـەت. چەند قـامـچییـەکن و نرکـەیان لێوە دێ. هەردەم لە سـەرەتادان، هـەردەم دروشـــمـــئـــامـــێـــزن. ئەوان وەک نۆتـەی مـوزیکن، ژێیـــەکـــەی نین، ئۆرکێستراییی نین و تەواو نین. ئیـقاعین، موزیکین و تۆنیان لێ دەبارێ، وەک بڵـێی بیـانـەوێ هـەمـوو ئەمـانـەمـان پێـشکێش بکەن. ئەوان ئاشـکراکـەرن،

دوژمنداڕن. ئەم وشـانە دروشـمـئـاسـان، کـورتن، لە بنـی کـودی دەدەن، مەرامداڕن و لەبەر پێویستی لەدایک بوون، بە کورتترین ڕێگە زۆرترین شت دەڵێ: بڕۆ (ارحل)!.

## دەستەواژەی دروشمی

ئەگـەر بـەم وشـەیە "ارحل، بڕۆ" دەست پـێ بکەین، ئەوا کـورتتـرین و کـاریگەرتـرین وشـەیەکی دروشـمـیـیـە ئێـمـە دەیبـیـستین کـاتێ عـەرەب و ئێرانییەکان دەڕژێنە سەر شـەقام و بە سەما یاخیبوونیان دەدرکێنن، دەرگە دەکەینەوە بۆ پێشنیـازێکی ئـەدەبی کە هـەروەک دروشم دەمێنێتـەوە، بەرەو ئاراستەیەکی گشتی دەچێ، وەک نیشانەی ڕێیە، کە هێشتا زۆر ماوە بگاتە شـوێنی مـەبەست. لە شـوێنی پشـووی فـڕۆکەخـانەی نێـودەوڵەتیی (JFK)دا لەسـەر یـەکێ لە دەروازەکـان تابلـۆکە لەسـەری نـووسـرابوو "مـەدرید"، کە بە هەزاران میل لێمەوە دوور بوو لەو ساتەی کە من خشت و مۆتۆڕ، گالەری و چێشتخانە ببینم. دەستەواژەی دروشمی هەردەم دوا دەخرێن، هەروەها لە ساتی شـۆڕشدا ئەو دروشـمـانە ئامـاژکەن بەیاخـیبوونی دواخـراو. ئەمان ئەرک و پێکهاتەیی نین لە پێوەندییان بە جیهانی ئێستاوە. بگرە ئەو ئەرک و پێکهـاتانە دەشکێنن، هەردەم بـەهـەناسـەیەکی درێژ کـار دەکەن، ئێـسـتـە نا، بەڵام ئەو ساتە هێشتا ماوە بێ بەو هەناسە قووڵە کار بکەن.

ئەوەی ئێمە لە جیـهانی مـوسڵمـان و عەرەبی دەیبینین، دەوەسـتێتە سـەر ئەو دەسـتـەواژە دروشـمـیـیـانە، یاخـیبـوونێکی کۆتا - کراوەیە، تێکەڵبوون و پەیدابوونی زمـان و پراکـتیزێکی نوێی شـۆڕشگێڕییە، کە دەوەسـتێتـە سـەر خوێندنەوەی ئەو واقیعـەی کە کارێکی کراوەی پێویستە (بە قسـەی ئومبێرتۆ ئیکۆ)، ئەمـەش سـروشـتـێکە تەواوی پێـشنیـازەکـان دەجـووڵێنـێ بۆ ئەوەی بەتەواوی بێـتـە پشـتگیـریکردن. ڕاپەڕینگەلی شـۆڕشـگێـڕی، کـە دەمـێکە دەکـوڵێ، ئێـسـتـە کـەوتووەتـە سـەرپێ و لـەسـەر ڕێیـەکی بن نەهاتووە کـە

بیرۆکەی دیموکراسی و بنکە کۆمەڵایەتییەکانی پێناسە دەکاتەوە. ئەم شۆڕشانە قەت خلاس نابن، لەبەرئەوەی، هەروەک سەرنجمان دا، ڕۆتینیان زیاتر ڕۆ چووە بەنێو ئاسانکاریی دەق و زمانێکی ئەدەبی نەک داستانێکی ئایینیی بنەما ئاڵۆز. سەرکەوتنگەلی نەرم و میانڕۆی شۆڕشەکان لە تونس و میسر بێگومان زۆر زیاتریان پێوەیە لەگەڵ مسۆگەرکردنی ئازادیگەلی مەدەنی و دادوەریی کۆمەڵایەتی. بەڵام ئەمە زۆر وردە چونکە ئەوان دوای هیچ نووسینێک نەکەوتوون، بگرە وەک ڕۆمانێکی کۆتا کراوە دەستیان پێ کرد کە لەگەڵ جووڵانی خۆی خۆی دەنووسێ. کەواتە شۆڕشەکان هیچ بنەمایەکی چەمکئاسای دیموکراسییان نییە کاتێ پڕۆژەکەیان تەواو دەبێ، بە کراوەیی دەمێننەوە، تا کەی، ئەوا سنووری پڕۆژەکە دەیزانێ، تا بسووڕێتەوە هەر دەمێنێ.

لەسەر بنەمای ئەو کۆمەڵە پێشنیازانە، پێویستە پرسیارێکی گرینگ بکەین: بە چ ڕێیەک و بە چ ئیدیۆمێک عەرەب و موسڵمانان بەگشتی قسان دەکەن، ئاخۆ جیهان گوێی لێیانە کاتێ قسە دەکەن؟ پرسیارکردن لە شیمانەی سەرکەوتنی هیچ مانایەکی نییە، ئەم شیمانە ناگات بە خەیاڵی سیاسیی ئیمپریالی کە هەردەم پشتگیریی ئامێرەکانی وەک میسری حوسنی موبارەک و کۆماری ئیسلامیی خامەنایی کردووە، ئەمەش دەوەستێتە سەر چەمکێکی تاکگەراییی داخراو، تێیدا کەسێک پاڵ بە سنوورەکانەوە دەنێ و دەیانگۆڕێ، بەڵام زۆر کەس هەن ڕێ لەوە دەگرن. بەڵام ڕاپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی لەم جۆرانە، واتە ئەوانەی ئێمە دەیبینین وا کۆتاییان کراوەیە و لەسەر ڕێی ئازادیخوازین، دەوەستنە سەر خەیاڵی ئەدەبی کە مامۆستایانی ئەدەبی ئینگلیزی و بەراورد لە ئەمەریکای باکور هێشتا پێی نەگەیشتوون، لەبەرئەوەی پیشەی ئەکادیمیی خۆیان دەکەن بەهۆی مشتومڕکردن لەسەر ئەو ئەکادیمییەی ناتوانێ قسە لەسەر ئەو نەگەرانە بکا، لە کاتێکدا بازنەی ئەکادیمیی مەحاڵ دەخەنە ناو

چوارچێوەیەکی تیۆری، ئەمەش پڕۆژەیەکە هیچ بنەمای نییە، لە نێومخۆدا تژییە لە خەوش، تەنازولاتی ئەخلاقیسی تێدایە، لە سەروو هەمووشیانەوە تا سەر ئێسک پارێزکارییە، بۆیە ملکەچی واقیعی پڕ لە خەوش دەبێ.

## دەنگی خەڵک

لە دەسپێکی ئەم کتێبە ناو لە بەهاری عەرەبی دەنێین کاریگەرییەکی ئەدەبییە بە سێ شت دروست بوو، هەروەک ئومبەرتۆ باسیانی کردبوو: (١) دەنگی بەهێزی گەل کە راپەڕین، (٢) بەڵگەی تژی لە دەقی گێڕانەوە، بینین، بیستن و ریزبەندی، یان ئەو سیمبولانەی کە لەسەر خاڵگەلی سنوور کار دەکەن و، (٣) گرینگی و متمانەی چاودێرانی بەشدار کە ئەوەیان هەڵبژاردووە دەربڕینی شۆڕشگێڕی بخوێننەوە.

لەسەر بنچینەی ئەو سێگۆشە رژدە، ناتوانێ دەنگی گەل کەم بکرێتەوە، یانیش بەرز بکرێتەوە و بکرێتە دەنگی ئیلاهی، وەک "دەنگی خوا". دەبێ ئەوەمان لە بیر بێ کەوا دەنگ قسە نییە، ئایدیۆلۆجیاش نییە، بگرە هەستێکە فرە مانایە. دەنگ برێتییە لە بەڵگەی راستەقینەی شۆڕش. دەنگ واتە دەربڕین، دەربڕینی باختینیانی، واتا دەبەخشێ لە گۆڕینی سیاقی شۆڕشی کۆمەڵگە کە پێوەر و کاریگەری بە کۆمەڵگە دەدا. دەنگ شتێکی ئیدیۆمییە: ئیدیۆماتییەکەی کۆمەڵایەتییە نەک ئایدیۆلۆجی، تەنانەت رێزمانیش نییە. وەک بەهێزکەر شت بەهێز دەکا، بەهێز ناکرێ. ئەو ئیدیۆماتییە هەردەم کاریگەرە، کۆتا-کراوەیە و، بەم شێوەیە توخمگەلی گێڕانەوەی خۆی دەسازێنێ و لەگەڵ خۆیدا دێتەوە، وەک ئەوە وایە کاتێ رۆمانێک دەخوێنینەوە و نازانین چۆن بەکۆتا دێ، تەواو پێچەوانەی داستانێکە کە تژییە لە پاڵەوانێتی. شۆڕشی میسری هەروا لە هیکەوە دروست نەبوو، هەروەها ئەو وێنە و دەربڕینانەش ئێمە بینیمان و بیستمان هەروا ئاسان دروست نەبوون. ئیدیۆماتیی ئەم شۆڕشە بەرهەم تیۆری کردە

وتارێکی مەحاڵ کە زۆر کەس پێیان وابوو هەرگیز روو نادا. شارستانیەت و فەزای گشتیی گۆڕەپانی تەحریر بەتایبەتی بنکەی سەرەکیی ئەم راپەڕینە بوون. ئەو شارستانیەتە هێندەی جەستەییبوون ئەلیگۆرییە، دوو شتن تەواوکەری یەکترن. لە تاقیکردنەوەیەکی پێوەندیی نێوان ناسنامەی فەزا و نەتەوەیی لە میسر لە چوار رۆمانی عەرەبیی هاوچەرخدا، مارا نەعمان بەزنجیرەیەکی مێژوویی باس لە گواستنەوەکانی بازاڕی قاهیرە دەکا وەک ئەو شوێنەی تێیدا بابەتی مۆدێرنی میسری گەشەی کرد و پێوەندیی ڕاستەوخۆی هەبوو بە مانیفێستۆی گۆڕانەکان لە فەزای بازاڕی قاهیرە (وسط البلد). هەستی شانازی، هەستی تێکەڵ و ڕکابەریی ئەم فەزا سیمبولییە میسرییەکان هەڵدەتەکێنێ و گرێیان دەدا بەپڕۆژەی مۆدێرنیتە و دەرهاوێشتەکانی. مەبەستی نەعمان پێشاندانی ئەوەیە چۆن سروشتیی ڕکابەریی ناو شار، وەک لاساییکردنەوەیەکی مۆدێرنیتەی ئەورووپی، وەک بازنەیەکی گشتیی میسرییەکان، وەک پێگەیەک بۆ داڵدەدانی شۆڕشەکە، هەروەها وەک وێرانێکی مۆدێرنیتە، وابوو و بەردەوامیش دەبێ لەوەی کە سەنتەری هەموو شتێک بێ بۆ میسرییەکان. کاتێ میسرییەکان قسە دەکەن، بەم پێیە ئەدەبییە قسە دەکەن، قسەیان تژییە لە ئیدیۆم کە دەبێ خەڵکی تێی بگەن و بێتە تێگەیشتن لەنێو دەقی ئەو مێژووەی کە خۆیان وا دروستی دەکەن.

بەهەمان شێوە سەنتەری چۆڵی گۆڕەپانی تەحریر ئێستە پڕە لە خەڵک بەهۆی گۆڕانی فرە لایەنە کەوا گۆڕەپانەکەی کردووە بەکۆمارێکی ئازاد هەرکە میسرییەکان دێنە دەرەوە و پێناسەی دەکەنەوە، کەواتە ئەو دەربڕینانەی لەوێ دەکرێن تژین لە مانای پرشنگدار بەهۆی گۆڕانی چوارچێوە سیاسییەکانییەوە. ئێمە لە باختینەوە فێری باڵادەستیی سیاق بەسەر دەقەوە بووین، یان گشتاندنی مانا. سروشتی دووانەی زمان هەردەم لە رووی کۆمەڵایەتییەوە کاری قسەکردنە. بەم پێیە، دەربڕینەکان قسەی

مەنەلۆجئاسا نین، بگرە ئاراستە دەکرێن، مەرامیان هەیە، هەروەها هەردەم دەق و سیاقەکان کون دەکەن و دەچنە ئەودیویانەوە. مانا لە کایەی کۆمەڵایەتی وەبەر هێنراوە، کۆمەڵگە حەپسی کردووە. بۆیە گۆڕەپانی تەحریر بەڵگەیەکی جەستەییی رۆمانی میسرییە، وەک ئەوەی "سیانەی قاهیرە"ی نەجیب مەحفوز (١٩٥٦-٥٧)، وەک ئەوەی مەیدانی ئازادی لە تاران ئاوسە بە "کلیدار"ی مەحموود دۆلەتابادی (١٩٦٣-٧٨)، تێیاندا فرە دەنگی مانا دەبەخشێ و مانا ئاسایی دەکا لە نێوان دەربڕینەکان. بۆیە، بە زاراوە و زمانی باختینی من لێرەدا پێشنیاز دەکەم، ئەم شۆڕشانە وەک رۆمانن نەک داستان، ئەمەش تاکە هۆکارە کەوا شۆڕشەکان بێ سەرکردەن. جەمال عەبدولناسر دوایەمین پاڵەوانی داستانی دوایەمین شۆڕشی عەرەبی بوو، هەروەها گۆڕەپانی تەحریر خاڵی دەسپێکی یەکەم شۆڕشی رۆمانئاسایە لە ئێستە و بۆ داهاتوو میسر و تەواوی جیهانی عەرەبی، شۆڕشێکە دەوردراوە بە فرە دەربڕین و دەنگ. بەلای باختین بەهەمان شێوە رۆمانەکان هەرسی ژانرەکانی تر دەکەن، گۆڕەپانی تەحریر تەواوی شۆڕشەکانی پێشووی عەرەب لەخۆ دەگرێ و دەیانکاتە یەک رۆمان و شۆڕشێکی تازە دەگێڕێتەوە. بۆیە گۆڕەپانی تەحریر بەشێوەیەکی رادیکالی باختینی کار دەکا چونکە بووەتە بنکە بۆ نوێبوونەوەی ئاڵوگۆڕ لە نێوان کات و شوێن، لە هەمان کاتدا گێڕانەوە و هاوئاهەنگییەکانی کۆتا-کراوەن.

بۆ تێگەیشتن لەو کۆتا-کراوەی مێژووییەی دەربڕینەکان، پێویستە لە میکایل باختینەوە بچینە سەر ئومبەرتۆ ئیکۆ و بیرۆکەکەی بەناوی "کاری کراوە"، کە بەهۆیەوە مامەڵە لەگەڵ دەق دەکا وەک بوارگەلی مانای بەهێز و راستەقینە، واتە وشە دوور دەخاتەوە لە مانای فەرهەنگیان و لەناو سیق بەکاریان دێنێ کە تێیاندا دەبن بە دەربڕینی واتەدار. مانای دەستەواژەیەکی وەک "گەل دەیەوێ رژێم بڕووخێ"، بۆیە دەبێتە کارێکی بەردەوام یاخی کە یاری دەکا لە نێوان ساتی چاوەڕێکردن و ئامادەکارییەکان بۆ

پێشکێشکردنی شتەکان. ئەو یاخییە گەورەیەش، ئەگەر هەر لەسەر بیرۆکەی ئومبەرتۆ ئیکۆ بەردەوام بین، هەردەم شوێنێکە تێیدا چوارچێوەیەکی سێگۆشەیی کار دەکا: واتە، مەبەستی دەق (شۆڕش)، مەبەستی نووسەر (شۆڕشگێڕەکان) و مەبەستی خوێنەر (ئێمەین کە شۆڕش و شۆڕشگێڕەکان دەخوێنینەوە). لە ڕێی ئەو دەربڕینە مێژووییانەوە، کە بوونەتە چوارچێوەیەکی سێگۆشەیی، دەنگی گەل دەبێتە دەنگێزی گوێزراو، گواستنەوەی خود، دەنگی شکۆمەندی، دەنگی نەبینراو، دەنگێک کە لایەنی راستەقینەی دەنگی خەڵک، فرە لایەنی، کۆتا – کراوە پێشان دەدا. یەکێ دەتوانێ، دەشبێ لێکی بداتەوە، بەڵام هەر بە کراوەیی دەمێنێتەوە. ئەگەر ئێستە بچینە سەر سیستمی واتەداری س. س. پیەرس، ئەوا دەربڕینی باختینی نە جێگیرە و نە ناسنامەهەڵگریشە لە پێوەندی لەگەڵ واقیعدا (وەک چۆن قیژە بۆ ترساندنە، ئەویش ئاوایە)، بەڵام زیاتر لە جیهانی سیمبولدا، کە تێیدا نیشانە دەکەوێتە ناو بازنەیەکی شیکاری، وەک وشەی "شۆڕش" لە زمانی ئینگلیزی. بەڵام لە شوێنێکی نێوان ئیندێکس و سیمبول، ئەم دەربڕینانە مانای نوێبووەوە و کۆتاکراوەیی خۆیان دێننە بەرچاو. ئەم لایەن گشتگیرانەی نیشانەگەلی هاواری شۆڕشگێڕی وەک دەربڕینێک ڕەوشەکە مەحاڵ دەکا بۆ وێرانکارە پۆستکۆلۆنیالەکان پێشنیاز بکەن کەوا ڕەشوڕووت ناتوانن قسە بکەن، چونکە ئەو دەربڕینە بنیات نراوە لەسەر چوارچێوەیەکی سێگۆشەیی کە لە ڕەگ و ڕیشەوە هیچ پێوەنیدی بەسیاسەتەوە نییە.

دەنگی گەل وەک بەهێزکەری دەربڕینەکان، وەک نیشانەگەل، دەنگی گەل ئیندێکسییە، هەم لەبەر هۆکاری کردەنی و هەمیش لەبەر کراوەیی سیاسییان. ئەمە جیهانی شۆڕشگێڕی ناباتە ناو ئاراستەیەکی ئاینی و ئایدیۆلۆجی، بەڵام دەیانخاتە ناو ئاراستەیەکی واتەگەیێن، دەیانبات بەرەو جیهانی واتە، کە تێیدا نیشانەگەل دەچنە نێو جیهانی کراوەی واتە، ئەمەش

زنجیرەیەک کاردانەوە بۆ مانا دروست دەکا کە بەدەرن لە سیستمی یاسی.
بۆیە "گەل دەیەوێ رژێم بگۆڕێ" دەربڕینێکی کاتی نییە، دەربڕینێکە هەردەم
بە کراوەیی دەمێنێتەوە، کۆتاییی نییە و بنی نایەت.

## ئەنجام

## گەل داوای رووخانی رێژیم دەکا

مارکس قسەیەکی بەناوبانگی هەیە کە دەڵێ ئێمە وا باشە بوەستین لە لێکدانەوەی جیهان و دەست بکەین بەگۆڕینی. من پێم وایە ئەمە قسەیەکی هەڵەیە. ئەم کتێبە پشتگیرییەکە دەکرێ لە لێکدانەوەی رووداوگەلی کراوەی مێژوویی. لێکدانەوەی بەهاری عەرەبی بەو شێوەیەی من کردوومە هەر تەنیا قسە نییە بگرە راستییەکە کار دەکاتە سەر جێگرەوەی ئەو جیهانەی ئێمە لە دێبابمانەوە بۆمان ماوەتەوە و بەهیوای ئەوەین بەشێوەیەکی باشتر بۆ منداڵەکانمانی بەجێ بێڵین. ئەم کتێبە، لە سەری تا بنی، رێ و شێوازی منە بۆ پێوەندیکردن بە میسرییەکان و عەرەبەکانی تر لە مەغریبەوە بۆ سووریا، لە بەحرێنەوە بۆ یەمەن، کە هەموومان پێکەوە بەدەنگی بەرز هاوار دەکەین (بە شێوەزارە فارسییەکەی من): گەل داوای رووخانی رێژیم دەکا.

ئەم کتێبەم نووسی لە کاتێکدا رووداوگەلی کاریگەر روو دەدەن و پێیان دەگووترێ "بەهاری عەرەبی"، ئەوەی لەم کتێبەدا هاتووە دەبوایە باس بکرێ، وەک پانۆرامایەکی مێژوویی گرینگ بوو، هەروەها لە دیدێکی بیردۆزییەوە مانام بەخشیوە بە رووداوگەلی ئەودیو خێرایی راپۆرت نووسین. بەو قەناعەتەوە نووسیومە کە ئێمە، عەرەب و غەیرە عەرەب، دەبێ شەڕ بکەین لە پێناو بەهاری عەرەبی لە جیهانی بیرۆکەگەل بەهەمان ئەو شێوەیەی ئێمە تێ دەکۆشین لە شەقامگەل و گۆڕەپانگەل. رێژیمی مەعریفە کە بۆمان ماوەتەوە، هەر تەنیا لە جیهانی کۆلۆنیالەوە نایەت بگرە زیاتر لەودیو پۆستکۆلۆنیالەوە دێ، دەبێ ئەم رێژیمە هەڵبوەشێتەوە، بە ویستێک

هەڵبوەشێتەوە کە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا رێژیمگەلی سیاسیی رووخاند. هەرکە موبارەک، بن عەلی و قەزافی لە قاهیرە، تونس و تەرابلوس لەسەر تەخت راکێشرانە خوارەوە، بەهەمان شێوە دەبێ رێژیمی حوکمڕانی بەرهەمی مەعریفی لەبارەی جیهانی موسڵمان و عەرەبانەوە پەلکێش بکرێتە خوارەوە، واتە ئەو رێژیمەی لە پاریس، لەندەن و نیویۆرک حوکم دەکا. ئێمەش گەلێکین، ئێمەش دەمانەوێ رێژیم بڕووخێ. لەو دەستەواژە عەرەبییەدا، کە تەنێ بە پیتگەلی ئینگلیزی نووسیومە، لە رستە ئینگلیزییەکەدا تەعریبم کردووە، ئەمانە هەمووی لەبەر خاتری پاسەوانگەلی شۆڕشگێڕی بەهاری عەرەبی بووە. فەیلەسووفگەلی فرەنسیی ساختەچی، رۆهەڵاتناسە سەربازی و ساختەچییەکان، رۆشنبیرانی چەلاوخۆرانی ئەوروپی و، رۆژنامەوانە خانەنشینەکانی سەر بە ئیسرائیل پێکەوە کۆ بوونەتەوە هەوڵ دەدەن عەرەبەکان لە بەهاری شۆڕشگێڕیان بدزن. ئێمە دەبێ دژی ئەمە بوەستینەوە، هەروەها دەبێ رووبەڕووی ئەو سیستمانە بوەستینەوە بەهەمان ئەو هۆشیاری و سووربوونەی تونسی و میسرییەکان ستەمکارانی خۆیان لەناوبرد.

## نووسین وەک کارێکی هەرەوەزی

ئەو دەمە ئەم کتێبەم نووسی کاتێ کاریگەری رووداوگەلی کراوەی بەهاری عەرەبیم بەسەرەوە بوو، وەک چۆن کتێبێکم لەبارەی بزووتنەوەی سەوزەوە لە ئێران نووسی کاتێ شاگەشکە بووم بە ڕاپەڕینی جەماوەریی بزووتنەوەی مافەیلی مرۆڤ لەوێ. من پێم وایە، هەردوو رووداو (بەهاری عەرەبی و راپەڕینی بزووتنەوەی سەوز لە ئێران) پێوەندییان بەیەکەوە هەیە، چونکە بەڕاستی لە پێناو کرێکاران و قوتابیان بوون، هەروەها خۆپیشاندانی نارەزایی روویان دا لە دژی چەکی ناوکەیی لە یۆنانەوە بۆ ئیسپانیا، لەوێوە بۆ بەریتانیا و ویسکۆنسن، تا دەگاتە ژاپۆن، کە لەوێ بێگومان نارەزاییی

دژە چەکی ناوکەیی ئاکامەیلی قووڵتری هەبوو. نووسینی کتێبێک لە کاتی روودانی ڕاپەڕینێکی جەماوەریی سنووربڕ چەندان زیانی هەیە، بەڵام بەدەریش نییە لە سوود. تەماشاکردنی تەقینەوەی شۆڕشێک وەک تەماشاکردنی لەدایکبوونی منداڵێک وایە. هەرکە سەرنجی وردەکاریی ئەو خولەکەی لەدایکبوونەکە دەدەی، دەبینی موجیزەیەک هەناسە دەدا، بیرت دەفڕێ بۆ ئەو شتەی کە خۆت و هاوسەرەکەت چ پلانێک و دیدێکتان هەیە بۆ منداڵەکەتان. هەردوو توخمی رووداوەکە، توخمی مادی و خەیاڵی، دیالێکتیکن (سیستمی ئەقڵانی): هەردووکیان یەکتری دروست دەکەن و باسی یەکتر دەکەن. دێبابێتی ناکرێ بەبێ گرینگترین شتی سروشت، هەروەها دێبابێتی ناکرێ بەبێ خەیاڵکردنی داهاتووی منداڵەکەت. ئەم میتافۆرە سنووری خۆی هەیە، لەبەرئەوەی شۆڕش دێبابی مرۆڤایەتییە، شۆڕشگێڕەکانیش دێبابی شۆڕشن. بەڵام، هەروەک دەڵێن، منداڵان دەبن بەباشترین دێبابی دایک و باوکیان: ئەوان فێرمان دەکەن چۆن فێر بکرێن. هەمان شت راستە بۆ شۆڕش: ئێمەی خەڵکی ئاسایی شۆڕش بەرپا دەکەین، شۆڕشەکانیش ئێمە دروست دەکەنەوە.

من نەمتوانی ئەوپەڕی خۆشحاڵیی خۆم، ورووژانم، دڵخۆشیم، خۆشەویستیم بۆ بەهاری عەرەبی، یان بۆ بزووتنەوەی سەوز، بۆ منداڵ، پیر و دیندار و ئەوانی تر، پیاو و ئافرەت بشارمەوە کە رژانە سەر شەقامگەل، کۆڵانگەل و گۆڕەپانگەل هاواری چارەنووسی خۆیان و ئازادیان کرد. هێزگەل هەن دڕندەن، برسیی دەسەڵاتن و کوێرن لە راست بێتاوانیی ئەو هاوارکردنە، ئەو هێزانەن کە هەردەم وەک سێبەر بەدوای گەلانی ئێمەوە بوونە. چەندان داو، تەڵە، دڕندایەتی و لێکترازاندن لە بەردەممانە. ئەمە شەڕێکی مێژووییە، جیهانیش هەمووی تەماشا دەکا. ئەوەی من لەم کتێبەدا نووسیومە بەپێی پێویست سنووردارە لەبەر یەکسەر نووسینی و گرانەوەی دراماکە، هەروەها سنووردارە لەبەر خەیاڵی ورووژاوی

بۆچوونەکان کە دەبێ ستەمکاران بەزووترین کات دان بە کوێرایەتیی خۆیان بنێن. هەردووکیان، کوێری و ستەم، هەردەم پێکەوە دێن و ڕێ بەیەکتری دەدەن: نەک هەر تەنێ ئێستە، لە گەرمەی بەهاری عەرەبیدا، بگرە سەت ساڵی تریش هەروا دەبن ئەو دەمەی چوارچێوەی مەرجەع زۆر لەمەی ئێستە فراوانتر دەبێ.

## شۆڕشگەلی کۆتاکراوە

ئەو بیرۆکە سەرەکییانەی من لەم کتێبەدا باسم کردوون لەسەر بنچینەی درامایەکی کۆتاکراوە (بن نەهاتوو)ی ڕاپەڕینگەلی شۆڕشگێڕین کە، من پێشنیاز دەکەم، کۆتاییی دەمی پۆستکۆلۆنیالیتی ڕادەگەیەنێت، هەروەها، من دەڵێم، ئەم شۆڕشانە واتە ئازادبوونی گەلان لە چنگ چەندان دەیەی داگیرکاریی ئەوروپا و وەنەوزی ئیمپراتۆری ئیمپراتۆری عوسمانی. دوو ئیمپراتۆریەتی گەورە و ڕکابەر، سۆڤیەت و ئەمەریکا، ڕکابەری باڵادەستیی یەکتریان کرد لە جیهان لە کاتی جەنگی ساردا، کە کۆنترۆڵکردنی نەوت و نەخشەی ستراتیجیی گرتەوە کە پێیان گوت "ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست". ئەزموونگەلی زیندووی گەل لە خەبات لە دژی ستەمکاری ناوخۆ و باڵادەستیی بیانی فێریان کردن کە ئەم شتانە بەتاڵن، ئەم نەخشە تایبەتییەی جیۆپۆلەتیک کە ئەوان دایان ناوە، ئەویش بەتاڵە. لە کۆتاییی دۆخی پۆستکۆلۆنیالیتدا، هەرکە داگیرکاریی ئیسرائیل بە نیگەرانییەوە تەماشای واقیعی وشەکە دەکا، هەروەها لە کاتێکدا کە ڕەوتی تیۆری مارکسی دەوەستێ و ماوەی ئیمپریالیزمی کلاسیک کۆتای هات و چووینە ناو سەردەمی ئیمپراتۆریەت، جۆرج دەبلیو بوش دوو شەڕی کرد، لە ئەفغانستان و عێراق، لەسەر سیستمی کۆنی داگیرکاری، لە هەمان کاتدا ئیسرائیلیش وەک نیوچە ئیمپراتۆریەتێک کاری دەکرد چونکە خزمەتی گەورەترین سیستمی هێزی ئاسمانیی ئەمەریکیی دەکرد و تژی بوو لە چەکی وێرانکەر لە دەریای

ناوەڕاست. سەرکەوتنی کۆتاکراوەی شۆڕشەکان کە لە ناوچەکەدا رووی دا ئێستە کۆتاییی بەو سیاسەتە چەوتە هێناوە، بە ئەنجامدانی ئەم کارەش دی ئێن ئەی کولتووری سیاسی کە تێگەیشتنی ئێمە لە رووداوەکان دەخاتە ناو چوارچێوەوەوە، گۆڕاوە.

راپەڕینگەلی دیموکراتی ژمارەیەک خاسیەت پێشان دەدەن. زیاتر پشت ئەستوورن بە کایەی کۆمەڵایەتی و ئابووری نەک سیاسی. توندوتیژییان تێدا نییە: ئەکتەرە سیاسییەکانی پڕ چەک نین بە ئایدیۆلۆجیاکان. پۆست ئایدیۆلۆجین، لەو سۆنگەیەی کەوا لە دوای شەکەتبوونی پێکهاتە ئایدیۆلۆجییەکان بەهۆی سەردەمی پۆستکۆلۆنیالیتی روویان دا بە زاراوەی ئیسلامی، کۆمەڵایەتی و ناشنالیستی. پشت دەبەستن بە بەڵگەی راستەقینەی خراپیی باری ئابووری، پەراوێزخستنی کۆمەڵایەتی، گەندەڵیی سیاسی و قێزەونیی کولتووری کە لە ماوەی نیو سەدەی پۆستکۆلۆنیالیتیدا روویان دا، بۆیە سێ پێکهاتەی سەرەکیی کۆمەڵایەتی پێناسەیان دەکا: یەکەتییەکانی کرێکاران، رێکخراوەیلی مافەیلی ئافرەتان و ئەنجوومەنگەلی قوتابیان، بەفراوانترین مانای ئەو بزووتنەوانە. هەموو ئەو هۆکارانە پێکەوە دێن و یەک ئامرازی ناڕەزایین بۆ نموونەی ئابووریی نیولیبرال کە سەرچاوەی نەخۆشییە لە جیهاندا، بۆیە ناشکرێ ببێتە بەشێک لە چارەسەر. ئافرەتان رۆڵێکی سەرەکییان هەیە بیگێڕن لە راپەڕینگەل چونکە پیاوسالاری و رک لە ئافرەتان دوو پێگەی سەرەکیی دۆخی کۆلۆنیال و پۆستکۆلۆنیال بوونە. ئەوەی تازە رۆڵێکی هێندە بەرچاویان نییە، ئەویش لەبەر راستیی سادەی دیمۆگرافی کە کاتێ ئەخلاقیاتی کۆرپە لەو کۆمەڵگەیانەدا رما، پێوەری ژیان و بوون بەشێوەیەکی رێژەیی باش نەبوو، بۆیە گەنجان یان ئەوەتا دەبێ بمێننەوە و شەڕ بکەن لە پێناو ئازادی، شکۆمەندی و دادوەریی کۆمەڵایەتی یانیش پێوەندی بکەن بەو ٣٠٠ ملیۆن کەسەی جیهان، گەلێکیان لە کار دەگەڕێن لە باکور و تووشی

ڕەگەزپەرستییەکی توندی کۆمەڵگەکانی ئەورووپی دەبنەوە. ئەمانە شۆڕشگەلی کۆتاکراوەن، لەبەرئەوەی ڕەگی قووڵیان داکوتاوە لەنێو کایە مێژوویییەکاندا، کە تەنیا و وەها ئاسان چارەسەر ناکرێ بە لادانی موبارەک لێرە و قەزافی لەوێ.

لەبەر هەندێ من پێم وایە ئەم شۆڕشانە زیاتر بە ڕۆمان دەچن تا داستان. هیچ پاڵەوانێک، هیچ جەمال عەبدولناسرێک، ناڵێ گەنجان زۆرینەی پاڵەوانەکانی ئەم شۆڕشانەن. ئەمە بۆ بەمنداڵکردنی شۆڕشگەل نییە (شۆڕشی فرەنسی، ڕووسی و ئێرانی بەتەواوی کاری پیرەکان نەبوو، هەموو شۆڕشێک لەلایەن گەنجانەوە دێتە جێبەجێکردن)، بگرە بۆ داننانە بە ڕاستییەکی دیمۆگرافی. خۆشبەختانە، ئەم شۆڕش کۆتاکراوانە ناچنە ناو قاڵبی مێژوویی گەندەڵی و یاخیبوونەوە. میکانیزمێکی خۆپاککردنەوەیان هەیە. ئەو فەزا گشتییەی دروستی دەکەن فراوانتری دەکەن وەک کارێکی ڕۆتینی دیموکراسی کە داوای دەکەن. ئەمە لەبارەی دروستکردنی بازاڕێکی ئابووریی کراوە نییە وەک مانیفێستۆیەکی دیموکراسی وەک ئەوەی ئێمە لە ئەفریقیای باکور و ئەورووپای ڕۆژئاوا دەیزانین. ئەمە مانای ئەوە نییە کە ڕاپەڕینگەل کاری شۆڕشگێڕە سۆشیالیستەکانە، بەڵام ئەوەی کاریگەری لەسەر کارنامەکە هەیە فەزای گشتییە، نەک موڵکی تایبەتی.

جیهانیبوونێکی نوێبووەوە هەیە لەبارەی ئەم شۆڕشانەوە کە ڕاستکردنەوەکەی گرامسی بۆ گەردوونگەری کانت دووپات دەکاتەوە، ئەمە لە کۆتاییی شەکەتبوونی پرۆژەی مۆدێرنیتەی ئەورووپی و ڕۆتینی پۆستمۆدێرنیتەوە دێ. هەر بۆ دڵنیابوون، بەرەنگارییەکی توند و درێژخایەن دەبێ بۆ ئەم شۆڕشانە: لەلایەن لۆکالی بژاردە، موبارەکە بچووکەکان، ئەمەریکا، ئیسرائیل، سعوودیە، کۆماری ئیسلامی، حزبوڵڵا و سووریا. ئەمە باندێکی زۆر سەیرە کە بەڕێیەک لە ڕێیەکان پێکەوە دێن بۆ وەستاندنی ڕاپەڕینگەلی دیموکراتی چونکە بەلایەنی کەم بەسەرێک کەوتوونەتە ژێر

هەرەشەوە. ئاخۆ لە راستیدا باڵی چەپ پێوەندی بەو باندە سەیرە دەکا، کە ئەگەر بێتو پێوەندی نەکا بە راپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی و زیاتر دوورەپەرێزی هەڵبژێرێ ئەوا دەچێتە ناو لیستی هێزەیلی دژە شۆڕش؟ جیهانیبوونی نوێبووەوەی ئەم شۆڕشانە داوای بیری نوێ دەکا کە مەیلی فێربوونیان هەبێ لەم شۆڕشانە و واز لە رێڕەوی ئەقڵانیەتی خۆیان بێنن و چیی تر هەوڵ نەدەن خەڵکی فێر بکەن.

ئەم جۆرە هێزمیلەی دژە شۆڕش ناتوانن راپەڕینگەل هێواش بکەنەوە: لە راستیدا دایاندەکوتن و بەهێزیان دەکەن، وا دەکەن گۆڕانەکان زیاتر بەرگە بگرن. ئەو کاتەی پێویستە بۆ هەموو ئەو کارانە نازانرێ، کات بەهەدەردانیشە دانیشی مەزندە بکەی بزانی چەندی دەوێ. شۆڕشەکان پێویستیان بە هۆشیارییەکی ئێجگار زۆر هەیە لەلایەن خەڵکییەوە، دەنگی گەل زۆر گرینگە بۆ شۆڕشەکان. ئەم جۆرە سەرنجدانە سەرچاوەی بیرتیژین. لە ئەنجامدا، شۆڕشەکان لەوانەیە ئاژاوە بن لە هەڵوەشاندنەوەی پێگە سیاسییەکان، ئەمەش بواریان پێ دەدا دەسکەوتەکانیان بە زاراوەی کۆمەڵایەتی دەربڕن و زیاتر سەرنجی دەستەیلی خۆبەخش رابکێشن. ئامێری بێ ئەرکی دەوڵەت هەر دەمێنێتەوە، بەردەوام توندوتیژی هەر بەکار دێنێت، تا ئەو کاتەی ئەم دەستە خۆبەخشانە بەدامەزراوەیی دەکرێن، لەم کاتەدا وڵات دەتوانێ خۆی خۆی دووبارە بنیات بنێتەوە لەسەر بنچینەیەکی کۆمەڵایەتی، ئەوجار شەرعیەتی دەبێ. تا دروستکردنی ئەم دەستە کۆمەڵایەتییە خۆبەخشانە، هەر وڵاتێک هەبێ لەژێر کاریگەریی ئیمپریالیزمدایە و بێهێزە، بۆیە من دەڵێم ئەمانە شۆڕشن، هێشتا تەواو نەبوون و کۆتاییان کراوەیە.

## هەڵوەشاندنەوەی ڕێژیمی مەعریفە

سروشتی کۆتاکراوەی شۆڕشەکان پێویستییەکی مێژوویی و بەرهەمی مەعریفیی سیستماتیکی تێدایە لەبارەی ئەو ڕووداوانەی کە دەبنە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئەو ڕێژیمە مەعریفییەی کە ئێمە لە مێژووی داگیرکاری و ژێردەستەییدا بۆمان ماوەتەوە. کاتێ شۆڕشی فەرەنسی ڕووی دا و بیرۆکەکانی ژان ژاک ڕۆسۆ و ئیمانوێل کانت لە ڕەگ و ڕیشەوە ژیانەوە بۆ خوێندنەوەی ڕووداوگەلی خۆشیبەخش، ئەمانە بوون بناخەی تیۆری ئەو شتەیان دانا ئەمڕۆ ئێمە پێیان دەڵێین "شۆڕش". کاتێ شۆڕشی ئەمەریکی ڕووی دا، ئەلێکسیس دو تۆکڤیل سەردانی ئەمەریکای کرد و "دیموکراسی لە ئەمەریکا"ی نووسی، کە تا ئێستە هەر بەردی بناخەی تێگەیشتنمانە لە ڕووداوێکی مێژوویی جیهانی و ئاکامەکانی. کاتێ شۆڕشگەلی ١٨٤٨ (بەهاری نەتەوەکان و بەهاری گەلان) دەستیان پێ کرد، کارل مارکس لەوێ بوو و لەسەر هۆ و ئەنجامەکانیانی نووسی. لینین و ترۆتسکی سەرکردایەتیی شۆڕشی ڕووسیی ١٩١٧یان کرد و لەبارەیانەوە نووسی. شۆڕشی جەزائیر لەلایەن فرانتز فانون بەتیۆر کرا. کاتێ بزووتنەوەی کۆمەڵایەتیی ئایاری ١٩٦٨ ڕژایە سەر شەقام لە فەرەنسا، جان پاوڵ سارتەر و مایکل فۆکەڵت لەوێ بوون بۆ هێنان و بردنی ئاراستەکانی. یەکەم و دووەم ڕاپەڕینی فەڵەستینییەکان ئێدوارد سەعیدیان هەبوو بۆ کردنەوەی گرێکان بۆ جیهان. کاتێ بلۆکی ڕۆژهەڵات ڕووخا، فرانسیس فوکویاما و ساموێل هەتینگتن لەوێ بوون بۆ باسکردنی ساتەکانی سوود و قازانج بۆ ئیمپراتۆریەتی ئەمەریکی. شۆڕشەکان پێویستیان بەوەیە بخوێنرێنەوە، لێکدانەوەیان پێوەندیی هەیە بەو ڕێیەی ئێمە جیهانی پێ دەگۆڕین.

ئەی بەهاری عەرەبی؟ ئاخۆ ڕاپەڕینگەلی شۆڕشگێڕی وەها ئاسان گرێ دەدرێ بە ڕێژیمی مەعریفە، بەو ڕێیەی ئەمەریکییە نیولیبراڵەکان لەسەری

دەڕۆن بۆ لەخۆگرتنی ڕەوتە سیاسییەکان بۆ ناو سەرمایەداریی جیهانی؟ ئەی ئەو بیرۆکە رادیکالییانەی ڕاستەوخۆ پێوەندییان بەو ڕاپەڕینگەلە شۆڕشگێڕییە هەیە؟ ئەرکی بوون بە قوتابییەکی لێهاتووی ڕاپەڕینگەل و بینینی ئەوەی کە خۆیان مەعریفە بەرهەم دێنن، ئەرکێک بەقەد هێندەی شۆڕشەکان گرینگە. هەر بۆ دڵنیابوون، خۆشبەختانە ئێمە چیی تر لە سەردەمی تیۆرسازی و قسەی گەورە و بریقەداری فەیلەسووفان نین، باوی ئەوە نەما. لە کاتێکدا چەپە کانتییەکان کە تێ دەکۆشان بۆ شۆڕشی تێکڕا و لە دوای شۆڕشی فەرەنسییەوە هاتن، نێردراوی ئەوپەڕی توندڕۆییان بەرهەم هێنا وەک نیچە، هایدگەر، فۆکەڵت و دریدا. من بیرۆکەی شۆڕشگەلی کۆتاکراوەم سازاندووە، شۆڕشەکان هێشتا لە پێشکەوتندان، تەواو نەبووینە، وەک بیرۆکەیەکی کار بۆ پاراستنی کاریگەری و لایەنەکانی ئەم شۆڕشانە بەزیندوویی و بێگەردی.

لە ڕووی گەڕان بەدوای ڕەوتێکی نوێ و گونجاوی مەعریفە، چەپ بەشێک لە کێشەکە، نەک چارەسەر. چەپی عەرەب و غەیرە عەرەب دەبێ دەرکەون و بەشدار بن لە شۆڕشەکان، بۆ ئەوەی بەربەستی بەردەمیان هەڵگرن. بێگومان، ئەمەریکا و ناتۆ و کۆمپانیاکانی نەوت چییان پێ بکرێ دەیکەن بۆ کپکردنەوەی شۆڕشەکان. باشە ئەی چەپەکان چۆن وەڵامی ئەمە دەدەنەوە؟ دەبێ کار زیاتر بکەن نەک هەر تەنیا وتار بنووسن بۆ (لەندەن رڤیو ئۆف بوکس) و هەموو شەو شتانە بە کازیوەیەکی نابەجێ و هەڵە حسێب بکەن. لەبەرئەوەی ئێستە کازیوەی ڕاستەقینە و سیاسەتی نوێی هیوا و ئازادیخواز زۆر خێرا بەسەرماندا تێپەڕ دەبێ. ئەوەی لە چەپەکان دەمێنێتەوە زۆر نابەجێیە لەوەی دەیانەوێ بە نیولیبرالەکان بگەن، لە هەمان کاتدا خەریکە ئێکسپایەر دەبن، دەبێ بەباشترین شێوە پشتگیریی خۆیان بۆ شۆڕشەکان، چالاک و ناچالاک، دەربڕن، نەک بێن پشتگیریی ستەمکاری بکوژی وەک بەشار ئەسەد بکەن. هەروەک فەواز تەڕابلوسی، ڕۆشنبیری

پێشەوای لبنانی، هەروەها یەکێکیشە لە مێژوونووسە هەرە مارکسییەکانی نەوەی خۆی، بە وردی و بوێری باسی دەکا:

بەپێچەوانەی بەلاغی سووریا کە بووەتە هێزێکی دژە داگیرکار لە ناوچەکەدا، رەوشی ئابووریی سووریا لەژێر سایەی بەشار ئەسەد زۆر بەخێرایی و بەخراپترین شێوە بە نیولیبرالی کراوە، هەروەها سیستمی ئابوورییەکەی تژییە لە گەندەڵی و قۆرخ و پاوانکردن. پیشەسازیگەلی بەرهەمدار کە عادەتەن کار بۆ گەنجان پەیدا دەکەن رووی لە کەمی کردووە و رەوشی ئابووری داتەپیوە و بووەتە ئابوورییەکی بەکرێگیراو. چینگەلی بۆرژوازی بێگومان سوودیان بینیوە و هەروەها هەندێ سامانیش دزەی کردووەتە نێو چینی مامناوەند، بەڵام لەولاشەوە رێژەی هەژاری بەردەوام لە بەرزبووندایە و کەرتی کشتوکاڵ و لادێ بەتەواوی خراوەتە پەراوێزەوە. بۆیە ناوچە هەژارترەکانی ناو سووریا ئامادەتر و خێراتر لە چاو ناوچەکانی تر راپەڕین.

راشکاوان پرسیاری لێ کران "ئاخۆ شەپۆلی راپەڕینگەلی جەماوەری هانی باڵی چەپی عەرەبی دەدا لە ئەگەرەکانی دیموکراسی بڕوانن کە کۆتاییان نایەت لەگەڵ کزبوونی داگیرکاران لەگەڵ ستراتیجگەلی بەرەنگاربوونەوە کە ناچێتە ناو قالبی جەماوەری عەسکەرتاریەت؟ تەڕابلوسی بەم شێوەیە وەڵام دەداتەوە:

باڵی چەپ نەریتێکی لەمێژینەی هەیە لە خۆشویستنی دیکتاتۆرەکان، شەرعیەت بەخۆیان دەدەن لەژێر ئەم ناوە "دیکتاتۆریەتی پرۆلیتار" و... تاد. من پێم وایە هێشتا لەمە چاک نەبوونەتەوە. چەپی عەرەبی هاوپەیمانییان بەستووە لەگەڵ رژێمگەلی چەوسێنەر لە رابردوودا. ماوەیەکی درێژ بوو، وەک

کەللەڕەق و بەرھنگار چاو لە ڕژێمی سووریا دەکرا، تاکە وڵاتە تێیدا پارتی کۆمۆنیست ئاسایی بوو (بێگومان لەژێر پێوەندگێکی توند). کەواتە، نەریتێکی درێژی خەیاڵیی سۆشیالیزم هەیە و نادیموکراتین. زۆر کەس لەنێو باڵی چەپ زاڵ نەبووە بەسەر ئەم مێژووەدا. هەندێکیان دیموکراسیسیان ناوێ، وەک بۆرژوازیەت و شێوەیەکی کۆنترۆڵی ئەمەریکا چاوی لێ دەکەن. لە باتیان، شتێکیان دەوێ بە دیموکراسیی سۆڤیەت بچێ، بەڵام یەکێکیان دەوێ ئەمەیان پێ بدا. ئەوانی تر پێیان وایە دیموکراسی دەتوانرێ بێتە دەستەبەرکردن بەهۆی دەسوەردانی بیانی یان بەهۆی چەند گۆڕانێکی دەستووری. دیموکراسی پرۆسەیەکی شۆڕشگێڕییە. ناتوانی دیموکراسی هەنارده بکەی، پرسەکە خۆتی: دروستی دەکەی یان نا. لەم دیدەوە پێشڤەچوونێکی باش دەبینین لە جیهانی عەرەبیدا، خەڵک باجێکی قورسیان داوە بۆ دەسکەوتی سەرەتاییی دیموکراتی و دژە عەسکەرتاریەت، وەک رووخاندنی سەرۆکی چەندان ساڵ لانەدراو و لەدادگەدانیان....
کەواتە خەڵک دیموکراسیی دەوێ و دەبێ بڕوای پێ بکرێ، یانیش هەر لایەنگری ڕژێمی عەسکەرتار دەبن، باشە، لێ گەڕێ با چاوەڕێ بکەن. دیموکراسی پرۆسەیەکی مێژووییە و چەندان ساڵی دەوێ.

کەس ناچار ناکرێ کۆک بێ بەهەموو قسەکانی فەواز تەڕابلوسی و سەرسام بێ بەقسە راشکاوەکانی، بەهۆیانەوە پێگەی چەپ بزانێ و هیوای داهاتوو بخوازێ لە ڕێی ڕووبەڕووبوونەوەییەکی ورد و ئازارهێن لەگەڵ مێژوو. هەر تەنێ چەپ نییە، یان بۆ ئەو پرسە تەنانەت باڵی چەپی پەرپووتیش نییە، کە تێ دەکۆشێ بۆ بینینی بەهێزەکان لە بەهاری عەرەبیدا، بگرە ئیسلامیزمیش دەستی هەیە لەو ڕژێمە هەڵەیەی مەعریفە.

ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئیسلامی ئەمڕۆ تەواو بووە یان موسڵمانان چیی تر ڕۆڵی سیاسیی گرینگیان نییە بیگێڕن. بەڵام پرسەکە ئەوەیە کە وەک ئایدیۆلۆجیایەکی سیاسی ئیسلامیزم خۆشی شەکەت کردووە. ئێستە ماوەیەکە، سکۆلەرانی وەک ئەسیف بەیات باسی سەردەمی دوای ئیسلامیزم دەکەن. ئەم سەردەمی دوای ئیسلامیزمە نزیکە لە سەردەمی دوای ئایدیۆلۆجیا، بۆیە ئاماژکەیە بە کۆتاییی پۆستکۆلۆنیالیتی وەک ڕەوتێکی بەرهەمی مەعریفی و ئایدیۆلۆجی. ئیسلامیزم ژیانێکی چەواشکراو و درێژی هەبووە و دەوستێتە سەر (١) دەوڵەتی جوولەکە، (٢) ئیسلامۆفۆبیای ئەورووپی و ئەمەریکی، (٣) عەلمانیەتی خودپەرست و (٤) تێکەڵەیەکی پیسی نیولیبرالیزم و نیوپارێزکار و ئەو ئیمپراتۆریەتەی کە ئەوان قیتی دەکەنەوە. سیستەمگەلی هەڵە، کە ئیسلامیزم و عەلمانیەتی دوو نموونەی ئەو سیستەمانەن، ژیانێکی سنووردارییان هەیە. ڕۆژئاوا ئیسلامیزمی دروست کرد. ڕۆژئاوا ئێستە لە ناوەخۆدا تەقیوەتەوە و لەگەڵ ئەو تەقینەوەیە ئیسلامیزم دەستی پێ کرد. ئیسلامیزم کۆزمۆپۆلیتانیزمی ئیسلامیی نەهێشت، کە پشتی دەبەستا بە جیهانیبوونی مێژوویی. ئێستە، لەگەڵ هاتنی بەهاری عەرەبی، کۆزمۆپۆلیتانیزمێکی نوێ سەر هەڵدەدا.

هەڵوەشاندنەوەی ئەو ڕێژیمی بەرهەمی مەعریفییەی بۆمان ماوەتەوە ئەرکێکی درێژخایەن دەبێ، بەڵام بەهاری عەرەبی بیرۆکە، چەمک و ڕەچە و میتافۆری پێشەنگی خۆی بەرهەم دێنێ.

### ئەو شتانەی خەونیان پێوە نەدی لە فەلسەفەکەیاندا

تێگەیشتنی تازە لە بەهاری عەرەبی زۆری ماوە فێر بێ لە بارودۆخەیلی شۆڕشگێڕی پێشوو لە سیاقێکی بەراوردکار و سنووربڕ. لە دیراسەکەی لەبارەی سەرچاوەگەلی فەلسەفی و نارازیبوونی کۆمەڵایەتی لە ڕۆسۆوە تا مارکس و نیچە، بێرنارد یارک باس لە هاودژی سەرەکی دەکا لە

پرسیارکردن لەبارەی ئەو شتەی ئەو ناوی لێ دەنێ "شۆڕشگەلی تێکڕا".
یاک بەدوای تەزوویەکی هزردا دەچێ لە ڕۆسۆوە تا دەگاتە ئەو شتەی پێی دەڵێ "چەپی کانتی" (لە شیلەرەوە تا دەگاتە هیگڵی گەنج" و پاشان لە نیچەوە بۆ مارکس کە تێیدا دامەزراوەگەلی ناشیرینکردنی مرۆ لە کۆمەڵگەی مۆدێرندا وەک بەربەست دەخوێندرێنەوە لە بەردەم بەدەستهێنانی مرۆڤایەتییەکی تەواو. هیگڵی گەنج ئەمەی بە ڕێڕەوێکی تاریک ناوبرد، بۆ ئەوەی ئێمە ببین بە مرۆڤێکی دەبێ چیی تر مرۆڤ نەبین. بەڵام نیچە و مارکس پێیان وابوو کە زاڵبوونە بەسەر ئەو بەربەستە میسالییە بەهۆی ویستی شۆڕشی تێکڕا. بەڵام یاک دووپاتی دەکاتەوە کە ئەمە لە راستیدا حاڵی دامەزراوەکانی بەهێزتر کرد. یاک پێشنیاز دەکا "قسەکانی ئەمان هیچ نییە جگە لە پێویستییەک بۆ ئەو مشتومڕەی کە بەشێوەیەکی بەرچاو سەرکەوتوو بووە لە دنیای قسە و مشتومڕدا.

لە دیدی جیهانی دەرەوەی ئەوروپا، کە زۆربەی ئەم گفتوگۆیانە ئەو جیهانە ناگرێتەوە، هاودژیی فەلسەفی کە یاک باسی لێوە دەکا لە جەرگەی مۆدێرنیتەی شۆڕشگێڕی ئەوروپی لە ڕێی پێگەیەکی شرۆڤەی فەلسەفی کە لە راستیدا لەناو ناخی سروشتی دۆخگەلی داگیرکاری و ژێردەستەییدایە، بۆیە ئەم جیهانە بە گشتی ئەزموونی هەموو ئەمانەی کرد. خەڵکی ژێردەستە پێیان گوترا ئەوا ئازادن بیر لە خۆیان بکەنەوە لە دەرەوەی تاریکی لەو دەمەی کە دەمانچەی داگیرکاران لەسەر سەریان بێ، پاشان ئەو دەمەی بیر لە رزگارکردنی خۆیان بکەنەوە بە زاراوەی دیالێکتی ناوەخۆی داگیرکاری و دژە داگیرکاری، کە بەمانە دەگوترێ پۆستکۆلۆنیالیزم.

لە ناوجەرگەی مشتومڕەکەی یاکدا، مەیدان و رەوتگەلی مۆدێرنیتەی ئەوروپی هەیە. ئەمەش پرۆژەیەکە کە، هۆلۆکۆستی بەسەر ئەوروپادا سەپاندووە، دواجار ویستی چارەی خۆی بکا و لەناو پۆستمۆدێرنیتەدا خۆی ببینێتەوە. ئەو مۆدێرنیتەیە هەرگیز پرسێک نەبووە بۆ جیهان لەوپەڕی

وەرگرتنی داگیرکاری. مۆدێرنیتە هەرگیز نە کێشە بووە نە چارەسەر بۆ ئەو خــەڵکەی لە مــەیدانگەل و رەوتگەلی داگــیــرکــاریی ئەوروپادا دەژی. بەمۆدێرنکردنی میسر، وەک تیمۆسی میشێل باسی دەکا لە کتێبەکەی بەناوی "داگیرکردنی میسر، ١٩٩١"، واتە داگیرکردنی بەشێوەیەکی نوێی مۆدێرنیتەی ئەوروپی، واتە دروستکردنی، فەرمانپێکردنی، لەتلەتکردنی و برینی و تێپەڕاندنی بەپێی ئارەزووەکانی داگیرکاران. مۆدێرنیتەی ژێردەستەیی بووە نانی میسرییەکان، نەیانتوانی لە دژی مرۆڤایەتیی خۆیان بنوێنن بەشێوەی دژە مۆدێرنیتەی داگیرکاری، مۆدێرنیتەیەک کە بەسەر رووی ئەوروپادا درایەوە بەهۆی هۆیەکی شۆڕشگێڕی (نە گشتی و نە ئالەتی) کە پێناسەی جیهانێکی کەللەڕەقیی کرد چونکە حوکمی سەرمایەدار و داگیرکارانی رەت کردەوە. مۆدێرنیتە کێشەیەکی ئەوروپی بوو کە هەردەم دژی خۆی دەهاتەوە لە کامپەکانی ئەوروپا، دواجار، هۆلۆکۆست (کە تا ئێستە فەڵەستینییەکان باجەکەی دەدەن). پۆستمۆدێرنیتە کۆتاییی بە کێشەیەکی ئەوروپی هێنا (بەهۆی کردنی خەڵک بە شت، شتەکانیش بە ئالیەتی بەرهەمهێنان) بەڵام بەگشتی بۆ جیهان ئەمە هیچ مانایەکی نەبوو. ئەمە بەسەرێکی تر راستیشە بۆ تەنگژەی مرۆڤایەتی و دوای مرۆڤایەتی. لە کاتێکدا ئەوروپییەکان رێیان بۆ هۆلۆکۆست خۆش دەکرد، جیهانی دەرەوەی ئەوروپایان تێک دا، دزییان و چەواشە کرد.

زاڵبوون بەسەر دۆخی پۆستکۆلۆنیالیتی کۆتاییی "رۆئاوا" رادەگەیەنێ، چونکە رۆئاوا خۆی مەردی بۆ ئەو دۆخە دانابوو و "ئەوانی تر"ی بەپێی خواستەکانی خۆی دەخوێندەوە و دەگێڕایەوە. بەهاری عەرەبی دەسپێکی ساتێکە بۆ رزگارکردنی جیهان کە ئەم "رۆئاوا"یە تێکی دابوو و چەواشەی کردبوو (کۆدی رۆئاوا سەرمایەدارییە). بیرۆکەی شۆڕشگەلی کۆتاکراوە کە من لێرە پەرەم پێ داوە لە دژی بیرۆکەی "شۆڕشگەلی تێکڕا" دەوەستێتە سەر پێگە تایبەتییەکانی بەرەنگاربوونەوە بۆ سەرمایەدارییەکی پیس و ئەو

ئیمپراتۆریەتەی کە خزمەتی دەکا. چەندە ئیمپراتۆریەتەکە کاریگەر و پیس بێ دەبێ هێندە پێگەی بەرهنگاربوونەوەکە تایبەت بێ. بەڵام ئیمپراتۆریەتی کاریگەر خواستێکی پۆستمۆدێرنە بەسەر ویستی مۆدێرن بۆ زاڵبوون بەسەریدا، ئەمەش رووی دا دوای کۆتایی ئایدیۆلۆجیاکان. بۆ بەرهنگاربوونەوەی ئیمپراتۆریەتەکە ئێمە دەبێ هەردەم لە ناوچەکانی خۆمان سنووردار بین، پێمان سووک بێ و خێرا بین، هەروەها چاو و بیرمان کراوە بێ. بۆیە عالیە سلێمان و عەباس کیارۆستەمی لە کۆتایی پۆستکۆلۆنیالیتدا دەمێننەوە، لە کاتێکدا مەحموود دەروێش، نازم حیکمەت، فەیز ئەحمەد فەیز، ئەحمەد شەملون، ڤلادیمیر مایاکۆڤسکی و پابلۆ نیرۆدا (نێردراوانی توندڕۆی) لە مۆزەخانە و کتێبخانەکانماندا دادەنرێن. ئەوانە بەرهەمی داگیرکاری و پاڵەوانانی سەردەمی پۆستکۆلۆنیالی بوون. لەگەڵ ئەوەشدا هۆیەلی خلاسبوونی مەحموود دەروێش وەک شاعیرێکی زیندوو هەمان ئەو هۆکارانەن بۆ نزیکبوونەوەی کۆتایی ئیسرائیل. ئەگەر ئیسرائیل ملکەچ نەبێ و بەشداری لە بەهاری عەرەبی نەکا، هەروەها پشتیان لە پرۆژەی زایۆنی نەکەن، ئەوا ئیسرائیل وەک داگیرکارێک دەمرێ و وەک پۆستکۆلۆنیالێک فەشەل دێنێ.

ئەگەر لەسەر ئەو هاودژییە سادەیەی کە یاک نەخشەی بۆ کێشاوە لێکۆڵینەوە بکەین، ئەوا هاننا ئارندت بە یەکەم تیۆریستی شۆڕش لە"چەپی دوای سەردەمی کانت" دادەنرێ کە زۆر دوور بوو لە هزری "شۆڕشی تێکڕا"، جیاوازیی کرد لە نێوان شۆڕشی فرەنسی (کە بەلای ئەو لەم شۆڕشەدا پرسگەلی کۆمەڵایەتی چەقی شۆڕشەکە بوون) و شۆڕشی ئەمەریکی (کە بەلای ئەو پرسگەلی سیاسی تا کۆتایی کاریگەر و چەق بوون). ئارندت بازنەی گشتی (خەڵک) بە چەقێکی سیاسیی دادەنا، فەزایەک تێیدا ئەمە درکی پێ دەکرێ: ئازادی لە ترس و سەرخۆبوون بۆ پیادەکردنی مافەیلی دیموکراتی. لە هزری سیاسیی ئەورووپیدا لە رۆسۆ و چەپی کانتییەوە بگرە

تا دەگاتە کارل مارکس بیرۆکەی "شۆڕشی تێکڕا" زاڵە و بەردەوام باسی لێوە دەکرێ. لەژێر سایەی هۆلۆکۆستی ئەوروپی و لێدانی ژاپۆن بە چەکی ناوکەیی لەلایەن ئەمەریکا، دەسوەردانە رەخنەییەکەی ئارندت لە شەستەکان لەسەر هیچ بنەمایەکی مێژوویی شۆڕشدا بنیات نەنرابوو. ئێستە بەهاری عەرەبی وامان لێ دەکا جارێکی تر بیر لە بیرۆکەی شۆڕش بکەینەوە، لەبەر بوونی پێگەیەکی رەخنەیی سێگۆشەی چەپی کانتی، کە ئارندت دووپاتی دەکاتەوە: ئێمە دەتوانین لە بیرۆکەی شۆڕشێکی کتوپڕ، تێکڕا و یەکجارەکی دوور کەینەوە، ئەمە جۆرە گێڕانەوەیەکی رزگارکردنە کە وا لە بابەتەکە دەکا وەها بناسرێ کە پرۆژەیەکە خۆی دەدۆڕێنێ. بیرکردنەوە لە رێی پێگەی رەخنەیی هەنا ئارندت بەرامبەر بە مارکس، هەروەها بەهۆی چەپی کانتی، دەتوانین بیر لە شۆڕشی کۆتاکراوە بکەینەوە بەهۆی نزیککردنەوەی ترۆتسکی لە ئارندت نەک لە مارکس و لینین، ئەمە پێشنیازێکی رێژەییە لە دروشمی سەرەکیی بەهاری عەرەبی کە بریتییە لە "بەردەوام شۆڕش". تۆقان لە هۆلۆکۆستی جوولەکە لە ئەوروپا، چەکی ناوکەیی ئەمەریکی وەک هۆلۆکۆستکردنی ژاپۆن، هەروەها "گولاگ" لە یەکەتیی سۆڤیەت، ئەمانە توخمی سەرەکین لە ئارندت کاتێ باسی سیاسەت دەکا وەک پرۆژەیەک کە هاوولاتییان دەپارێزێ لە توندوتیژیی دەوڵەت. پاراستن و فراوانکردنی فەزای گشتی (خەڵک) (بۆ نموونە گۆڕەپانی تەحریر) تەنیا ئەو کاتە دەکرێ ئەگەر بێتو لە رێی شۆڕشێکی کۆتاکراوە بێ.

سەرەتا ئەوە مارکس و ئێنگلز بوون، لە دوای شۆڕشگەلی ١٨٤٨، پەرەیان بە بیرۆکەی "بەردەوام شۆڕش" دا، واتە دۆخی شۆڕشگێڕی پشتگیریی لێ دەکرێ تا ئەو کاتەی چینی خاوەن زەویوزار شکستی هێنا و چینی هەژار و نەدار (پرۆلیتار) دەسەڵاتی دەوڵەت بەدەست دێنن. دواتر ترۆتسکی درێژەی بە بیرۆکەکەی جۆرجی پلێخانۆڤ دا، هەروەها پێشنیازی ئەوەی کرد کە شۆڕشگەلی دیموکراتیی بۆرژوازی بێهێز و ناتەواون و بۆیە هیچیان لێ

شین نابێ لەبەر خودی بۆرژوازیەت، کە بێ توانا و کەمویستە بێ هەموو ئەو رێیە ببڕێ و زەوی بدات بە چینی جووتیار، کارگەیل بدا بە کرێکاران، ماف بدا بە کەمینە، و کۆتایی بە بالآدەستیی بیانی بێنێ. بەکورتی، ترۆتسکی دەکرێ بە مۆتەکەی ئارندت بێتە بینین، بەپێچەوانەشەوە. لە دووبارەکردنەوەی ئەمە من لێرەدا پێشنیاز دەکەم، پێکهاتەی یەکەتیی سەربەخۆی کرێکاران، رێکخراوگەلی سەربەخۆی مافەیلی ئافرەت و رێکخراوگەلی قوتابیان کلیلن بۆ مسۆگەرکردنی ئازادیگەلی مەدەنی، کەواتە، پرسگەلی دادوەریی کۆمەلآیەتی (مەبەستی سەرەکیی ترۆتسکی بوو) لە رەگ و ریشەوە مسۆگەر دەکرێ و لە سەرەوەڕا ناسەپێنرێ بەهۆی کۆنترۆڵکردنی دەسەلآتی دەوڵەت. هەرچەندە ئەو شۆڕشی ئەمەریکیی پێ باشتر بوو لە شۆڕشی فرەنسی، ئارندت هەر رەخنەی هەبوو لە رەوتی ئەمەریکی لەبەر کێماسیی بەشداریی سیاسی و کارەکتەری ئەرکدار بۆ پرۆسەی هەڵبژاردن کە راستەوخۆ فراوانبوونی سیاسیی بازنەی گشتیی سنووردار کرد. ئەو فراوانبوونی بازنەی گشتی و بەشداریی سیاسییە تەواو برێتین لەو دوو توخمەی کە بیرۆکەی شۆڕشی کۆتاکراوەم پێ دروست کردووە، تێیدا چیی تر جیاوازی ناکەن لە نێوان مۆدیلی فرەنسی (کۆمەلآیەتی) و ئەمەریکی (سیاسی). بەلآم لە راستیدا تێکەڵکردنی هەردووک مۆدیلی سێیەمی دروست کرد، کە نزیکترە لەو شتەی ترۆتسکی پێی گوت "بەردەوام شۆڕش" (هەروەها ئەو شتەیە کە ئێمە دەیبیستین لە دروشمی میسری "الثورة المستمرة")، بەلآم ئەمجارە بەشێوەیەکی هێواشتر، سیستماتیکیتر و چەقیوتر کە تێیدا نەک هەر تەنیا چینی کرێکاران بگرە ئافرەت و قوتابیش (واتە دوو پێکهاتەی سەرەکیی کۆمەلآیەتی کە دۆخی ئابووری فراوان دەکەن لەنێو بازنەی گشتی) بەشدارن لە کردنەوەی شۆڕش.

لە کاتی خوێندنەوەی بزووتنەوەی سەوز لە ئێران من ناوم لەو بزووتنەوەیە

تا "بزووتنەوەی مافەیلی مەدەنی" (ئێستەش هەر وای پێ دەڵێم)، هەمان ئەو بیرۆکەی شۆڕشی کۆتاکراوەم لە مێشکدا بوو، کە تێیدا نەک هەر تەنیا ڕژێمی حوکمڕان بگرە هەر ڕژێمێکی تر کە لەوانەیە سەرکەوتوو بێ لەوەی بەردەوام بابەت بێ لەناو فراوانبوونی بازنەی گشتی و هاریکاریی دادوەریی کۆمەڵایەتی، لە ڕێی دەستە خۆبەخشەکان (تۆکڤیل) داوای ئەو شتانە بکەن لە ڕێی داگیرکردنی شۆڕشگێڕیی بازنەی گشتی (ئارندت). بەواتایەکی تر، پێکهاتەی دەوڵەت، بەڕای من، دوایەمین شتە، بێتە پێش ئەم شۆڕشەی وا ئێمە دەیبینین دەکرێتەوە. من هەردەم گومانم هەبووە و هەیە لە پێکهاتەگەلی دەوڵەت، لە چەپ، ڕاست و چەق، لە کاتێکدا پشتگیریی ئایدیۆلۆجیی ئەو دەوڵەتە هێشتا هەر لە خەیاڵدایە و لە مێژوویەکی کارەساتباری پۆستکۆلۆنیالدا دەخولێتەوە. ئەگەر ئەمە گێرەشێوێنی بێ، ئەوا پێشنیاز دەکەم کەوا لە ڕاستیدا گێرەشێوێنی لەنێو هەنا ئارندتا هەیە کاتێ پرۆسەی شۆڕشگێڕی لە هەردوو حاڵەتی فەرەنسی و ئەمەریکیدا ڕەت دەکاتەوە. مۆدیلی شۆڕشی ئەمەریکیی لا پەسندتر بوو نەک تەنیا لەبەرئەوەی زیاتر بایەخی بە ئازادیی سیاسی دا تا دادوەریی کۆمەڵایەتی، بگرە لەبەرئەوەی بەڕای ئەو ئازادی شتێکی یەکلاکەرەوەی بیرۆکەی سیاسەت بوو. سەربەخۆیی ئەو سەربەخۆییەیە لە چنگی دەوڵەت، ستەمکارییەوە دەستت کەوێ، لەم سەردەم و ئەمڕۆدا ناتوانم بڵێم یەک تاکە وڵات هەبێ لە دنیا بەدەر بێ لە گەندەڵی و ستەمکاری یان عەسابەی "بەیاساییکراو"ن لە ڕێگەی دەسەڵاتدان بە ڕێکخراوگەلی وەک نەتەوە یەکگرتووەکان، ئای ئێم ئێف و بانکی جیهانی.

کەواتە لە کۆتاییی خوێندنەوەم بۆ بەهاری عەرەبی، من دەڵێم هەنا ئارندت لە خوێندنەوەی بەهارەکە وەک فەزایەکی سیاسی دەیپارێزێ لە توندوتیژیی پێشینەی سیاسی، کە دەیبەستێتەوە بە هۆبز و ڕۆسۆ، پێچەوانەکەشی دەیبەستێتەوە بە مارکس، سۆرێل و ڤێبەر کە سیاسەتیان بە فەزایەک دەزانی

بۆ پیادەکردن و ڕێخۆشکردن بۆ "توندوتیژیی ڕەوا". بەڕەچاوکردنی ئەوەی لە جیهانی پۆستکۆلۆنیالدا دەوڵەت سەرچاوەی سەرەکی و پێگەی توندوتیژی بووە و هیچ حسێبی بۆ شەرعیەت نەکردووە، هەروەها بەڕەچاوکردنی ڕاستییەکی بێوێنە کەوا تەنانەت لەو وڵاتانەی کە نەریتێکی کۆنیان هەیە لەگەڵ دامەزراوەگەلی دیموکراتی، تەنیا بە یەک هێرشی تیرۆریستی تەواوی بەردی بناخەی سەروەریی یاسا و ئازادیگەلی مەدەنی لە پەنجەرە فڕێ دەداتە دەرەوە، کەواتە پێکهاتەی دەستەی خۆبەخش گرینگە بۆ پاراستنی تاکی هاووڵاتی لە چەوساندنەوەی وڵات. بۆیە سووربوونم لەسەر پێکهاتەیەکی چالاکیی یەکەتیی کرێکاران، ڕێکخراوەیلی مافەیلی ئافرەتان و ڕێکخراوگەلی قوتابیان وەک خاڵ و پێگەی دەسپێک لە نێوان تاکی هاووڵاتی و ڕەوتە عەسکەرتارییەکانی دەوڵەت. هەڵوێستی ئارندت لەسەر شۆڕش لە ڕاستیدا ڕەگی قووڵی داکوتاوە لە خوێندنەوەی تۆکڤیل بۆ دیموکراسیی ئەمەریکا کە کار دەکا و عەسکەرتاریەتی نەهێشتووە بەهۆی چاکەی دەستەخۆبەخشەکان. بەڵام ئەگەر بێتو ڕەچاوی بیرتیژییەکەی ئاگەمبێنت بکەین لەبارەی "ژیانی ڕووت"ی هاووڵاتییەوە وەک خۆی، ترسی تۆتالیتاریانیزمی وڵاتانی هاوچەرخ زۆر ڕژدترە لە شیمانەی گێرەشێوێنی. ئەمڕۆ، دوای ئەزموونی هۆلۆکۆستی ئەورووپی و، دوای "شەڕ لە دژی تیرۆر"ی سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج دەبلیو بوش، ئێمە بە ڕوونی شێتبوونی لەخۆدەرچوونی وڵاتان دەبینین چۆن هاووڵاتییانی خۆیان دەچەوسێننەوە یان دەیانکەن بە گۆشتی خاو بۆ ئەو شتەی کە ئاگەمبێن ڕاست و دروست ناوی لێ ناوە "ئامێری بکوژی سیاسی".

## بەئاسیاییکردنەوەی جیهان

پرسی هەرە کاریگەر ئەوڕۆ بۆ ئێمە چیی تر پێویستیی بەرەخنەگرتن نییە لە کار و پرۆسەی وەلانانی بابەتگەل کە ئێمەی ئاسیایی بەهۆیەوە بووینەتە

بابەت بۆ مۆدێرنیتەی ئەوروپی. ئەمە لە ماوەی نیو سەدەی رابردوودا دەستەبەر کراوە، بەدەسپێکردنی مەعریفەی سۆشیۆلۆجی کە سەدەیەک زیاتر پێش "ئۆریەنتالیزم"ی ئیدوارد سەعید هات، بەشێوەیەکی کاریگەر خرایە پێش لەلایەن سەعید. ئێمە ڕێپێوان دەکەین (من ئەوە بەکار دەهێنم بەهەمان ئەو ڕێگەیەی خۆزێ مارتی بەکاری هێنا بۆ نووسینی "نۆسترا ئەمەریکا" لە ١٨٩١)، تاکە پێگەی ئاژانسی مێژوویی ئێمە بەتەواوی ئەو بناخەیە خەڵک بەسەریدا ڕێپێوان دەکا. پرسیاری ئەمڕۆ ئەوەیە، چۆن ئەو فەزا گشتگیرەی یاخیبوونی شۆڕشگێڕی دەچێتە ناو قاڵبێکی جیهانییەوە؟ هیچ هۆیەک نییە بڕوا بکەین کەوا "ئاسیاییەکان" وایان کرد لەبەرئەوەی هیچ ڕێیەکی تریان لە بەردەمدا نەبوو، هیچ ڕێیەکی خەیاڵ و سەلماندنی خۆیان لە بەردەمدا نەبوو. تەنانەت لە سیاقێکی ئیسلامیشدا (کە تێیدا تەنانەت موسڵمانەکانیش ناکرێ کەم بکرێنەوە)، زاراوەگەلی ڕاست، دروست، چەپ، ناڕاست و چەوتی دەستووری زانینی بابەت بەبەردەوامی هەبووە بۆ بە بابەتکردنی موسڵمانان. لە مرۆڤایەتییەکی ئەدەبیدا، تێیدا "مرۆڤایەتی" بابەتێکی ناسک و گشتگیرە، ئەو بابەتبوونە کارێکی پاشکۆ، گشتگیر و نادیارە. لە ماوەی دووسەت ساڵی ڕابردوودا، هەروەها لە تەواوی سەردەمی داگیرکاریی ئەوروپیدا، هەموو ئەو ناوەندە بەگرفتانە هەمووی وەلا نراون بەهۆی کپ و بێدەنگکردنی "ئیسلام" بۆ نێو ڕکابەرییەکی ئایدیۆلۆجی لە دژی "ڕۆئاوا".

کەواتە کاتێ "ڕۆئاوا"، لە ڕێی میکانیزمی داگیرکارییەوە، موسڵمانانی بە "ئۆریەنتاڵ" ناساندووە، هەروەها ئێمەش کاتێ (بە خۆشی و ناخۆشی بێ) خۆمان خۆمان کردووەتە "ئۆریەنتاڵ" زۆر بەخێرایی مامەڵەمان لەگەڵ نوێنەرایەتیی خۆمان کردووە. هەموو شۆڕشێک ڕزگاربوونەوە، نەک گەڕانەوە. ئەوەی لێرەدا ڕزگار کراوە جیهانیبوونێکی کۆزمۆپۆلیتانییە بەهۆیەوە ئیسلام تێیوە گلاوە بەلام سەنگی مەحەکیش نییە.

له گۆڕەپانی تەحریرەوە ئێمە دەست دەکەین بە "جیهانیکردن"ی جیهان بەهۆی دووبارە بە ئۆریەنتاڵکردنی (ئاسیاییکردن)ی، دواتر تاوتوێکردنی. لە جەستەی سیستمی ئاینی گادەمار ئەمە زۆر بە ڕوونی دیارە کە تێیدا دەتوانین رووی زەمانەوانی ببینین نەک هەر تەنیا رووێکی بگرە روویەکی فرە جیهان بەهۆی ئەو شتەی کە ناسنامەی خۆیانی پێ دروست دەکەن و پشتگیریی لێ دەکەن، جیهانێکی فرە و تژی لە رێز. داگیرکاریی ئەورووپی و ئیمپریالیزمی ئەمەریکی، لە رووی وردەکارییەکانی ئۆریەنتالیستەکانەوە، بە ریزبەندێکی مێژوویی جیهانی ئێمەیان کوژاندووەتەوە بەهۆی گەڕان بەدوای تێگەیشتن لە ئێمە: ئەم کارەیان کردووە بەهۆی هەرسکردنی ئێمە بەپێی ئارەزوو و ویستی خۆیان، پرۆسەی بەبابەتیکردنی جیهانی ئێمە. بۆیە نەزۆکیی موسڵمان وەک نەزۆکیی ئەوانی تر هەردەم دەستی "رۆئاوا"ی تێدا بووە، ئەمەش وای کردووە ئەم وڵاتانە بۆ چەندان سەدە خۆیان خۆیان کپ و بێدەنگ بکەن. ئەم هاوکێشانە زۆر روونن، بۆ نموونە، کاتێ ماکس وێبەر پرسیارێکی کرد بۆچی سەرمایەداری لێرە گەشەی سەند و لەوێ نەیسەند، ئەمە زۆر گونجاو بوو بۆ ئەو کاتەی بۆ یەکەم جار بوو باسی ئێرە و ئەوێ بکرێ. تەنانەت وێبەر خۆیشی درکی بە ئیمپریالیزم کرد وەک سەرمایەدارییەکی سەرەخۆرە. کاتێ بیرۆکەکەی ئەو پێ گەیشت سەرمایەداری بووبووە شتێکی جیهانی. مەعریفەی سۆشیۆلۆجی کە دەگەڕێتەوە سەردەمی پێش ئێدوارد سەعید بووە شتێکی یەکلاکەرەوەی ئەو پرسیارانەی کە کارل مانهایم و دواتریش پاول ریکۆر کردیان لەبارەی جیاوازیی نێوان ئایدیۆلۆجیا و یوتۆپیاوە. تەواو لە رێی ئەو هاوکێشە شرۆڤەکارییە، "رۆئاوا" خۆی بووژاندەوە بەهۆی چارەسەرکردنی نەزۆکییەکانی، بۆیە "رۆئاوا" خۆی کپ و بێدەنگ بوو لەناو جیهاندا، تەواوی ئەوانی تریشی وەک خۆی لێ کرد. ئەمە ئەرکێکی پلان بۆداڕێژراو بوو نەک هەر تەنیا بۆ دنیاییەکی داگیرکراو، بگرە بۆ زانینی جیهانیش، بۆ ئەوەی

ئەم جیهانە بۆ تاهەتایە ببێتە شتێکی پارێزراو. لە ئەنتۆنیۆوە بۆ گرامسی و دواتریش بۆ والتەر بێنجامین، تیۆدۆر ئەدۆرنۆ و مانفرێدۆ تافوری، ئێمە رەوتێکی بەردەوامی هزری رەخنەییمان هەبووە کە تێیدا هاودژی بوون (خود) لەسەر حسێبی نەبوون (ئەوانی تر) بەشێوەیەکی سیستماتیکی خرایە روو لەلایەن مارکسی و غەیرە مارکسییەکان وەک رەوتێکی بالای نەزۆکی لەنێو سیستمەکەدا. بەلام تەنانەت ئەوانیش (بە مایکل هاردت و ئەنتۆنیۆ نیجەرەوە) سنووردار و داخراون بۆ ئەو چەمکانە: سیستەمەکە هەر خۆیانی تێدایە، لەنێو بازنەیەکی رۆئاواییدایە، ئەو جیهانەی ئەوان بۆیان مایەوە، رەخنەی لێ گیرا، بۆیە ناتوانن بوون و سەرهەلدان و دروستبوونی ئەوانی تر ببینن یان چاویان پێ هەلنایەت.

بۆ بەجیهانیکردنی جیهان کە تازە راگەیەنراوە، بەهاری عەرەبی دەبێ بەپەلە بەتیۆری بکرێ، تیۆرێکی فرە، جۆرەوجۆر، رکابەر و هەستیار و گرینگ. ئەم سەرکەوتنە مەزنەی راپەرینگەلی کۆمەلایەتی داوای رێنیسانسێکی رۆشنبیریی گشتگیر دەکا کە دەبێ چالاکانە لەگەل جیهان بێتەوە، ئەوروپاش لەو تەنگژە رزگار بکا و ئەمەریکاش لە تی پارتی (Tea Party)، راپەرینەکە ئەمە بەخێرایی بەدەست دێنێ. هەروەها ئەو دوو پێگە سەربازییە کۆن و ماندووە (مەبەستی ئەمەریکا و ئەوروپایە) پەلکێشی نێو بازنەی مرۆڤایەتی دەکا. گۆرەپانی تەحریر بووەتە میتافۆرێکی درێژکراوە. پێویستە ئێمە درێژتری بکەینەوە بۆ نێو گفتوگۆ تیۆرییەکانمان. لەگەل ئەو سووربوون و پێداگیرییەی لە گۆرەپانی تەحریر هەیە و رێپێوانی قارەمانانەی سوورییاییەکان لە شارەکانیان، ئێمە دەبێ بیر لە داهاتووی بەهاری عەرەبی بکەینەوە، چونکە نەک هەر دەبێ لە مەیدانی شەری تەرابلوس، شەقامگەلی دیمەشق، گەرەکەکانی تونس و گۆرەپانی تەحریر سەرکەوێ. دەبێ بەهەمان شێوە سەرکەوتوو بێ لە زمانی نووسینەوەی بەهاری عەرەبی، لە کردنەوەی رەوتی مەعریفە لەودیو یەقینە وەرگیراو و

مـردووەکـانـی ئێـمـە. ئێـمـە ئێـسـتـە لە سـاتێکی دەسـپـێکی هەڵواسـینی ڕێژیمەکانیان. شەڕ لەوە کەمتر پێویست نابێ لە دژی شێوە و ڕەوتگەلی ئەو مەعریفەی وەک میرات بۆمـان ماوەتەوە کە یەک دەگرێتەوە لەگەڵ سیـاسەتی بێهیوایی کە ئەوە دوو سەدەیە تێیدا دەژین. پێناوەکەمـان چیی تر "ڕۆژئاوا" نییە چونکە "ڕۆژئاوا" مرد.

بەهاری عەرەبی هـەر تەنیا پەردەی لەسـەر ئەو سـەردەمە لانـەدا کە ئێمـە پێی دەڵێین پۆسـتکۆلۆنیالیزم. بگرە کۆتـاییی بەخوێندنەوەی فۆکـۆڵدی هێنا بۆ دەسـەڵات و سیـاسـەتی بێهیـوایی کە لە تیۆرەکـانی لەبارەی خوێندنەوەی حوکمڕانییەوە باسی دەکا، هەروەها لەنێو جەستە و گیانی مرۆڤایەتیدا بڵاو بووەتەوە. تەمـاشـای ئـەو دەسـەڵاتە خـەیاڵییـە بکە بەهۆیەوە پڕۆژەی سـەدەی نوێی ئەمـەریکا بـەپێی پلانەکـان چووە پێش بـۆ حـوکـمڕانیکردنی جـیـهـان. جـەسـتـەیەکی خـەیاڵیی قـاعـیـدەیان دروست کـرد بـۆ بڵاوکـردنەوەی ئیمپریالیزمی خۆیان، کارەکتەرەکان پارێزکاری رادیکاڵی بوون کە وای لە لیـبـڕالەکـان کـرد بـچنە ناو پێگەی پارێزکـارەکـان و دەسـتـیـان کـرد بە دەسـوەردانی سـەربازی لەژێر ناوی "دەسـوەردانی مـرۆیی". پەرۆشـیی هەڵبژاردنی ئۆبـامـا ساتێکی تەقینەوەی ناوەخۆی ئەمەریکا بوو، ساتێک بوو ڕێک خـرا بـۆ خـلاسکردنـی مـێـژووی ڕەگـەزپەرسـتـی، بەڵام هەڵـبـژاردنی سـەرۆکـێکی ڕەش وەک سـەرۆک مـانای ئەوە نەبوو کـە ڕەگـەزپـەرسـتـی یان ئیمپریالیزم بەکۆتا هات.

بەهاری عەرەبی جـێبەجێکردن نییە بگرە پێشکێشکردنە. مـەبەسـتم ئا ئەوەیە کـاتێ دەڵێم بەهارەکـە کۆتـاییی بە پۆسـتکۆلۆنیـالیزم هێنا: بەهـاری عـەرەبی دوایەمین جـێبـەجـێکردنی کـۆمـەڵێک ئایدیۆلۆجـیـا نیـیـە بگرە شەکەتکردنی هەموو ئایدیۆلۆجییەکانە، دوایەمین سـاتی هـەموویانە. بۆیە ئەو ڕێژیمەی وەک میرات بۆ ئێمە ماوەتەوە بێ کەڵکە و بەرهەمگەلی زیانی هەیە. ئێمـە لە ١٧٨٩دا نـاژین کـاتێ هـزرە کـانتییـەکـان جـووڵەیان پێ دەبەخشـرا.

ئەمە زیاتر وەکو ١٩٦٨ە کاتێ شۆڕشەکان شەکەتییەکانیان بەدەر خست و بوونگەراییی سارتەر بووە هۆی ئەودیو پێکهاتەگەراییی فۆکۆلت، هەروەها دەرخستنی مەعریفە بەشێوەیەکی سیستماتیکی کۆدی "دەسەلات"ی وەرگرت، مەعریفە کۆدی دەسەلات و حوکمڕانی وەرگرت. هەر هەمان ماوە وای لە جوولە مەعریفییەکانی پێکهاتەگەرایی کرد بچنە ئەودیو پێکهاتەکان، مۆدێرنیزمی کردە پۆستمۆدێرنیزم، هەروەها بەگشتی لە هەموویان گرینگتر بۆ جیهان، کپکردنی نەوەی ڕەخنەگری فرانتز فانۆن لە داگیرکاری بۆ نێو دەزگەی ڕەوتی پۆستکۆلۆنیالی بەرهەمی دژە مەعریفی ئێدوارد سەعید. کەواتە، جێبەجێکردن نییە بگرە ناوەندێکە بۆ پێشکێشکردنی هەموو ئەو شتانەیە کە پێشتر بۆش کراون، هەروەها لێرەوە دوای ڕێزمان، لۆجیک و ڕەوانبێژی، ئێمە هەموو شتێکمان تەواو کرد و دەبێ دەست بکەین بەزمانێکی نوێ کە دەبێ لۆجیک و ڕەوانبێژییەکی نوێی بۆ بدۆزینەوە. بۆیە ناتوانین بگەڕێینەوە و بچین کاری بیرمەندانی شۆڕشگێڕی بخوێنینەوە، لە ڕۆسۆوە بۆ مارکس، یان تەنانەت لە فانۆنەوە بۆ سەعید، تا بزانین چۆن ئەمانە روویان داوە، چونکە هزری هەموو بیرمەندانی شۆڕشگێڕی بەکۆتا هات کاتێ حوسنی موبارەکمان لە قەفەسێکدا بینی لەناو دادگەی قاهیرە چاوەڕێی دادوەری دەکرد و قەزافیش لە سوێی ژیانی خۆی لە نێوان لیبیا و نیجەر رای دەکرد.

کۆتاییی پۆستکۆلۆنیالیزم واتە سەرەتای دیالێکتیکێکی نەرێنی لەنێو دۆخێکی ساختەی سەرمایەی جیهانی و لۆجیکی سەربازیی بالادەستیی جۆرەوجۆر کە کۆد و رەنگیان ئەمانەن: "سەربەخۆیی" یان "مافەیلی مرۆ"یە. وەلامێک بۆ بەکارهێنان و ناشیرینکردنی مافەیلی مرۆ واتە نواندنی بالادەستی، کۆپییەکی نوێی دەسەلات، بۆردمان لە پێناو ئاشتی، تۆقاندن لە پێناو خەلاسکردنی تیرۆریزم، رووتکردنەوەی مرۆڤایەتی لە مافە مرۆییەکانی، ئەم وەلامە بۆ پەسندکردن یان رەتکردنەوەی شتەکان نییە،

بگره بۆ زاڵبوونه بەسەریاندا بەهۆی دیالێکتیکێکی نەرێنی کە رێ بەیەکگرتنەوەی بیرۆکەکان نادا بۆ تاک بالآدەستی. لەبەرئەوەی سەرمایەداری ساختە و فێڵ دەرچوو، هەروەها چینی کرێکاری پیشەسازی بلاو بووەتەوە لە جیهان لە رێی کۆچکردنەوە، دیالێکتیکی رزگاریخوازی دەبێ رووی نەرێنیی خۆی سپی بکاتەوە لەسەر حسێبی کۆلۆنیالیتی کە ئێستە زاڵ بووە بەسەر خودی خۆیدا. ئەمە یەکەم و دوایەمین وانەیە کە ئێمە فێری دەبین لە درێژکردنەوەی لۆجیکی کتێبەکەی ئەدۆرنۆ بەناوی "دیالێکتیکە نەرێنییەکان، ١٩٦٦" بۆ دیمەنی پۆستکۆلۆنیال و ئەولاتریش.

بەهاری عەرەبی روونی کردووەتەوە کەوا رەخنەی تێکڕا و بیرکردنەوەی دیاردەگەرایی دەبێ هەر کاریگەر و بەردەوام بن، هەروەها بیرۆکەی شۆڕشی تێکڕا گۆڕاوە و بووەتە شۆڕشی کۆتاکراوە، "بەردەوام شۆڕش". لەم سۆنگەیەوە، هزر پێشینەیەکە بۆ کاری شۆڕشگێڕی، کاری شۆڕشگێڕی بناخەیە لەنێو بیرکردنەوەی فەلسەفییانە. بیرۆکەگەلی بەرەنگاربوونەوە هەرگیز سیستماتیکی نەبووە و بۆیەش هیچ مەترسیی پەسندکردنی نەبووە. هزری شۆڕشگێڕی، کە لێرەدا باس کراوە، چیی تر نابێ بە پێشەنگ و پێشەوا، نابێ بە تاکە چەکی داگیرکاری، رەتکردنەوەی بەرەنگاربوونەوە و چاککردنەوەی نەزۆکی. هیچ متمانەیەک بە بابەتێک ناکرێ هەموو شتێکی بزانرێ و ئاشکرا بێ، گریمانەیەک نییە بۆ ناسنامە لە نێوان بابەت و شتەکانی مەعریفە. لە راستیدا، نەزۆکیی بابەت هەر جودایە لە جیهانی زانین، میسالییەکان بەدەست نایەن چونکە جیاوازن. هیچ میتافیزیکێک لەو دەسەڵاتەی دژە بەرەنگاربوونەوەیە سەر هەڵنادا. لە باتیی رەتکردنەوەی شۆڕش کە هەندێ یەک دەگرێتەوە لەگەڵ رەهایزمی ئیسلامی، میتافیزیکی ئیسلامی یەک دەگرێتەوە لەگەڵ گومانی میتافیزیکی جیهانیبوون و بۆیەش نەزۆک و جیاوازن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی سیستمی ئاینی بگۆڕێ و بەرەو سیستمێکی لیبرالی دیموکراتی بچێ. تاکە بابەت چیی تر بایەخی

سەرەکیی زانین نییە بگرە پێوەستە بە جیاوازیی شۆڕشگێڕی. تاکە ڕێگە کە تاکگەرایی نیـــولیـــبـــرال بەرگـــەی پێ بگرێ لەم خـــەباتە لە ڕێگەی هـەڵوەشـــاندنـەوەی بابەتە، ئەویش لـە ڕێی هـەڵوەشـــاندنـەوەی ڕێژیمـگەلی ستەمکار. بۆیە ئێمە یەکسەر دێینە سەر باسی ساتی ڕزگاریخوازی، کە تەوەقـوع کـراوە لەم قـسـەیەی خـوارەوە کـە لـەلایەن چەندان ئیـسـرائیلی لیـبـرالەوە کـراوە، کـە یـەکـەم و دوایەمین گـەلن ئازاد دەبن بەهـۆی بەهاری عەرەبییەوە:

ئێمە ئیسرائیلین، منداڵ و نەوەی جوولەکـان کە سەتان هەزار ساڵە لە ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقیای باکوردا دەژین. باو و باپیرانمان بەشدار بوونە لە پێشخستنی کولتووری ئەم ناوچەیە، هەروەها بەشێک بوونە لێی. بۆیە کولتووری جیهانی ئیسلامی و پێـوەندیی فـرە نەوە و ناسـنامـە لەگـەڵ ئەم نـاوچەیە بەشـێکی جیـانەبووەوەی ناسنامـەی ئێمـەیە. ئێمـە بـەشێکین لە مـێژووی ئاینی، کولتووری و زمانەوانیی ڕۆهـەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقیای باکور، هەرچەندە وێ دەچێ ئێمە منداڵی لەبیرکراوی مێژوو بین: یەکەم جار لە ئیسرائیل، کە پێی وایە خۆی و کولتوورەکەی لە شـوێنێکی تر لە نێوان کیشـوەری ئەورووپا و ئەمـەریکای باکورە. پاشـان لە جـیـهـانی عـەرەبی، کـە زۆرجـار تـەرازووی دوو تای جـوولەکـە و عـەرەب پەسند دەکـا و هەمـوو جـووەکـان بە ئەورووپی دادەنێ، هـەروەهـا هـەوڵی داوە مـــێـــژووی عـــەرەب=جـــوو بچەوسێنێتەوە وەک بەشێکی کەمینە یان نەبوو لە مێژوودا، لە کۆتاییشدا لە کۆمـەڵگەکانی میزراحی خۆیان، کە لەژێر سایەی داگیـرکـاریی ڕۆئاوادا، ناشنالیـزمـی و جـوو و عـەرەب، بوو بە شتێکی شـەرمـەزاری ڕابردوویان لە جیـهانی عەرەبیدا... ئێمە حـەز دەکەین باسی ناسنامـەی خۆمـان بکەین، هـەروەهـا باسـی

هیواکانمان بکەین لەم قۆناخەی گواستنەوەی نەوەیە لە مێژووی ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقیای باکور، هەروەها هیوادارین ئەمە دەروازەگەلی ئازادی و دادوەری بکاتەوە و ببێتە هەوێنی یەکسان دابەشکردنی سەرچاوەکانی ناوچەکە. ئێمە ڕوو لە ئێوە دەکەین، نەوەی ئێمە لەنێو جیهانی عەرەبی و موسڵماندایە، تێ دەکۆشن بۆ دیالۆگێکی ڕاستگۆ تا پێکمان بکا لە مێژوو و کولتووری ناوچەکە. ئێمە بە پەرۆشەوە سەیری وێنەکانمان کرد لە تونس و گۆڕەپانی تەحریر، سەرسامین بە تواناتان بۆ ڕێکخستن و سازدانی ئەم بەرهنگارییە مەدەنییە ناتوندوتیژە کە بە سەتان هەزار کەسی هێناوەتە سەر شەقام و گۆڕەپان، دواجار حوکمڕانەکانتان ناچار کرد پۆست بەجێ بێڵن....
ئێستە ئێمە هیوای خۆمان دەردەبڕین کەوا نەوەی ئێمە، لەنێو جیهانی عەرەب، موسڵمان و جوولەکەدا، نەوەیەکی پردە نوێیەکان دەبێ کە باز دەدا بەسەر دیوارەکان و ئەو دوژمنایەتییەی لەلایەن نەوەکانی پێشتر دروست کراوە و دیالۆگێکی نوێ و قووڵی مرۆییانە دەبێ هەبێ، بەبێ ئەمە ئێمە ناتوانین لە خۆمان بگەین: لە نێوان جوولەکە، سونە، شیعە، مەسیحی، لە نێوان کورد، بەربەر، تورک و فارس، لە نێوان میزراحی و ئەشکەنیزییەکان و، لە نێوان فەڵەستینی و ئیسرائیلییەکان. ئێمە چاو لە ڕابردووی هاوبەشمان دەکەین تاوەکو بتوانین چاو لە داهاتووی هاوبەشمان بکەین.